پرۆفیسۆر مستەفا زەلمی

# یارمەتیدەری قازیان بۆ دەستەبەرکردنی داد و یەکسانی

# پەیوەندی نێوان مەنتق و یاسا

منتدى إقرأ الثقافي

www.iqra.ahlamontada.com

وەرگێڕانی: عمر علي غفور



یارمەتیدەری قازیان بۆ دەستەبەرکردنی

داد و یەکسانی

پەیوەندی نێوان مەنتق و یاسا

دوو كتێب لە یەك بەرگدا

# یارمەتیدەری قازیان بۆ دەستەبەركردنی داد و یەكسانی

# پەیوەندی نێوان مەنتق و یاسا

نووسینی

**دكتۆر مصطفی زەڵمی**

وەرگێڕانی

عبدالكریم فتاح

# کۆبەرهەمی دکتۆر مستەفا زەڵمی لە شەریعەت و یاسادا

سەرپەرشتیاری پرۆژە
ڕێدار ڕەئوف ئەحمەد

معين القضاة لتحقيق العدل والمساواة

یارمەتیدەری قازیان
بۆ دەستەبەرکردنی داد و یەکسانی


نووسینی : دکتۆر مصطفی زەڵمی
وەرگێڕانی : عبدالکریم فتاح
نەخشەسازی : جمعه صدیق کاکە
نۆرەی چاپ : چاپی یەکەم ۲۰۱۷

نرخی هەر بیست و شەش بەرگ
۲۵۰.۰۰۰ دینار



پرۆژەی وەرگێڕانی
کۆبەرهەمی دکتۆر مستەفا زەڵمی لە
شەریعەت و یاسادا

بەپێی گرێبەستی واژۆکراو لە بەرواری ۲۰۱٤/۹/۱۷ لەنێوان لایەنی یەکەم: بەڕێز دکتۆر مصطفی زەڵمی کە لەبری ئەو بەڕێز مسعود مصطفی زەڵمی واژۆی کردووە.
لایەنی دووەم: دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ڕۆژهەڵات کە بەڕێز حەسەنی دانیشفەڕ واژۆی کردووە.
مافی وەرگێڕانی ئەم بەرهەمانە بۆ زمانی کوردی و چاپکردنیان بەپێی ئەو خاڵانەی لە گرێبەستەکەدا لەسەری ڕێککەوتوون، دراون بە دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ڕۆژهەڵات.



لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی ( ٧٤٤ ) ساڵی ۲۰۱٦ی پێدراوە

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُكُمۡ أَن تُؤَدُّواْ ٱلۡأَمَٰنَٰتِ إِلَىٰٓ أَهۡلِهَا وَإِذَا
حَكَمۡتُم بَيۡنَ ٱلنَّاسِ أَن تَحۡكُمُواْ بِٱلۡعَدۡلِۚ إِنَّ ٱللَّهَ نِعِمَّا
يَعِظُكُم بِهِۦٓۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ سَمِيعَۢا بَصِيرٗا ﴿٥٨﴾ ﴾

سورة النساء/ ٥٨

(إِذَا حَكَمَ الْحَاكِمُ فَاجْتَهَدَ فَأَصَابَ فَلَهُ أَجْرَانِ،
وَإِذَا حَكَمَ فَاجْتَهَدَ فَأَخْطَأَ فَلَهُ أَجْرٌ)

صحيح ابن حبّان، برقم (٥٠٦٠)، ١١ /٤٤٥

# ناوەرۆك

## بەشی پێنجەم



## بەشی شەشەم

# پێشەکی

١. لە دروستکردنی یەکەم مرۆڤەوە جیهان بۆ دوو سەربازگە دابەش بووە: سەربازگەی خێر و سەربازگەی شەڕ، ئەم سوننەتەی ژیان داوای ئەوە دەکات لە هەموو چاخێکدا دەستی دانا و کارهەڵسوڕێن بوونی هەبێت دەست بە داوەکەوە بگرێت و لە کۆتاییدا کەشتی پڕ لە جەنگ و هەرا و ململانێ بگەیەنێتە ڕۆخی ڕزگاری پڕ لە خێر و چاکسازی.

٢. لە سەردەمە دێرینەکانەوە بیرمەندان لە فەیلەسوفان و زانایانی یاسا جیاوازیان کەوتۆتە نێوانەوە لەسەر پێناسە و دیاریکردنی غەریزەی بنەڕەتی مرۆڤ، ئایا مرۆڤ بە سروشت خێرخوازە یان بە فیترەت شەڕەنگێزە، هەندێکیان پێیان وایە[1] کە سروشتی مرۆڤ لەسەر خێر بارهاتووە، ئەو لەژێر کاریگەری فاکتەرە لابەلاکاندا وەك هۆکارە مادییەکان(سروشتییەکان) یان هۆکارە ئەنسرۆپۆلۆجییەکان(تاکییەکان) یان کۆمەڵایەتییەکان یان بۆماوەییەکان، یان شتانی دەچێتە ژێر دێوەزمەی حەزەکان وژێرباری دەسەڵاتی ئەنگێزەکانییەوە، ئەمە لە کاتێکدا کە دەستەیەکی تریان[2] پێچەوانەی ئەم ئاراستەیە حوکمیان بەسەر مرۆڤدا دەرکردووە بەوەی فیترەتی مرۆڤ لەسەر شەڕ بارهاتووە، ئەو بە سروشت

---

(1) لەوانە سقرات (٤٦٩-٣٩٩ ق. م) فەیلەسوفی یۆنانی لە ئەسینا.

(2) لەوانە یوسوعییەکان لە فەیلەسوفان و لومبروز لە زانایانی یاسای و پزیشکی.

شـەڕەنگێزە، گـەر ڕێگـەی خێـر بگرێتـە بـەر بـەهۆی فاکتـەرە دەرەکییەکانەوەیە لە دەرەوەی بازنەی سروشتی خۆیەوە، وەك پـەروەردە و خێزان و هۆشیاری ئایینی و هاوشێوەکانی ئەمانە.

٣. ئاراسـتەی قورئـان لـە دیـاریکردنی سروشـتی مرۆڤـدا پێچـەوانەی ئـەو دوو ئاراستە ئاماژەبۆکراوەن، قورئان دان بەوەدا دەنێت کە مـرۆڤ لـە بنەڕەتـدا خێری ڕەها و شەڕی ڕەها نییە، بـەڵکو لـە یـەك کاتـدا هـەردوو ئەنگێزەکـە هەڵدەگرێت، ئەنگێزەی خێـر و ئـەنگێزەی شـەڕ کـە ئـەقڵ سـەرۆکایەتییان دەکات، خودا-سبحانه وتعالى- دەفەرموێت: ﴿وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّاهَا[١] فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا[٢] وَتَقْوَاهَا[٣] قَدْ أَفْلَحَ مَنْ زَكَّاهَا[٤] وَقَدْ خَابَ مَنْ دَسَّاهَا﴾[٥].

٤. مـرۆڤ وەك دەوڵـەتێکی خـاوەن سـەربەخۆ وایـە کـە ئـەقڵ سـەرۆکایەتی دەکـات، و دوو وەزیـری هەیـە، ئـەو دوانـەش بـریتین لـە ئەنگێزەی خێر و ئەنگێزەی شەڕ، دەزگای هەواڵگری کە بریتییـە لـە پێـنج هەسـتە ئاشـکراکەی مـرۆڤ، هۆکارەکـانی بـەرگریکردن کـە بـریتین لـە دوو دەسـت و دوو لاق و زمانێـك، کۆمـەڵێك فاکتـەری کاریگـەری دەرەکـی دەستێوەردان بۆ ناو ئـەم دەوڵەتـە دەکـەن، گـەر ئـەنگێزەی خێـر زاڵ بـوو بەرەو خێر پاڵی دەنێت، گەر ئـەنگێزەی شـەڕ سـەرکەوتنی بەدەست هێنـا بەرەو شەڕ پاڵی دەنێت، ئەمەش لە میانـەی جـەنگ و ململانێـی نـاو ژیانـدا کاتێك لەگەڵ کەسانی تردا بەریەك کەوتن دروست دەکات.

٥. مرۆڤ سەرەڕای ئەوەی بە سروشت بوونێکی کۆمەڵایەتییە، لەگەڵ ئەوەشـدا و لـە هـەمان کاتـدا بـوونێکی خۆپەرسـتە-وەکـو خـود- خـۆی لەپێشـتر دەبینێت لە کەسانی تر لە کاتی تێکپڕانی بەرژەوەندییەکانـدا، بۆیـە بـوونی

---

[١] واتە ئەو توانایەی کە خودی مرۆڤی دروستکردووە.
[٢] ئاماژەیە بە ئەنگێزەی مرۆڤ.
[٣] تەزکیە بە زاڵبوونی ئەنگێزەی خێر بەسەر ئەنگێزەی شەڕدا.
[٤] تەزکیە بە زاڵبوونی ئەنگێزەی خێر بەسەر ئەنگێزەی شەڕدا.
[٥] سورة الشمس / ٧-١٠

یاسا لە هەموو کات و لە هەموو شوێنێکدا بووە بە پێویستییەکی پێداگری ژیان تاکو مافەکان و پابەندبوونەکانی هەموو کەسێکی سروشتی یان مەعنەوی دیاری بکات، بەجۆرێك لەبەردەم خەڵکیدا رۆشن ببێتەوە کە هەموو کەسێك مافەکەی لەو شوێنەدا کۆتایی پێ دێت کە مافی کەسێکی تر دەستپێدەکات.

٦. بوونی یاسا بەتەنها بەس نییە گەر لەرووی کردارییەوە جێبەجێ نەکرێت، بەڵکو تەنها مەرەکەبی سەر کاغەزە، بوون و نەبوونی یەکسانە، بۆیە دیسان لە پێویستییەکانی ژیان بوونی دەسەڵاتی قەزاییە بۆئەوەی جێبەجێ کردنی یاسا لە ئەستۆ بگرێت تاکو دادپەروەری دەستەبەر بکات بە پێدانی هەر لایەك لەلایەنەکانی کێبەرکێکەر و ململانێکەر ئەوەی شایستەیەتی لە پاداشت و لە سزا و دەستەبەرکردنی یەکسانی لە هاوسەنگی نێوان ماف و پابەندبووندا.

٧. بەهۆی گرنگی قەزاوە لە ژیانی مرۆڤدا لە دێر زەمانەوە بەوە وەسفکراوە کە فەرزێکی پێ لەسەرداگیراوە، واتە سڕینەوە و بەتاڵکردنەوە قبووڵ ناکات، ناتوانن لە هیچ سەردەم و شوێنێکدا لێی بێنیاز بن، هەرچەند ژیاری مرۆیی لە پێشکەوتن و گەشە و گۆڕاندا بێت بەرەو چاکتر و چاکتر و زیادبوونی هەستی هەموو تاکێك بە بەرپسیارێتی بەرانبەر کەسانی تر، چونکە پێویستبوونی قەزا کارێکی ئەقڵییە و سڕینەوە و بەتاڵکردنەوە و بێنیازبوون لێی قبووڵ ناکات، لەم لۆژیکەوە لەسەر خاوەن دەسەڵات پێویستە لە هەر هەرێمێکدا قازی دابنێت، لە دەستەبژێرێکی تایبەت و هەڵاوەردە هەڵیان ببژێرێت کە خاڵی بن لە سیفەتی خراپ و رازاوە بن بە سیفەتە بەرز و بڵندەکان.

ئەم هەوڵە کەمەم -لەم مەیدانەدا- ناو لێناوە "پارمەتیدەری قازیان بۆ دەستەبەرکردنی داد و یەکسانی"، لە خودا -عز وجل- دەپاڕێمەوە ئەو مەرامە دەستەبەر بکات و ئەم هەوڵە کەمەش بکات بە سەرەتایەك بۆ زنجیرەیەکی نزیك

بە یەکتر لەرووی مەرام و ئامانجەوە، لەژێر ناونیشانی "یارمەتیدەر" بە پشتیوانی خودا بەدوایدا "یارمەتیدەری مامۆستای زانکۆ" بێت.

یارمەتی و سەرکەوتن لە خوداوەیە و ئەو دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا زاڵ و رەهایە.

# بەشی یەکەم

## لێوەشاوەیی جێبەجێ کردنی قەزا

ئەو لێوەشاوەییانەی کە پێویستە بوونی هەبێت لە کەسێکدا کاری قەزا دەگرێتە دەست دەتوانین -لە رووی سروشتییەوە- بۆ دوو بەش دابەشی بکەین:

لێوەشاوەییە خودییەکان و لێوەشاوەییە بەدەستهاتووەکان.

بۆیە لێکۆلینەوەی ئەم بابەتە بۆ دوو باس دابەش دەبێت:

یەکەمیان تایبەتکراوە بە بۆ لێوەشاوەییە خودییەکان و دووەمیان بۆ لێوەشاوەییە بەدەستهاتووەکان

# باسی یەکەم:
# لێوەشاوەییە خودییەکان

لێوەشاوەییە خودییەکان (یان کەسییەکان) هەیانە باوەڕە و هەیانە ئاکار و ڕەفتارە.

## یەکەم: لێوەشاوەییە باوەڕییەکان:

ئەوەش بریتییە لە ئیمان بە خودا و ئەوەی لێی جیادەبێتەوە لە لقەکانی باوەڕ بە هەموو جۆرەکانی پەنهانەوە، باوەڕ بە خودا پایەیەکی سەرەکی و گرنگە بۆ بیناکردنی ژیانێکی پڕ لە بەختەوەری، هەروەها یەکەمین هەنگاوە لە بەرزبوونەوە بۆ دلۆڤانییەکانی ژیان و ڕێکخستنی پەیوەندییەکان لەسەر بنچینەی زانستی دروست لە نێوان تاکەکان و کۆمەڵگەکاندا لە سەرجەم مەیدانەکاندا کاتی چوونە ژوورەوە بۆ جەنگی ژیان و بەریەککەوتنی خەڵکی هەندێکیان لەگەڵ هەندێکی تریان.

بۆیە وتراوە(گەر یەکێك بیروباوەڕێکی تێکچووی هەبێت باشترە لەوەی هیچ بیروباوەڕێکی نەبێت)، چونکە بەپێی ئەو بیروباوەڕە جۆرێك لە پابەندبوونی بۆ هەیە با بیروباوەڕەکەشی پووچ و تێکچوو بێت، باوەڕ بە خودا سەرچاوەیەکە بۆ وزەیەکی ڕۆحی کە چاودێری مرۆڤ دەکات لە قسە و کرداریدا، چاودێری کرێکار لە کارگەکەیدا و جوتیار لە کێڵگەکەیدا و فەرمانبەر لە فەرمانگەکەیدا و قازی لە کاتی گرتنەبەری ڕێوشوێنە قەزاییەکان و دەرکردنی حوکمدا، و خاوەن پیشەکان لە کاتی ئەنجامدانی کار و پیشەکانیاندا، و مامۆستا لە فێرگەکەیدا و دایك لە ماڵەکەیدا و دەسەڵات لە کاتی جێبەجێ کردنی بەرپرسیارێتیدا.

بەم جۆرە مرۆڤ بە خۆی چاودێری خۆی دەکات بەبێ پێویست بوون بە چاودێری سیاسی یان ئیداری یان قەزایی و هاوشێوەکانی ئەمانە.

باوەڕی زانستی بە خودا پێویستبوونێکی ئەقڵییە بەر لەوەی پێویست بوونێکی شەرعی بێت، چونکە لە ڕێگەی پێغەمبەران و کتێبە پیرۆزە دابەزێنراوەکانەوە بۆ سەریان بەدەست

ناهێنرێت، چونکە ئیمان بە پێغەمبەران و کتێبەکان لەسەر باوەڕی پێشینە بە خودا راوەستاوە، گەر ئیمان بە خودا لەسەر ئەوانە راوەستایە ئەوا ئەو ئیمانە دەستەبەر نەدەبوو بەهۆی ئەو نەگونجانە لۆژکییەی کە تێیدایە.

بۆ رونکردنەوەی ئەم حەقیقەتە: گەر (أ) لەسەر (ب) راوەستێت و (ب) لەسەر (أ) راوەستێت ئەو کات بوون و وەستانی (أ) لەسەر خۆی رادەوەستا لەدوای سڕینەوەی (ب) دووبارەکە، وەستانی شتێك لەسەر خۆی پێشکەوتنی لەسەر خۆی پێویست دەکات، واتە پێویست دەکات (أ) بوونی هەبێت بەر لەوەی بوونی هەبێت، ئەمەش لۆژیکێکی هەڵە و نەگونجاوە، پێویستبوونی نەگونجاویش دیسان نەگونجاوە.

باوەڕ بە خودا پێویستە لە رێگەی ئاماژەکردنەوە بێت بە بەڵگە و بورهان(بەڵگە و بورهانی "إني")[1]، واتە ئاماژە کردن بە ئەسەر لەسەر بوونی خاوەن ئەسەر، چونکە باوەڕی چاولێکەری بۆ باوان و خەڵکانی تر رەدکراوە و قبوولْ نەکراوە، چاولێکەری لە پایە و لقەکانی ئایندا بەهۆی گومانی خاوەن گومانەکانەوە ئەگەری سڕانەوە و تیاچوونی هەیە، بۆیە دەبینین گەنجە باوەڕدارەکانمان بە باوەڕێکی چاولێکەریانە کاتێك دەچن بۆ دەرەوەی وڵات بۆ تەواوکردنی خوێندن و ئەنجامدانی کارەکانیان زۆریەیان لادەدەن بۆ لای ئیلحاد، چونکە ئیمانەکەیان ئیمانێکی چاولێکەری بووە -بۆ نموونە- چاولێکەری بۆ باوانیان، گەر ئەو ئیمانە ئیمانێکی زانستی بوایە و شانی لەسەر بەڵگە و بورهان دابنایە بە کاریگەرییە دەرەکییەکان کاریگەر نەدەبوو لە کاتی بەرکەوتن لەگەڵ کەسانی تردا.

ئاماژە کردن بە بەڵگە و بورهانی "الإني" زۆر سادە و ساکارە، تەنها پێویستی بە بەکارهێنانی ژیرییەکی تەندروست و بیرکردنەوەیە لە دروستکردنی ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی لە نێوانیاندایە.

---

[1] بورهان(بەڵگەهێنانەوە بە بەڵگەی براوە) یان "لمي"ە واتە بەڵگەهێنانەوە بە کارتێکەر لەسەر بوونی کارتێکراو وەك بەڵگەهێنانەوە بە ڤایرۆس و میکرۆب لە خوێندا لە دوای شیکردنەوەی لەلایەن پسپۆڕانەوە لەسەر بوونی نەخۆشی، یان بەڵگەی "إني"ە ئەوەش بریتییە لە بەڵگەهێنانەوە بە ئاسەوار(کارتێکراو) لەسەر بوونی کارتێکەر، وەك بەڵگەهێنانەوە بە گەردوون لەسەر بوونی خودایەك بۆی.

ئەمە ئەوە بوو کە لە ژیانی کردارییدا ڕووبەڕووی بوومەتەوە، لە کۆلێژی یاسای زانکۆی بەغداد ساڵی ١٩٨٧ز و لە سەرەتای ساڵی خوێندندا، چوومە ناو هۆڵێك بۆ وتنەوەی وانەیەك لە ڕۆژی یەکەمدا، یەکێك لە قوتابییەکان هەستا و دەستی بەرزکردەوە، پێم وت: هێشتا وانەکەم دەست پێ نەکردووە تا گفتوگۆی لەسەر بکەیت، وتی: مامۆستا بابەتەکە پەیوەندی نییە بە وانە و گفتوگۆکردن لەسەر وانە، گرفتی من ئەوەیە لە دایك و باوکێکی موسڵمان لەدایك بووم، لەگەڵ ئەوەش من کەسێکی مولحیدم و حەزێکی زۆرم هەیە یەکێك ڕێنموونیم بکات و قەناعەتم بە بوونی خودا پێ بهێنێت، تا ئەم ساتە ئەو کەسەم نەبینیوەتەوە.

وتم: ئێستا دابنیشە بوونی خودات بە پێنج خولەك بۆ دەسەلمێنم، پێم وت ئایا وێنا دەکرێت ئەم هۆڵە دروستکراوە کە ئێمە وانەی تێدا دەخوێنین بەبێ وەستا و کرێکار و کەرەستەی سەرەتایی هاتبێتە بوونەوە؟

وتی: نەخێر، وتم: ئەم گەردوونە مەزنە کە بەردەوام ژێری گەردوون ئاسانی سەرلاسیمە کردووە لە کوێوە دەستی پێکردووە و لە کوێوە کۆتایی دێت، چۆن بەبێ دروستکەر هاتبێتە ناو بوونەوە؟!

وتی: سروشت هێناویەتە ناو بوونەوە.

وتم: ئایا سروشت بوونی هەیە یان بوونی نییە، لەو بارەدا کە نەبوو بێت چۆن نەبوو دەتوانێت شتێك بهێنێتە ناو بوونەوە؟

وتی: سروشت بوونی هەیە.

وتم: ئەو سروشتە بەشێکە لە گەردوون یان لە دەرەوەی گەردوونە، گەر بەشێك بێت لە گەردوون چۆن شتێك دەتوانێت خۆی خۆی دروست بکات؟

وتی: بەشێك نییە لە گەردوون، ئەگەر نە، پێویست دەبوو شتەکە خۆی خۆی دروستبکردبایە.

وتم: ئایا دارتاش دەتوانێت تەختەیەکی دارین بگۆڕێت بۆ ئەساسی ناو ماڵ بەبێ ئامێرەکانی دارتاشی؟

وتی: نەخێر.

وتم: ئایا سروشت دەتوانێت ئەم گەردوونە ڕێکخراوە پڕ لە نهێنی و سەیر و سەمەرە بەبێ زانست و ویست و دەسەلآت دروست بکات؟

وتی: نەخێر.

وتم: ئەوەی تۆ و هاوشێوەکانی تۆ ناوی "سروشت"تان بۆ دلتاشیوە بریتییە لە خودا- سبحانە وتعالی- تەنها جیاوازی لە ناوەکەیدایە.

وتی: "أشهد أن لا إله إلا الله وأشهد أن محمدا رسول الله"

بەم جۆرە ئەو قوتابییە بە کەمتر لە پێنج خولەك لە جیهانی ئیلحادەوە گواستییەوە بۆ ناو جیهانی ئیمان.

ئەو قوتابییە پێمی وت: مامۆستا هەموو رۆژێك بەر لەوەی بێم بۆ کۆلێژ بەشێك لە قورئان دەخوێنم.

## دووەم: لیۆمشاومییە ئاکاری و رەفتارییەکان:

ئەو کەسەی کە بۆ کاری قەزا لە دلهاتوودا هەڵدەبژێررێت پێویستە خاوەنی ئاکاری چاك و پاك و دروست و دامەزراو بێت، لە خودی خۆیدا بە سیفەتی بەرز و بڵند رازابێتەوە، بە ئەخلاقی چاك و پاك رەنگی گرتبێت، هەروەها خاڵی بووبێتەوە لە هەر نەنگی و ناتەواوییەك لە ئەخلاقدا کە ببێتە هۆی ناتەواوی لە کەسایەتی ئەودا، لە پێشەنگەکانی ئەو سیفەتانە:

أ. پاکێتی: گەر ئەم سیفەتە بۆ هەموو کەسێك پێویست بێت مامەڵەی پێ بکات لەگەڵ دەوروبەری بە راستگۆیی و متمانە و ئەمانەت و بێلایەنی، و هاوشێوەکانی ئەمانە، ئەوا بۆ ئەو کەسەی ترسناکترین وەزیفەی ژیانی کرداری لە هەموو دەوڵەتانی جیهاندا لە ئەستۆدایە گرنگتر و پێویستترە، چونکە هەڵەی کەسانێك کە قازی نین دەتوانرێت باربوو بکرێتەوە، بۆ نموونە گەر مامۆستایەك لە راڤەکردنی دەقێکدا هەڵەی کرد، دەتوانرێت ئەو هەڵەیە راست بکرێتەوە لە لایەن کەسێکی ترەوە یان لە لایەن خودی هەڵەکەرەکە خۆیەوە، گەر بازرگان هەڵەی کرد لە مامەڵە کردن لەگەڵ خەڵکیدا دەتوانرێ راست بکرێتەوە و کەسی زیان بەرکەوتوو باربوو بکرێتەوە، بە پێچەوانەی هەڵەی قازییەوە کە قابیلی راست کردنەوە نییە، دوای دەرکردنی حوکمێکی هەڵەی نادادپەروەرانە لە پلەی برلنەوەیدا و دوای بەڕاستزانینی حوکمەکە لە دادگای بالا و کۆتاهاتنی کاتی تانەدان لە حوکمەکە، ئەو کات بە زۆری هیچ رێگەیەك نامێنێتەوە بۆ راستکردنەوەی ئەو خراپانەی

لەو هەڵەیەوە پەیدا دەبن، "پاکێتی" سیفەتێکی کەماڵی پێویستە لە یەك کاتدا و خودی و بەخشراوە بەو کەسە لە هەموو کات و بارێکدا.

ب. دلەمەزراویی: لە ئاکارە دروست و پەسەندەکان بریتییە لە دلەمەزراویی و مانەوەی مرۆڤ لەسەر یەك رێباز و رێچکە لە ژیان لە هەموو کات و شوێن و حاڵ و بارێکدا، دلەمەزراویی یەکێکە لە سیفەتە سەخت و گرانەکان و کەمجار مرۆڤ دەتوانێت خۆی پێ برازێنێتەوە و بەردەوام بێت لەسەری بە تایبەت لە سەردەم و چاخێکدا کە ئەنگێزەی مادی بەسەر ئەنگێزەی مەعنەویدا زاڵ بووە، لە ژیاندا زۆرێك لە خەڵکیم بینیوە کە وەرگەڕاون و جولاون و بە رەنگی جۆراوجۆر رەنگیان گرتووە، بە مەبەستی بەدەستهێنانی پۆست و پلە و پایە و ماڵ و سەرمایە، وەك وەرگەڕانی پەڕێك بە دەم رەشەباوە، بەهۆی گرانی سیفەتی دلەمەزراوییەوە مەزنترین پیاوی مێژووی مرۆڤایەتی بە شایەتی بیرمەندان و فەیلەسوفان، سەروەرمان محمد(ﷺ) سکاڵای لەدەست کردووە، کاتێ دەفەرموێت: ((هود پیری کردم))، واتە سورەتی هود لە قورئانی پیرۆزدا، چونکە ئەم ئایەتە پیرۆزە لەخۆ دەگرێت: ﴿فَاسْتَقِمْ كَمَا أُمِرْتَ وَمَنْ تَابَ مَعَكَ وَلاَ تَطْغَوْاْ إِنَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ﴾. [1]

ج. ئەمانەت و راستگۆیی و بێلایەنی: چونکە کاری قەزا داوای ئەو سیفەتانە دەکات بۆ ئەوانەی کاری قەزا جێبەجێ دەکەن، تاکو دادپەروەری دەستەبەر ببێت و یەکسانی جێبەجێ بکرێت.

د. ژیرییەکی پێگەیو و پەی پێبردنی تیژ و توانایەکی بێوێنە و بەهێز لەسەر شیکردنەوە و هۆ دۆزینەوە و تێگەیشتن و هەڵهێنجان.

هـ. کەسێك بێت خاوەنی کەسایەتییەکی بەهێز و جەستەیەکی چوست و چالاکی هەبێت و تەندروست بێت لە هەستە دەرەکی و ناوەکییەکانیدا تاکو پارێزگاری بکات لە هەیبەت و رێز و کەسایەتی خۆی، پێویستە ئەو دلەمەزراوەی کەسێك کاندید دەکات بۆ ئەوەی ببێت بە قازی لە داهاتوودا سەربەخۆ بێت و پەیوەست نەبێت بە لایەنێکی سیاسی یان ئیداری یان حیزبییەوە، تاکو بتوانێت پەی بەو سیفەتە ئاماژەبۆکراوانە ببات.

[1] سورة هود / ١١٢

# باسی دووەم:
# لێوەشاوەییە بەدەستهاتووەکان

قازی دەسەڵاتەکان بەدەست دەهێنێت بۆ دەستەبەرکردنی دادپەروەری و یەکسانی، هەروەها لێوەشاوەییەکان و شارەزاییە زانستی و کردارییەکانی لە سێ سەرچاوەوە–بە سێ قۆناغ– بەدەست دەهێنێت، ئەوانەش: کۆلێژی یاسا، و پەیمانگای باڵا بۆ کاری قەزا یان پەیمانگای قەزایی، لەگەڵ ئەزموونی کارە یاساییەکان.

## قۆناغی یەکەم: خوێندنە تیورییە یاساییە سەرەتاییەکان

ئەم قۆناغە لە یەکێك لە کۆلێژەکانی یاسا(ماف)دا دەبێت کە بە فەرمی دانپێدا نراوە.

ئەوەی روون و ئاشکرایە خوێندن لەم قۆناغە بەراییانەدا لەناو کۆلێژی یاسادا بەزۆری و بە شێوەیەکی رەها خوێندنی تیورییە(نەزەرییە)، لەوانەشە خوێندنێکی رووالەتی بێت و قوتابییەکە شان لەسەر لەبەرکردنی زارلوەکان دابدات بەبێ چوونە ناو قوڵایی ماناکانیانەوە، بۆیە ئەقڵیەتێکی یاسایی و زەینێکی فیقهییان پێ نابەخشێت تاکو شایستەیان بکات بە قۆناغی دووەم کە قۆناغی پەیمانگای قەزاییە.

بۆیە پێویستە رێگەیەکی رۆشن بوونی هەبێت بۆ دڵنیابوونەوە لە لێوەشاوەیی بەدەستهاتوو لەم قۆناغەدا(قۆناغی کۆلێژی یاسا) تاکو ئامادەی بکات بۆ چوونە ناو قۆناغی دواتر، پێویستە یاسا پرۆسەی هەڵبژاردنی قازی بە شێوەیەکی رۆشن دیاری بکات، و پێوەرگەلێکی روون و دیار بۆ هەڵبژاردنی کاندیدەکان بۆ قەزای داهاتوو بوونی هەبێت، هەروەها پێویستە ئەو پێوەرانە شان لەسەر خاڵی بابەتیانە دابدەن، وەك دیاریکردنی شایستەیی و لێوەشاوەیی(الكفاءة)، هەروەها تایبەتمەندی کاندیدەکان بە هەند وەربگیرێت و پرۆسەی هەڵبژاردنی قازییەکان بخرێتە ژێر چاودێری دەستەیەکی بێلایەنەوە، وەك دەستەی قەزایی، هەروەها پرۆسەی هەڵبژاردنی قازییەکان شەفاف بێت و پێوەرەکانی

هەڵبـژاردن و ئـەزموون کـردن ئاشـکرا کرابێـت، پێویسـتە نـاوی کاندیـدەکان و ژیاننامـەی تاکەکەسییان رابگەیەنرێت، هەروەها ئەو دامەزراوەی کە بەرپرسە لە هەڵبژاردنی قازییـەکان پێویستە لە وەزارەتی داد و پـەیمانگای قـەزایی سـەربەخۆ کرابێـت، تـاکو لـە لایـەنگیری و دەستتێوەردانی دەرەکی دووربخرێتەوە، هەروەها پێویستە پرسیاری ئەزموونەکان فیکـری بن و لەلایەن لیژنەیەکەوە دانرابن و بە لیژنەی دووەم پرسیارەکان بپشـکنرێن و بـە لیژنـەی سێیەم وردکاری بکرێن.

## قۆناغی دووەم: جێبەجێ کردنی کارە یاساییەکان:

ئەوەی ئاشکرایە ئەوەیـە هـەموو ئـەنجامێکی ئەرێییانـەی خـاوەن سـوودی گشـتی کـە خزمەتی بەرژەوەندی گشتی بکات و مرۆڤ بە کۆمەڵگەکەی خۆی پێشکەشی بکـات بریتییـە لە بەروبوومی سێ پێشەکی کە ئەو ئەنجامەی لەسەر وەستاوە:

پێشەکی یەکەم: کۆمەڵێك بیر و بۆچوون و تێروانینی خودی مرۆڤـە کـە سەرچـاوەکەی بریتییە لە ژیرییەکی تەندروست یان بەدەستهاتوو لە خوێندنەوەی تیوری، ئەوانە لە زەینـدا کەڵەکە دەبن یان لەناو یەکێك لە هەستە ناوەکییەکانی مرۆڤدا کۆدەبنەوە.

پێشەکی دووەم: بریتییـە لـە زاراوە و رسـتە و گوزارەگـەلێك کـە ئـەو بـیر و بۆچـوون و تێروانینانە دەردەبڕن و دەبـن بـە قاڵـب بۆیـان و لـە جیهـانی نـاوەوە بـۆ جیهـانی دەرەوە دەریدەهێنن تاکو کەسانی تر–ئەوانەی ئەو بابەتەیان لا گرنگە– بیبینن.

پێشەکی سێیەم: بەکارهێنانی کۆی دوو پێشەکییەکەی تر لە مەیدانێك لـەو مەیدانانـەی کە تایبەتن پێی، لە رووی پراکتیکی و کرداریەوە.

گەر هەر یەکێك لەم سێ پێشەکییە دواکەوت ئەوا پرۆسەکە دەبێتە پرۆسەیەکی نەزۆکی بێئەنجامی نەخۆش.

رێکارە قەزاییەکان لـەو سـێ پێشـەکییە ئامـاژە بۆکراوانـە پێکـدێن، لـە بەرزکردنـەوەی داواوە لەبەردەم قەزادا و خستنەرووی بابەتی داواکـە هـەتا زانیارییـە قەزاییـە بیسـتراوەکان وەك قسـەی شـایەتەکان یـان زانیارییـە خوێنراوەکـان وەك راپـۆرتی بـەرزکراوە لـە قـازی تەحقیقەوە یان لـە پزیشـکی دادەوە، هـەروەها خوێندنـەوەی پێشکەشکراو لـە دەسـتەی داوەری گشتییەوە(الإدعاء العام) یان بینراو وەك بینینی شوێنەواری تاوانەکە و جێ پەنجە

و پەڵەی خوێن و هاوشێوەکانیان، تا دەرکردنی بڕیاری کۆتایی بە تاوانبارکردن یان بێتاوانی دوای ئەوەی قازی لە هەموو زانیارییەکانەوە قەناعەتی بە یەك سەرئەنجام بۆ دروست دەبێت، ئەوەش بریتییە لە بڕیارێکی دادپەروەرانەی ئاشکراکراو بۆ هەموو ئەوانەی پەیوەنددارن بە داواکەوە و شایستەن بەو بڕیارە بەبێ ئەوەی ستەملێکراو یان مافخوراو یان ستەمکار بوونی هەبێت لە یەکێك لە دوو لایەنەکەی رکەبەر و ناکۆك لەگەڵ یەکتر.

ئاشکرایە سەرچاوەی بەدەستهێنانی بیر و بۆچوون و نەزەریاتی یاسایی بریتییە لە خوێندن لە چوار قۆناغی کۆلێژی یاسا و پەیمانگای قەزایی بالا لە درێژایی ساڵەکانی خوێندنیدا.

هەندێ جار کەسی یاسایی لە خوێندنەوەی دەرەکی خۆیەوە –بەدەر لە ئەو قۆناغانەی خوێندن– سەرچاوەی بیر و بۆچوون بۆ باسە یاساییەکان بەدەست دەهێنێت.

بەڵام سەرچاوەکانی بەدەستهێنانی شارەزایی کرداری و لێوەشاوەیی پراکتیکی بریتییە لەمەیدانی کار و گۆڕەپانی جووڵەی کرداری لە مەیدانەکانی پارێزەری یاریدەدەری قەزایی و لێکۆڵەری داد و نووسەری داد و دەستەی داوەری گشتی و بەرپرسی بەشی یاسایی لە فەرمانگەکان و دامەزراوەکان و هاوشێوەکانیان لە مەیدانە جۆر بەجۆرەکان لە راپەڕاندن و جێبەجێ کردنی کارە یاساییەکان.

پیشەی پارێزەری فەزڵی بەسەر پیشە یاساییەکانی تردا هەیە، چونکە پارێزەر چوونە ژوورەوە بۆ هەموو گۆشە یاساییە وردەکان لەلای گرنگە بۆ ئەوەی ئەو دلوای پێ بباتەوە کە گرتوویەتە دەست، هەروەها لەبەر ئەوەی لە کاتی گفتوگۆ قەزاییەکاندا لە کاتی دادبینی و شیکردنەوەی زانستی و هۆهێناوە ئامانجییەکان و هەڵهێنجانە پێویستەکاندا توانای زۆرتر و لێوەشاوەیی زیاتر دەکات تاکو کاری قەزا لە داهاتوودا بگرێتە دەست.

پاشان کەسی یاساناس وەك چۆن شارەزایی نەزەری بەدەست دەهێنێت لە خوێندنەکانییەوە بەهەمان شێوە دەگونجێ بیر و بۆچوون و تیورە یاساییەکان لە بیناکەرانی بیری ئەو کەسە بن، لە هەموو بارەکاندا ئەو کەسەی قەزا دەگرێتە دەست بەبێ گوزەرکردن بەناو شارەزایی یاسایی بەدەستهاتوودا لەپیشەی یاسایی بە زۆری کەسێکی سەرکەوتوو نابێت لە جێبەجێ کردنی کارەکەیدا.

بۆیە پێویستە ئەو کەسەی کە پۆستی قەزا دەگرێتە دەست لێوەشاوەیی تیوری و لێوەشاوەیی زانستی لە خۆیدا کۆبکاتەوە.

گەر بە تەواویی شایستە نەبێت و یەکێك لەو سێ پێشەکییە ئامـاژەبۆکراوەی تێدا دوابکەوێت سەرئەنجامەکەی بڕیاری ناکامڵ و نا دادپەروەرانەی لێوە پەیدا دەبێت، بەپێی ئەو ڕێسا لۆژیکییەی کە دەڵێت: (سەرئەنجام شوێنی نزمترین و لاوازترین پێشەکی خۆی دەکەوێت)، گەر یەکێك لەو پێشەکیانە ناتەواو بوو سەرئەنجامەکە ناتەواو دەبێت، گەر پێشەکییەکە نەرێی(نێگەتیڤ) بوو سەرئەنجامەکە نەرێیی دەبێت، گەر پێشەکی بەشەکی(الجزئي) بوو سەرئەنجامەکە بەشەکی دەبێت، هەر بەو جۆرە گەر پێشەکی گومانئامێز بێت سەرئەنجامەکە گومانئامێز دەبێت.

لەسەر دەرئەنجامی کۆتایی ئەوەی باسمان کرد پێویستە کەسی کاندیدکراو شارەزایی زانستی و پیشەی کاری یاسایی ئەنجام دابێت بەر لەوەی لە پەیمانگای قەزایی وەربگیرێت، یان دوای دەرچوون لەو پەیمانگا بەسەرکەوتویی و پێش دامەزراندنی بە مەرجێك ماوەی هەڵسوڕاندنی کارەکەی بەس بێت بۆ بەدەستهێنانی لێوەشاوەیی قەزایی.

باشترە ئەم هەڵسوڕاندنە پێش چوونە ناو پەیمانگای قەزایی بێت تاکو ببێتە ئەڵقەی گەیاندنی نێوان شارەزایی نەزەری بەدەستهاتوو –لە قۆناغی خوێندنی کۆلێژی یاسادا– لەگەڵ ئەوەی بەدەستی دەهێنێت لە شارەزایی لە پەیمانگای قەزایی، لەوێوە سەرئەنجامی حوکمی قەزایی دادپەروەرانەی لێوە پەیدا ببێت، بەوەی ماف بۆ هەموو خاوەن مافێك بگێڕێتەوە بە سزایەکی دادپەروەرانە.

## قۆناغی سێیەم: بەدەستهێنانی لێوەشاوەیی قەزایی لە پەیمانگای قەزایی.

پێشنیار دەکەم پەیمانگایەکی قەزایی لە کوردستانی عێراق دابمەزرێت و بێنیاز ببین لەو پەیمانگا قەزاییەی لە بەغدایە، بە هۆی ئەم فاکتەرانەوە:

١. دوورخستنەوەی دیاردەی ڕەگەزپەرستانە لە هەڵبژاردندا کاتی وەرگرتنی کاندیدەکان.

٢. خراپی خوێندنی ئەو پەیمانگا بۆ ئامادە کردنی قازی بەم نۆخەی ئێستایەوە، بۆ ماوەی حەوت ساڵ لەو پەیمانگا قەزاییە وانەم وتەوە، بینیم کەسەکان لێوەشاوەیی بەدەستهاتووی تەولو دەستەبەر ناکەن تاکو پۆستی قەزا بگرنە دەست کە ترسناکترین پۆستە، ئەوەش بۆ ئەم هۆیانە دەگەڕێتەوە:

أ. ٥٠٪ی خوێندن لە دوو ساڵی بڕیاردراوی خوێندندا دووبارەبوونەوە و وتنەوەی ئەو مادانەیە قوتابی لە کۆلێژی یاسادا وەریگرتووە.

ب. ٣٠٪ی خوێندنی پیادەکردن(تطبیق)ییە لەلایەن قازییەکانەوە یان ئامادەبوونی قوتابی لە دادگاکاندا لە کاتی ڕێکارە قەزاییەکاندا، پیادەکردنی قازییەکان لێکۆڵینەوەی تیۆرییانەیە زیاتر لەوەی کارێکی کرداریی بێت، لە ناو ئامادەبوونی ڕێکارە قەزاییەکاندا لە دادگادا کات و تەمەن بەفیڕۆدانە بەهۆی بەرتەسکی ئەو کاتە تایبەتەی پێیان دەدرێت، هاوڕێ لەگەڵ نەهاتنی هەندێکیان بۆ ئامادەبوون لە ڕێکارە قەزاییەکانی ناو دادگادا، ئەو کاتەی لە پەیمانگای قەزایی وانەم دەوتەوە پێشنیارم کرد ڕێکارە قەزاییەکان بە ئامێرێك تۆمار بکرێت و پاشان لە ڕێگەی ئامێرێکەوە لە هۆڵی وانە وتنەوەکاندا –بە ئامادەبوونی مامۆستایەکی پسپۆڕ– بەسەریاندا پەخش بکرێتەوە، ناو بەناو داوایان لێ بکات سەرنج و تێبینی خۆیان دەربڕن و ڕای خۆیان لەسەر ئەو ڕێکارە قەزاییە بخەنە ڕوو، بەڵام بەداخەوە کەسێکم نەبینییەوە گوێ بۆ پێشنیارەکەم بگرێت.

ج. کەمی بوونی کادیری وانەبێژ کە لێهاتووی زانستی باڵای هەبێت و شایستەی بکات بۆ وانە وتنەوە لەو قۆناغەدا.

د. نەبوونی زانستە ئەقڵییەکان کە پێویستن بۆ قازی و هەموو ئەوانەی مامەڵە لەگەڵ دەقدا دەکەن وەك زانستی مەنتق و فەلسەفە و ئوسوڵی فیقە، ئەم زانستە کە پێیان دەوترێت زانستی ئامرازی(العلوم الآلیة) ئامانجەکەی ئامادەکردنی مرۆڤە تاکو بە ڕێگەیەکی زانستی دروستی دادپەروەرانە حوکم لە دەق دەربهێنێت.

بۆیە زانستی ژیریێژی(مەنتق): گەر ڕەچاوی یاسا و ڕێساکانی زانستی مەنتق بکرێت زەینی قازی لە هەڵە دەپارێزێت لە بەدەستهێنانی نادیارەکان لە زانراوە فەراهەم

هاتووەکانەوە، بۆیە ئەو زانراوانەی پێش بەدەستهێنانی نەزانراو دەکەون هەیانە بیستراوە وەک قسەی شاهیدەکان و چاوپێداخشانی جێگری دادوەری گشتی، هەیانە خوێنراوەیە وەک راپۆرتی قازی لێکۆڵەر و پزیشکی داد، و هەشیانە بینراوە وەک بینینی ئاسەواری تاوان.

ئەوەی روون و ئاشکرایە ئامانجی ئەم زانیاریانە بریتییە لە گەیاندنی قازی بە نادیاری داواکراو، ئەوەش حوکمێکی دادپەروەرانەیە.

زانستی فەلسەفە: قازی رێنموونی دەکات بۆ دۆزینەوەی هۆی بە ئامانجگیراو لە پیادەکردنی یاسا و چۆناندنی رووداوی یاسایی و تاوتوێکردنی یاسایی.

زانستی ئوسوڵ فیقە: ئەقڵی قازی لە هەڵە دەپارێزێت لە کاتی هەڵهێنجانی حوکم لە سەرچاوەکەیەوە.

بەهۆی ئەوەی ئاماژەمان پێکرد لە ناتەواوی پەیمانگای قەزایی دامەزراو لە بەغداد پێویستە بەرپرسانی حکومەتی هەرێمی کوردستانی عێراق پەلە بکەن لە کردنەوەی پەیمانگایەکی قەزایی کە تیایدا مەرجەکانی بەدەستهێنانی لێوەشاوەیی پێویست بۆ قازی تێدا بێت تاکو لەو رێگەیەوە دادپەروەری و یەکسانی دەستەبەر ببێت.

# بەشی دووەم

## پابەندبوونەکانی قازی و مافەکانیان

لێکۆڵینەوەی ئەم بابەتە بەسەر دوو باسدا دابەش دەبێت، یەکەمیان تایبەتکراوە بە پابەندبوونەکانی قازی و دووەمیان بریتییە لە مافەکانیان.

# باسی یەکەم:
# پابەندبوونەکانی قازی

قازی چاك و شیاو بۆ دەستەبەرکردنی دادپەروەری و یەکسانی وەفادار دەبێت بەم پابەندبوونانەوە:

١. پارێزگاری لە رێز و پایەی قەزا و دوورکەوتنەوە لە هەر شتێك شك و گومان بخاتە سەر دامەزراوی قازی و بەدەستهێنانی ئامانجی یاسا لە دادپەوەری و یەکسانیدا.
٢. شاردنەوەی کاروبار و زانیاری و دۆکۆمێنت کە تەماشای دەکات و لێی بەئاگا دەبێت بەهۆی کارەکەیەوە یان لە دووتوێی کارەکەیدا گەر بە سروشتی خۆیان نهێنی بوون یان گەر بڵاوەیان پێ بکرێت ترسی ئەوە هەبێت زیان بە دەوڵەت و کەسانێکی سروشتی بکەوێت، تەنانەت ئەم پابەندبوونە راوەستاو و بەردەوام دەبێت لە دوای کۆتاهاتنی کارەکەی و خزمەتە قەزاییەکەی.
٣. کار نەکردن لە مەیدانی کاروباری بازرگانی و هاوشێوەکانیدا و ئەو کارانەی کە شایستە نییە بە شوێنەکەی و گونجاو نییە لەگەڵ پیشە قەزاییەکەیدا.
٤. پێویستە لەو کەیسانە ورد ببێتەوە کە دەچێتە ناو پسپۆڕی ئەوەوە و لە سنووری ناوچەی ئەودا بێت و ئەو سنوورە نەبەزێنێت.
٥. پابەند بێت بە بنەمای یەکسانییەوە لە مامەڵە کردنی لەگەڵ داواکەر و داوالەسەرکراو، بەوەی بێلایەن بێت و لایەنگیری نەکات بۆ یەکێك لە دوو لایەنەکە.
٦. پێویستە قازی لایەنگری دەوڵەت نەبێت، یان ئینتیمای بۆ حیزبێك-سروشتی هەر چییەك و هەرچۆنێك بێت- نەبێت، هەروەها نابێت ئەندام بێت لە رێکخراوێکی سیاسیدا.

٧. بخرێتە ژێر چاودێری قەزاییەوە لە هەموو ئەو بڕیارە قەزاییانەی دەریدەکات و لە هەڵسوکەوتە تاکە کەسییەکانیدا گەر بەپێی یاسا پێی ڕەوا نەبینرا بوو لەو بابەتەی کە بە دەسەڵاتی قەزایی لێی ورد دەبێتەوە.

٨. پێویستە ڕێگری بکات لە جێبەجێ کردنی یاسا نادەستورییەکان، هەروەها پێویستە لەسەری دەسەڵاتی یاسادانان ئاگادار بکاتەوە لەمەڕ هەر یاسایەکی نادەستووری و هەر مادەیەکی نادەستووری.

٩. خۆی کۆت و بەند نەکات بە ڕووالەتی دەقەوە لەو پرسانەدا کە ناسزایین گەر بینی ئەو کۆت و بەندە پێچەوانەیە لەگەڵ دادپەروەری و یەکسانیدا، چونکە دەقی یاسایی دەردەکرێت و چاکسازی تێدا دەکرێت و هەڵدەوەشێنرێتەوە لە پێناوی دەستەبەرکردنی دادپەرەری و یەکسانیدا، یاسا ئامرازە نەك ئامانج، بۆیە هیچ بەها و نرخێك بۆ ئامراز بوونی نییە گەر ئامانجە ڕەواکە دەستەبەر نەکات.

لە پرسە سزاییەکاندا قازی–سەرەڕای کۆتوبەندبوونی بە ڕووالەتی دەقەوە لەسەر بنچینەی ئەو بنەمایەی کە دەڵێت: "تاوان و سزا تەنها بە یاسا بوونیان هەیە"– پێویستە لەسەری هەوڵبدات شرۆڤە بۆ دەقەکە بکات یان لێکدانەوە یان کارکردن بە ڕەوشی دەرەکی و ناوەکی کەسی تۆمەتبار لە کاتێکدا زانی کۆتوبەندبوون بە ڕووالەتی دەقەوە پێچەوانەیە لەگەڵ دادپەروەریدا، بە مەرجێ ئەو کارەی سەرنەکێشێت بۆ سەرهەڵدانی تاوانێك یان سزایەکی نوێ.

شایانی باس کردنە ئەم بنەمایە لە دەستوورەکانی سەرجەم وڵاتانی جیهان لە چاخی نوێدا بە دەق تۆمارکراوە، لەم بنەمایەوە ڕێساگەلێکی گشتی پاڵفتە دەکرێن کە قازی پێیانەوە پابەند دەبێت، گرنگترنیان ئەمانە:

أ. نە ئەنجامدان و نە ئەنجام نەدان بە تاوان نازمێررێن مەگەر لە ڕێگەی یاسایەکی دەرچووەوە پێش هەستان بە تاوانەکە، بەو مانایەی کە یاسای سزادان جێبەجێ ناکرێت بەسەر پێشکاریگەریدا گەر لە یاسادا پێچەوانەی ئەوە نەهاتبێت.

ب. ئەسڵ لە شتە بەسوودەکاندا موباحبوونە.

ج. کەسی تۆمەتبار بێگوناهە تا تۆمەتبارکردنەکەی بەسەردا جێگیر دەبێت(ساغ دەبێتەوە)

د. ئەسڵ ئەستۆ پاکییە لە هەموو بەرپرسیارێتییەکی سزایی و مەدەنی، چونکە بەبێ تاوانی و بێ گوناهی لەدایك دەبێت، بۆیە پێویستە لەسەر قازی ئەو کەسە وادابنێت کە بێتاوانە لەو تۆمەتەی درلوەتە پاڵی تا پێچەوانەی ئەوە بەسەریدا ساغ دەبێتەوە.

هـ. ئەسڵ لە سیفەتە لابەلاکاندا نەبوونە، ئەوەی ئاشکرایە ئەوەیە تاوان سیفەتێکی لابەلایە سەرهەڵدەدات دوای ئەوەی بوونی نەبووە، بۆیە گەر بەڵگەی داواکەر و داوالەسەرکراو دژ بەیەکتر وەستان بەڵگەی داوالەسەرکراو پێش دەخرێت(وەردەگیرێت)، چونکە لەگەڵ ئەسڵەکەدایە، لەسەر ئەم بنچینەیە دیسان بەڵگە لەسەر داواکەر هاتووە، چونکە پێچەوانەی ئەسڵ داوا دەکات، سوێند بۆ کەسێکە کە تۆمەتەکە رەد دەکاتەوە چونکە لەگەڵ ئەسڵدایە.

و. کاری تاوانکاری سنووردار –بە پێچەوانەی کارە نارەوا زیانبەخشەکانەوە– دلوای باربووکردنەوە دەکەن لە پرسە مەدەنییەکاندا، ئەوانە ناچنە ژێر هەژمار و سنووردار کردنەوە.

ز. گومان بە بەرژوەندی تۆمەتبار لێکدەدرێتەوە و شرۆڤە دەکرێت، چونکە ئەسڵ بەریبوونە.

ح. لە بە تاوان دانانی ئەنجامدانی کارێك یان ئەنجام نەدانی یان راگەیاندنی سزایەك رێگە بە پێوانە نادرێت، وەك چۆن نابێت دەقێکی سزایی بەرین و فروان بکرێت لە رێگەی پێوانەوە لە پرسە سزاییەکاندا، چونکە بەکارهێنانی پێوانە تیایدا پێچەوانەیە لەگەڵ بنەمای شەرعیدا.

١٠. گەر رێسایەکی سزایی یاسا بۆ دارێژراوی نادادپەروەر دژ وەستایەوە لەگەڵ رێسایەکی دادپەروەرانەی یاسا بۆ دانەرێژراودا ئەوا پێویستە لەسەر قازی یەکەمیان لە کارپێکردندا پێش بخات بەسەر دووەمدا، چونکە سزایی یاسا بۆ دارێژراو –هەر چەند سزایەکی دڵرەقانەی نادادپەروەرانە لە ئامێز دەگرێت– بۆ خەڵکی رایدەگەیەنێت کامە موباحە و کامە ناموباح و قەدەغەکراوە، بۆیە هیچ پاساو و بیانوویەکیان بۆ نییە کاتێك بە تاوانێك هەڵدەستن و ئەو دەقەیان بەسەردا جێبەجێ دەکات.

ئەمە لە روویەکەوە، لە روویەکی ترەوە ئارامی بۆ هاولآتیان بەرژەوەندییەکی گشتییە، رەچاوکردنی دادپەروەری لە پرسێکی دیاریکراودا لەپێشترە لە بەرژەوەندییەکی تایبەت، بۆیە یەکەم بەسەر دووەمدا پێش دەخرێت لە کارپێکردندا.

١١. پابەندبوون بە کارکردن بە سنووردارکردنەوە بەپێی بنەمای کەسایەتی تاوانەکە، نابێت دادگایی و پرسیار لە کەسی بێتاوان بکرێت لە کەسوکاری یان کەسانی تر لەمەڕ تاوانێك کەسێکی تر ئەنجامی داوە، قورئانی پیرۆز سەدان ساڵە ئەم بنەمایەی راگەیاندووە لە زۆرێك لە ئایەتەکانیدا، لەوانە: ﴿وَلاَ تَكْسِبُ كُلُّ نَفْسٍ إِلاَّ عَلَيْهَا وَلاَ تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَى﴾. [1]، واتە شان نادات ژێر هەمان بەرپرسیارێتی تاوان کە کەسێکی تر ئەنجامیداوە، هەروەها ئەو ئایەتە پیرۆزەی کە دەفەرموێت: ﴿وَمَنْ ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيْهَا وَلاَ تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَى﴾ [2]

١٢. پابەندبوون بە کارکردن بە رێسای(گەر "ئەگەر" سەریهەڵدا بەڵگەهێنانەوە پووچ دەبێتەوە)، گەر بەڵگەی داواکەر و داوالەسەرکراو دژایەتیان لەگەڵ یەکتر پەیدا کرد و پارسەنگێك بوونی نەبوو بۆ قورسکردنی تای ترازوی لایەکیان بەسەر ئەویتریاندا پێویستە کارکردن بە بەڵگەی هەردوو لایان پشتگوێ بخرێت بەهۆی ئەگەری راست و درۆوە لە دوو بەڵگەکەدا کە یەکسانن بە یەکتر، بینا لەسەر ئەوەش "ئەگەر" لە هەردووکیاندا سەرهەڵدەدات، لەوێوە کارکردن بە هەردووکیان پووچ دەبێتەوە.

١٣. قازی پابەند دەبێت بەوەی بریارێك بدات چاکتر و باشتر بێت بۆ کەسی تۆمەتبار[3]، کەی یاسای نوێ چاکتر و باشتر دەبێت بۆ کەسی تۆمەتبار؟ چاکتر و باشتر بە یەکێك لەم رێگانە دەناسرێتەوە[4].

---

[1] سورة الانعام / ١٦٤

[2] سورة الاسراء /١٥

[3] گەر یاسایەکی نوێ دەرچوو پەیوەست بە تۆمەتی کەسی تۆمەتبار بەر لەوە بریاری دادگا دەربچێت و پلەی کۆتایی بەدەست بهێنێت کاردەکرێت بەوەی چاکتر و باشترە بۆ کەسی تۆمەتبار لە یاساکەی پێشوو و دواتردا.

[4] ينظر د. محمود نجيب حسني / الموجز في شرح قانون العقوبات المصري /القسم العام / ص ٧٤ ومايليها.
د. رؤوف عبيد / مبادىء القسم العام من التشريع العقابي / ص ١٥ ومايليها.

یەکەم: قازی بەراورد بکات لە نێوان دوو یاسادا(کۆن و نوێ) بۆ تۆمەتبارێکی تایبەت لەگەڵ رەچاوکردنی رەوشتی تایبەت و تاکەکەسی تۆمەتبارەکە، نەك بۆ کۆمەڵێك لە تۆمەتباران کە رەوشیان لەیەکتر جیاوازە، دیاریکردنی چاکتر و باشتر بریتییە لە جێبەجێ کردنی رێساگەلێکی یاسایی کە دەسەڵاتی دەقی سزایی دیاری دەکات لە رووی کاتەوە(واتە: "کەی"ی فەلسەفیانە)، و چۆناندنی نوێ–بەوەی چاکتر و باشترە بۆ کەسی تۆمەتبار– لە کار و ئەرکەکانی قازییە و حەز و بڕیاری کەسی تۆمەتباری تێدا نییە، بۆیە بۆ قازی دروست نییە هەڵبژاردن بۆ کەسی تۆمەتبار بەجێبهێڵێت تاکو ئەوەی باشتر و چاکترە لە یاسا بۆ خۆی دیاری بکات.

دووەم: قازی پابەند دەبێت بەوەی رێنومایی وەربگرێت لە کۆگرییەکان و پێوەرگەلێکی دیاریکراو کە بەهۆیەوە یاسای چاکتر و باشتر بۆ تۆمەتبار دیاری بکات، بۆیە نوێ دەبێت بە چاکتر و باشتر لەبەر رۆشنایی ئەو پێوەرانەدا:

أ. گەر یاسا نوێکە ئەنجامدانی ئەو کارەی موباح کردبوو دوای ئەوەی کۆنەکە سزای لەسەر دەرکردبوو.

ب. گەر لە نوێکەدا سزاکە سووك کرابوو.

ج. گەر یاسا نوێکە دانی بە رێگرێکی نوێ لە رێگرەکانی بەرپرسیارێتی سزاییدا نابوو، بەوەی ساڵی دەستپێکردنی ئەو بەرپرسیارێتییەی بەرزکردبێتەوە، وەك چۆن یاسای چاودێری نەوجەوانان[1] ئەو ساڵەی بەرزکردۆتەوە لە حەوت[2] ساڵی تەمەنەوە بۆ تەواوی نۆ ساڵی تەمەن.

د. گەر یاسا نوێیەکە پایەیەك یان مەرجێکی تازەی بۆ تاوانەکە خستە سەر کە لە ژێر سێبەری یاسا کۆنەکەدا بوونی نەبوو.

هـ. گەر یاسا نوێیەکە پاساوێکی یاسایی بەخشراوی بڕیاردا کە لە یاساکەی پێشوودا بوونی نەبوو.

---

[1] رقم ٧٦ لسنة ١٩٨٣ المادة (٤٧) التي نصها (لا تقام الدعوى الجزائية على من لم يكن وقت ارتكاب الجريمة قد لتم التاسعة من عمره)

[2] ساڵی جیاکردنەوە تەولوکردنی شەش ساڵییە لە تەمەن بەپێی مادەی (٩٧–٢) لە یاسای مەدەنی عێراقی ژمارە ٤٠ی ساڵی ١٩٥١ کە دەقەکەی(ساڵی جیاکردنەوە حەوت ساڵی تەولوە)

١٤. لە هەر شوێنێکدا گوزارەی "لەسەر دادگا پێویستە" یان "دادگا بڕیار دەدات" یان هاوشێوەکانی ئەم گوزارانە، قازی پابەند دەبێت بڕیار بدات بەپێی ئەوەی لە دەقەکەدا هاتووە[1].

لە پیادە کردنەکانی ئەم شێوەیە ئەوەیە کە لە مادەی(٤١)ی یاسای باری کەسێتیدا راوەستاودا هاتووە لە (١.هەریەك لە دوو هاوسەرەکە مافی داوای جیابوونەوەیان هەیە لە کاتی سەرهەڵدانی جیاوازی لە نێوانیاندا جا ئەو دلوایە پێش چوونە لای یەکتر بێت یان دوای چوونە لای یەکتر. ٢.لەسەر دادگا پێویستە بەدواداچوون بکات بۆ هۆی جیاوازییەکانی نێوانیان، گەر ئەو جیاوازییانە بوونیان هەبوو ئەوا داوەرێك لە خانەوادەی ژنەکە و داوەرێك لە خانەوادەی پیاوەکە دیاریدەکرێت..)

ئەم پابەندبوونانە تەنها پابەندبوونێك نین، بەڵکو کۆمەڵێك پابەندبوونی تر بوونیان هەیە کە لێرەدا جێگەی باسکردن نین، هەموو ئەوەی دەستوور پێویستی دەکات لەسەری یان یاسا یان سەرچاوەکانی تر، پێویستە هەڵبستێت پێیان و پابەند بێت پێیانەوە.

[1] ينظر مؤلفنا المنطق القانوني في التصورات ص ٣٩ وما يليها

# باسی دووەم:
# مافەکانی قازی

پێشتر باسی ئەوەمان کرد هەموو پابەندبوونێك مافێك بەرانبەریەتی کە دەبێتە بابەتی ئەو پابەندبوونە.

زانایانی یاسا(یاساناسان) تێکەڵییەکیان بۆ دروست بووە لە نێوان شوێنگەی پابەندبوون کە بریتییە لە پێهەستان و جێبەجێکردن لەگەڵ بابەتی پابەندبوون، بابەتی پابەندبوونیان کردووە بە شوێنگەی پابەندبوون، لەگەڵ ئەوەی کە شوێنگەی پابەندبوون بریتییە لە پێهەستان بە نەرێیی یان ئەرێیی، چونکە پابەندبوون لە حوکمە داواکراوییەکانە، و پەیوەست نییە بە شتە بەرجەستەکانەوە، بەڵکو پەیوەستە بە کار و کردەوەکان و مافەکانی هەموو کەسێکەوە کە پێویستە هاوتابێت لە پابەندبوونەکانیدا لە رووی چەندێتی و چۆنێتییەوە.

بۆیە یەکسانی بریتییە لە هاوسەنگی نێوان مافەکان و ئەرکەکان، هەر کەس مافی زیاتر لە ئەرکەکان وەربگرێت کەسێکی ستەمکار و داگیرکارە بۆ مافی گەلەکەی لە سنووری زیادەدا، هەر بەو جۆرە هەر کەس دلوای ئەرکی زۆتر لە مافەکانی لێبکرێت دەبێتە کەسێکی بەشخوراو و ستەملێکراو لە لایەن گەل و کۆمەڵگەکەیەوە.

لە گرنگترین مافەکانی قازی ئەمانەن:

١. پارێزگاری لە ژیانی خۆی و خێزانەکەی لەناو دادگا و لە دەرەوەی دادگا، چونکە قازی بەهۆی سروشتی کارەکەیەوە رووبەرووی ترس و هەرەشە و دەستدرێژی کردنە سەر دەبێتەوە زیاتر لە هەر فەرمانبەرێکی تری دەوڵەت.

٢. دابینکردنی ژیانێکی شایستە بۆ خۆی و خێزانەکەی، گونجاو بێت لەگەڵ پلە و پایە و پۆستەکەی کە لە ترسناکترین پۆست و ئەرکەکانە لە جیهاندا، پاشان پاکێتی

قازی لە پێشەنگەکانی سیفەتی ئەوە کە شایستەی دەکات بۆ هەستان بەکاری قەزا، لە پێویستییەکانی پاکێتی فەراهەم کردنی هەموو پێویستییەکانی زیندەگی و داواکارییەکانی ژیانە.

٣. دابینکردنی تەندروستی خۆی و خێزانەکەی و چارەسەریان لە ناو ولآت و دەرەوەی ولآت لەسەر خەرجی دەوڵەت.

٤. دەستوور یان یاسا دان بە مافی قازیدا بنێت لە مافی ئازادی دەربڕین و هەڵسوڕاندنی پیشەکەی هەتا ئەو پابەند بێت بە مەرجە یاساییەکانەوە کە لێیەوە دەردەکرێت.

٥. سەربەستی هەبێت لە ئیجتیهاددا بۆ شرۆڤەکردنی دەقە لێڵ و تەمومژاوییەکان و لێکدانەوەیان، هەر کاتێك دادپەروەری بانگ بکات بۆ لێکدانەوە.

شایستەی باس کردنە لە دوو حاڵدا قازی ئیجتیهادی بۆ هەیە، بەڵکو پێویستە ئیجتیهاد بکات:

یەکەمیان: حاڵەتی نەبوونی دەقێك لە پرسە تا سزاییەکاندا.

دووەم: دەقەکە دەقی گومانئامێز بێت لە رووی ئاماژەوە، بەوەی زیاتر لە یەك مانا یان زیاتر لە یەك حوکم لە ئامێز بگرێت، لەم بارەدا ئیجتیهاد کردن لەسەر قازی پێویستە بۆ دیاریکردنی حوکمێکی دادپەروەرانە لە نێوان ئەگەری فرە حوکمیدا.

١. دەستوور یان یاسا دابنێت بە سەربەخۆیی تەواوی قازی و دەست تێوەرنەدانی دەسەڵاتی جێبەجێکار لە کاروباری قەزایی، هەروەها دەستتێوەرنەدانی دەسەڵاتی یاسادانان لە رێکارە قەزاییەکاندا گەر هەڵەیەکی ئەنجام نەدابێت.

٢. خاوەنی دەسەڵاتێکی خەملآندن بێت کە نەچێتە ژێر دەسەڵاتی قەزایی باڵاوە گەر هەڵەیەکی یاسایی ئەنجام نەدابوو لەو پرسانەی کە دەچووە ژێر دەسەڵاتە خەملآندنەکەیەوە.

٣. ئافرەت هەروەك پیاو مافی کارکردنی لە قەزادا هەبێت، بە تایبەت لە پرسە خێزانییەکان و کاروبارەکانی باری کەسێتیدا، چونکە ئافرەت شارەزاترە بە گرفتەکانی خێزان و بە تواناترە لە ناسینی ئەوەی لە بەرژەوەندی خێزان و کۆمەڵگەیە.

شایەنی باسکردنە خودا مافی بە ئافرەت داوە هەستێت بە سەرجەم کاروبارەکانی دەوڵەت گەر خاوەنی لێوەشاوەیی بوو بۆ ئەو کار و فەرمانەی دەیگرێتە دەست﴿وَالْمُؤْمِنُونَ وَالْمُؤْمِنَاتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ يَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنْ الْمُنكَرِ﴾(١)

کارێکی حاشاهەڵنەگرە کە ئەرکی فەرمانبەری گشتی لە دەوڵەتدا یان دلوالێکراو بە خزمەتێکی گشتی بریتییە لە فەرمان بە چاکە، واتە بەوەی خێری تاك یان کۆمەڵ یان خێری هەردووکیانی تێدایە، هەروەها رێگری لە خراپە کە بریتییە لە رێگری لە هەرشتێك زیان بە تاك یان کۆمەڵ یان هەردووکیان بگەیەنێت.

ئەوەی روون و ئاشکرایە فەرمانبەری گشتی یان دلوالێکراو بە خزمەتێکی گشتی جگە لەو کارە شتێکی تر ئەنجام نادات.

وشەی "المؤمنات–ئافرەتە باوەڕدارەکان" لە زمانی عەرەبیدا"جمع مؤنث سالم"ە و "ال"ی سەراپای خراوەتە سەر کە "هەموو یان گشت" دەگەیەنێت، ئەم گشتگیرییە هەموو ئەوانە لە ئامێز دەگرێت شایستەن بە فەرمان بە چاکە و رێگری لە خراپە.

بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) لەم گشتگیرییە پۆستی سەرۆکی دەوڵەتی(٢) جیاکردۆتەوە، بەڵام گەر ئافرەت شایستەتر بوو لە پیاو ئەوا پێشی پیاو دەکەوێت، بۆ نموونە بۆچوونی زانای پاکستانی و فەقیهی مەزنی ئەو وڵاتە "أبو الأعلى المودودي" کە وتی: هەڵبژاردنی "فاطمة جناح" زیانی کەمترە لە هەڵبژاردنی "أيوب خان"(٣)، چونکە ئەم پۆستە بە سروشتی خۆی داوای کۆبوونەوەی نهێنی دەکات لەگەڵ بێگانەکان و خەڵکانی تردا، ئەمەش پێچەوانەیە لەگەڵ سیفەتی مێیینەی ئافرەت، بۆیە رێگری کردن بەهۆی ناتەولوی لێوەشاوەیی ئافرەتەوە نییە یان بەهۆی ئەوەوە نییە شایستە نەبێت بەو پۆستە، بەڵکو تەنها داخستنی دەروازەیەکە سەربکێشێت بۆ خراپەکاری، واتە رێگری لەوەی مەشروع و رەوایە گەر سەربکێشێت بۆ سەرئەنجامێکی ناڕەوا و نامەشروع.

---

(١) سورة التوبة /٧١

(٢) فەرمووی: قەومێك سەرکەوتوو نابێت کار و باریان لەدەست ئافرەتێکدا بێت.

(٣) ينظر الدكتور يوسف القرضاوي لولويات الحركة الاسلامية في المرحلة القادمة. /ص٢٩.

١. ساڵانە قازی مۆڵەتی ئاسایی خۆی پێبدرێت، بۆ ئەوەی پشووی تەواو بدات بۆ گێڕانەوە و بەرهەم هێنانەوەی چالاکی و زیندەگی خۆی.
٢. مۆڵەتی خوێندنی پێ بدرێت لە خوێندنی باڵادا(ماجستێر و دوکتۆرا) یان لە خوێندنی پسپۆڕیدا لە مەیدانی پسپۆڕییەکەی خۆیدا، لەگەڵ ئەوەی مۆڵەتەکەی بە خزمەتی قەزایی بۆ سەرژمێر بکرێت و مووچەی تەواوی پێ بدرێت، لەگەڵ پێدانی پێشخستن گەر یەکێك لەو قۆناغانەی بە سەرکەوتوویی بڕی.
٣. بەرزکردنەوەی بۆ پلەی باڵاتر گەر مەرجەکانی ئەو بەرزبوونەوەی تێدا بوو و دیاری نەکردنی ساڵی تایبەت بۆ خانەنشین کردنی، چونکە قازی تا زیاتر سەرقاڵی کاری قەزا بێت شارەزایی زۆرتر بەدەست دەهێنێت، شارەزایش لە گرنگترین سیفەتەکانە کە بەخێر بەسەر تاك و کۆمەڵگەدا دەشکێتەوە.

من وادەبینم ئەم پێشنیارە گەر قبووڵکرا و کاری پێکرا مامۆستایانی زانکۆش بگرێتەوە بە هەمان هۆوە.

٤. تایبەتکردنی کۆمەڵگەیەکی پێشکەوتوو کە تایبەت بێت بە قازییەکان تاکو تێکەڵبوونیان لەگەڵ خەڵکانی تر کەمبکرێتەوە، ئەمەش بە مەبەستی پارێزگاری لە کەسایەتی و شوێن و پلە و پایە و دوورخستنەوەیان لە کاریگەربوون بە نێوانکاری، لەوێوە رێگری لێیان بۆ لایەنگیری لەسەر حسابی دادپەروەری و یەکسانی.
٥. فەراهەم بوونی ئامێری هاوچەرخ و نوێ بۆ قازی لە دادگادا و لە ماڵەکەیدا، بۆ ئەوەی بە هەمیشەیی پەیوەندی بە جیهانی دەرەوە هەبێت و بەئاگابێت لەسەر رێکارە قەزاییەکانی دەرەوە و هاوچەرخ و هۆکارە پێشکەوتووەکانی ئەنجامدانی تاوان.
٦. بە پۆشاکی تایبەت جیابکرێتەوە کە جیاواز بێت لەوەی خەڵکی بە گشتی دەیپۆشێت تاکو پارێزگاری لە حورمەت و کەسایەتییان بکرێت.

باشترە بۆ قازی دوو جۆر لە پۆشاکی تایبەتی هەبێت، جۆرێك بەکاردەهێنێت لە کاتی بوونی لە دادگادا و جۆرێکی تر بۆ بۆنەکان لە دەرەوەی دادگا.

# بەشی سێیەم

# ڕێگەکانی هەڵهێنجان و چۆناندن

لێکۆڵینەوەی ناونیشانی ناونیشانی ئەم بەشە بەسەر دوو باسدا دابەش دەبێت، یەکەمیان ڕێگەکانی هەڵهێنجانی حوکم لەخۆ دەگرێت، دووەمیان چۆناندنی هەڵسوکە ئەم بەشە بەسەر دوو باسدا دابەش دەبێت، یەکەمیان ڕێگەکانی هەڵهێنجانی حوکم لەخۆ دەگرێت، دووەمیان چۆناندنی هەڵسوکەوتە یاساییەکان و ڕووداوە یاساییەکان کە قازی بابەت تەماشای دەکات.

# باسی یەکەم:
# ڕێگەکانی هەڵهێنجانی حوکمی قەزایی لە دەقەکان

لەپێناو دەستەبەربوونی دادپەروەریدا و پێداگرتن لەسەر یەکسانی لە نێوان تاك و کۆمەڵگەدا زانستە ئەقڵی و زمانەوانییەکان لە "ئوسوڵی فیقە و مەنتق و فەلسەفە و زمان" پانتاییەکی بەرینیان بە قازی داوە بۆ هەڵهێنجانی حوکم لەو پرسانەدا کە تەماشایان دەکات و لێیان رادەمێنێ، جا پرسەکان سزایی بن یان مەدەنی، ئەمەش لەسەر بنچینەی هۆی بە ئامانجگیراو بۆ دەقەکان و نەرمی و جیڕی وشە و گوزارەکان.

دەتوانین هەڵگۆزینی حوکمەکان لە چاوگەکانیان بۆ شەش جۆگە بگێڕینەوە:

## جۆگەی یەکەم: گۆکراوی ئاشکرا:

ئەمەش ئەوەیە کە وشە و گوزارەکانی ئاماژە دەکەن بە ئامانجەیەکی پڕاوپڕی یان ئامانجەیەکی لەئامێزگرانە، وەك لە مادەی (٤٠٥)ی یاسای سزای عێراقی ڕاوەستاو[1] هاتووە: (هەر کەس بەئەنقەست کەسێك بکوژێت بە بەندکردنی هەتاهەتایی یان بەندکردنی کاتی سزا دەدرێت) ئەم مادەیە بە وشە و گوزارەکانی ئامانجە بە "گۆکراوێکی ڕاشکاو" دەکات، ئەوەش ئەوەیە کە سزای کوشتنی ئەنقەستی دەستدرێژی کردنی سادە، ولتە نزیك نەبووەوە نە لە ڕەوشێکی توند و نە لە ڕەوشێکی سووك بریتییە لە بەندکردنی هەتاهەتایی یان کاتی، قازی یەکێك لەو دوو سزایە هەڵدەبژێرێت بەپێی ئەوەی کە دەیبینێت و لەبەر ڕۆشنایی چاودێری بەرژەوەندی گشتی و بەرژەوەندی کەسی تۆمەتبار، ئامانجەی ئەم دەقە بۆ هەردوو سزاکە

---

[1] رقم ١١١ لسنة ١٩٦٩

پڕاوپڕییە، بەڵام ئاماژەکەی لەسەر هەر یەکێك لەو دوانە لە ئامێزی هەمووا(گشتدا) لەئامێزگرانەیە.

هەروەها وەك لە مادەی (٧٢٩) لە یاسای مەدەنی عێراقی[1] راوەستاو کە بە گۆکردنی راشکاو دەقەکەی هاتووە: (دیاریکردن(هەڵبژاردن)ی مەرج بە میرات ناگیرێت، کە هەواڵدەر(خاوەن مەرج) مرد مەرجەکەی کۆتایی پێ دێت)

حوکمی گۆکراو پێی بە ئاشکرا لەم مادەدا بریتییە لە "دیاریکردن و هەڵبژاردنی مەرج" لە گرێبەستی بەکرێدانا ناگوێزرێتەوە بۆ میراتگر جا دیاریکردنەکە بۆ کرێگرتە بێت یان بۆ بەکرێدەر یان بۆ هەردووکیان.

## جۆگەی دووەم: خواستی دەق:

پوختەکەی ئەوەیە ئەو دەقەی دەویسترێت جێبەجێ بکرێت لە بابەتێکدا و ناتەواوی تێدا هەبێت، یاسادانەر وازی لێهێناوە جا یان بە هەڵە یان بە ئەزانی یان بەهۆی رۆشن بوونییەوە کە بەئاسانی دەتوانرێت پەی پێببرێت لە لایەن قازییەوە.

لە هەموو بارێکدا پێویستە لەسەر قازی بابەت کە دەیەوێت دادپەروەری دەستەبەر بکات هەستێت بە تەواوکردنی ئەو ناتەواوییە و هەمووی بداتە دەم یەك بۆ تەواوکردنی، شایانی باسکردنە دیاردەی ناتەواوی وەك چۆن لە دەقە یاساییەکاندا روودەدات لە رێسا یاساییەکانیشدا روودەدا، لە پیادە کردنەکانی ئەم جۆگەی دووەمە ئەمانەی لای خوارەوەیە:

أ. مادەی (٢) لە یاسای مەدەنی عێراقی، راوەستاو: (یاساو بۆ ئیجتیهاد نییە لە کاتی بوونی دەقدا) واتە لە بوونی دەقێکدا کە ئاماژەکەی بڕاوەیە، هەروەها لە نموونەی ئەوە مادەی(١٦٩) لە یاسای ئوسوڵی دادگاییە سزاییەکانە[2]، کە بە ئاماژەیەکی بڕاوە ئاماژە دەکات: (پێویستە شایەتی دابمەزرێت لەسەر رووداوەکان کە شاهید دەتوانێت بە یەکێك لە هەستەکانی پەی پێ ببات) چونکە شایەتی واتە(شهادة) لە "مشاهدة"وە وەرگیراوە بە مانای زانستە نەك بە مانای بینین.

---

[1] رقم ٤٠ لسنة ١٩٥١

[2] رقم ٢٣ لسنة ١٩٧١

بەڵام گەر دەقەکە گومانئامێز بوو، بەوەی زیاتر لە مانەیەك یان لە حوکمێك لەئامێز بگرێت، ئەوا پێویستە لەسەر قازی ئیجتیهاد بکات تا مانایەك هەڵبژێرێت گونجاو بێت لەگەڵ دادپەروەریدا، بۆ نموونە خودا-سبحانە- لە قورئاندا دەفەرموێت: ﴿إِنْ امْرُؤٌ هَلَكَ لَيْسَ لَهُ وَلَدٌ وَلَهُ أُخْتٌ فَلَهَا نِصْفُ مَا تَرَكَ﴾[1].

وشەی"ولد-کوڕ" لە زمانی عەرەبیدا مانای کوڕ و کچ لەئامێز دەگرێت، لە عورفی عەرەبدا تایبەت کراوە بە نێر، ئاماژەی ئایەتەکە لەسەر یەکێك لەو دوو مانایە جیا لەویتریان گومانئامێزە بەهۆی ئەو ئەگەرەوە کە دەگونجێ مەبەست پێی ماناکەی تریان بێت.

بۆیە فەقیهەکان بۆ دیاریکردنی مانای بەمەرلمگیرلو لەم ئایەتەدا ئیجتیهادیان کردووە، فەقیهەکانی ئەهلی سوننەت وا بۆی دەچن مەبەست لە وشەی "ولد" ئەو مانا عورفییەیە کە بریتییە لە "نێر"، لە کاتێکدا فەقیهەکانی ئەهلی شیعەی ئیمامی پێیان وایە مەبەست لە وشەکە مانا زمانەوانییەکەیە کە نێر و مێش لەخۆ دەگرێت.

لەسەر ئەم جیاوازییە ئەوە خراوەتە روو کە: هەر کەسێك مرد و کچێك و خوشکێکی بەجێهێڵا ئەوا خوشکەکە میراتی بەرناکەوێت لە لای شیعەی ئیمامی، لە کاتێکدا لای فەقیهەکانی ئەهلی سوننە خوشکەکە میراتی بەردەکەوێت.

ب. مادەی (٩٥) لە یاسای چاودێری ناکامانی عێراقی راوەستاو[2] کە دەقەکەی بریتییە لە:

(رۆژی دەرچوونی حوکم بە مردنی کەسی بزربوو بە رۆژ و بەرواری مردنی دادەنرێت)

بۆیە دادپەروەری داوای ئەوە دەکات لە کاتی پیادە کردندا قازی هەڵبستێ بە خستنە سەری ئەم رستەیە بۆ سەر مادەکە: (گەر حوکمەکە نەدرابێتە پاڵ بەروارێکی پێشتر) ئەگەر نە، ئەو بەروارەی پێشووتر وەردەگیرێت بۆ دیاری کردنی رۆژی مردنی کەسەکە.

ج. هەروەها وەك مادە(٨٧٥) لە پرۆژەی یاسای مەدەنی عێراقی کە تاکو ئێستا رۆشنایی نەبینیوە(بۆ کەسی وەکیلگر لە هەر کاتێکدا بیەوێت دەتوانێ وەکیلەکەی لەکار بخات یان وەکالەتەکەی سنووردار بکات، وەکیلیش بۆی هەیە لە وەکالەت خۆی کەنار بدات)

[1] سورة النساء / ١٧٦

[2] رقم ٧٨ لسنة ١٩٨٠ المعدل

ئەم مادەیە داوا دەکات ئەم گوزارەشی بخرێتە پاڵ: (گەر مافی کەسانی تری پێوە پەیوەست نەبێت)

بەلأم گەر مافی کەسانی تری پێوە پەیوەست بوو وەك پەیوەستبوونی مافی قەرزدەری بارمتە وەرگر لە فرۆشتنی بارمتەکەدا کاتێك قەرزدەر نەیتوانی قەرزەکەی خۆی وەربگرێتەوە و وەکیلیش بۆ قەرزداری بارمتەدەر هەبوو و خۆی لە دەرەوەی عێراق بوو، ئەوا لەو بارەدا ناتوانێت وەکیلەکە کەنارگیر بکات بەهۆی پەیوەستبوونی مافی قەرزکەری بارمتەدەر بە شتە بە بارمتەگیراوەکەوە.

د. ڕێسایەك: (لێبەجێماو تەنها دوای دانەوەی قەرز بوونی هەیە)[1] چونکە لێبەجێماوی ژێرباری قەرز وەك بارمتە وایە بۆ دەستەبەرکردنی قەرزی خاوەن قەرز، کەسی مردوو دوای تیاچوونی ئەستۆگری بە مردن قەرزەکەی پەیوەست دەبێت بە لێبەجێماوەکەیەوە، لەگەڵ ئەوەش لێبەجێماوەکەی دەگوێزرێتەوە بۆ میراتگرانی[2]

ه. ڕێسایەك: (گونجاوی شەرعی نەرێی دەستەبەرکردن دەکات)[3]، ئەم ڕێسایە داوای ئەوە دەکات وشەی "بنەڕەتی" بخرێتە سەر، واتە گونجاوی شەرعی بنەڕەتی نەرێی دەستەبەرکردن دەکات، بۆ نموونە، هەر کەس بیرێك لێ بدات لە باخچەکەیدا یان لە بێستانەکەیدا و شتێکی تێکەوت کەوت و تیاچوو خاوەن بیرەکە نابێت بە دەستەبەرکەر، چونکە هەڵکەندن کارێکی موباحە، بۆیە لەسەر موباح دەستەبەرکردن سەرهەڵنادات.

و. ڕێسایەك: (گونجاوی شەرعی نەرێی دەستەبەرکردن ناکات) واتە گونجاوی هەلأوەردە(الاستپنائي) پێویستە ئەم سنووردارکردنەی "هەلأوەردە" بخرێتە سەر ئەم ڕێسایە، هەر کەس ماڵی کەسانی تر بخوات بەبێ مۆڵەتی ئەو لەژێر فشاری برسێتیدا کە ژیانی یان سەلامەتی دەخستە بەر مەترسی بەرپرسیارێتی سزایی لێ ناپرسرێت و سزا

---

[1] لو بعد اذن الدائن

[2] شێخ مەعروفی نودێی کوردی لە کتێبی (قطر العارض)دا دەڵێت: ئایین ڕێگری ناکات میراتگرانی مردوو ببن بە خاوەنی ئەوەی بەجێیانهێلأوە، بەلأم پێیەوە پەیوەست بووە وەك بە رەهنگیراو، چونکە باشترە بۆ مردووەکە. تاوتوێکردن لە بەجێماوەکەدا لەلایەن میراتگرانەوە بۆ مۆڵەتی قەرزدارەکە ناگەڕێتەوە.

[3] المادة (٩١ من مجلة الاحكام العدلية)

نادرێت، بەڵام وەك دەستەبەرکەر بۆ ئەوەی بەبێ مۆڵەت خوازبوویەتی دەمێنێتەوە، گەر خاوەنەکەی داوای بارپووکردنەوەی لێ کرد پێویستە بۆی بگێڕێتەوە بەهۆی ئەو ڕێسایەی کە دەڵێت: (ناچاری مافی کەسانی تر بەتاڵ ناکاتەوە)[1]، واتە مافی کەسانی تر بە داواکردنی بارپووکردنەوە.

بەڵام ڕێسای: (ناچاری و پێویستی قەدەغەکراوەکان موباح دەکەن) بریتییە لە هەڵەیەکی باوی لێخۆش نەبوو، چونکە پێویستی و ناچاری ماڵ و سامانی خەڵکی موباح ناکات، بەڵکو تەنها گونجاوی دەکات، بۆیە دەبێت ڕێساکە دەستکاری بکرێت بەم جۆرە: (ناچاری و پێویستییەکان قەدەغەکراوەکان گونجاو دەکات، چونکە موباح بەرهەڵستی بەرپرسیارێتی مەدەنی دەکات وەك بەرپرسیارێتی سزایی.

## جۆرەی سێیەم: ئاماژەی دەق

ناوانخنی ئاماژەی دەق ئەوەیە کە بە ئامازەی پابەندبوون ئامازە بکات لەسەر حوکمێکی ئاماژەبۆکراو تیایدا لە مادەی (١/٣٧٨) لە یاسای سزاکانی عێراقی ڕاوەستاو کە بە گۆکردنێکی ڕاشکاو لەسەر ئەوەی کە: (گونجاو نییە جوڵاندنی داوای زینا دژ بە یەکێك لە دوو هاوسەرەکە یان گرتنەبەری هەر جۆرە ڕێکارێك تیایدا، مەگەر بینا لەسەر سکاڵای هاوسەرەکەی تر بێت) مادەی (١/٣) لە یاسای ئوسوڵی دادگاییکردنی سزایی عێراقی ڕاوەستاو پڕاوپڕیەتی.

بە گۆکردنێکی ناڕاشکاوانە ئاماژە دەکاتە سەر ئەوەی کە زینای یەکێك لە دوو هاوسەرەکە دەستدرێژی کردنە بۆ سەر مافی تایبەتی هاوسەرەکەی تر، بۆیە بۆی هەیە لە مافی خۆی دابەزێت تەنانەت دوای دەرچوونی بڕیار.

ئەمەش پێچەوانەی شەریعەتی ئیسلامە کە زینا بە ڕەهایی بە تاوان دادەنێت یەکسانە کارەکە لەلایەن کەسانی هاوسەرداروە بێت یان لە کەسانێکی ترەوە جگە لەو دوانە، خودا– سبحانە وتعالی– دەفەرموێت: ﴿وَلاَ تَقْرَبُوا الزِّنَى إِنَّهُ كَانَ فَاحِشَةً وَسَاءَ سَبِيلاً﴾[2]، هەموو مرۆڤێکی بالغی ئاقڵ بۆی هەیە داوا بجوڵێنێت دژ بە زیناکەری ژن و پیاو جا هاوسەرگرتوو بن

---

[1] المادة (٣٣ المجلة)

[2] سورة الاسراء / ٣٢

یان هاوسەرنەگرتوو، چونكە كارەكەی لە دەروازەی فەرمان بە چاكە و رێگری لە خراپەیە[١]، لەگەڵ ئەوەش پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی كردووە بە داپۆشین لە تاوانە رەوشتییەكاندا، بۆیە دەفەرموێت: (هەر كەس براكەی داپۆشێت خودا لە رۆژی دواییدا دایدەپۆشێت) "برا" –لە فەرموودەكەدا– "خوشك"یش دەگرێتەوە، پاشان قورئان سێ سزای راگەیاندوە بۆ هەر كەسێك تۆمەت دەداتە پاڵ كەسێك، خودا–سبحانه وتعالی– دەفەرموێت: ﴿وَالَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ[٢] ثُمَّ لَمْ يَأْتُوا بِأَرْبَعَةِ شُهَدَاءَ فَاجْلِدُوهُمْ ثَمَانِينَ جَلْدَةً وَلَا تَقْبَلُوا لَهُمْ شَهَادَةً أَبَدًا وَأُولَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ، إِلَّا الَّذِينَ تَابُوا مِنْ بَعْدِ ذَلِكَ وَأَصْلَحُوا فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ﴾[٣].

فەلسەفەی ئەو سێ سزایە بریتییە لە برینی زمان لە فرەوێژی بۆ دەم خستنە ناو ناموسی خەڵكی[٤].

## جۆگەلەی چوارەم: ئاماژەی ئاشكرای دەق:

واتە ئاماژەی دەق بە گۆكردنێكی ئاشكاوانە لەسەر ئەوەی كە حوكمی هاتوو تیایدا بەهۆیەكەوە بەستراوەتەوە كە لەگەڵی دەسوڕێتەوە بە بوون و بە نەبوون، گەر بەدیهات ئەوا لەسەر قازی پێویستە حوكم بە گۆكراو بكات، گەر بەدینەهات حوكمی پێ ناكات، لە جێبەجێ كردنەكانی بریتییە لە مادەی (٢٨٧) لە یاسای ئوسولی دادگای سزای عێراقی راوەستاو، كە ئەمە دەقەكەیەتی: (گەر بینرا حوكم بەسەردالكراو بە لە سێدارەدان سكپڕە لەكاتی هاتنی

[١] چونكە دەستدرێژی كردنە بۆ سەر مافی كۆمەڵ واتە دەستدرێژی بۆ سەر بەها و ئەخلاق بە شێوەیەكی گشتی.

[٢] واتە ئافرەتی مێردكردووی خاوەن حەیا و حورمەت و شەریف

[٣] سورة النور / ٤

[٤] سزای جەڵدكردن سزایەكی هاوبەشە لە نێوان مافی گشتی و مافی تایبەتدا(واتە مافی تۆمەت بۆهەڵبەستراو) بۆیە ئاسەوار بۆ تەوبەكردن نییە لە نەمانیدا، بە پێچەوانەی سزای دووەمەوە(قبووڵ نەكردنی شایەتی) و سێیەم(لێدانی مۆری فاسقبوون) ئەو دوانە بە تەوبەكردن و چاكسازی نامێنن، بە پێچەوانەی حەنەفییەكانەوە كە پێیان وایە هەڵواردەكە تەنها سزای سێیەم دەگرێتەوە بینا لەسەر رێسای(سنووردار كردن گەر لە نێوان نزیك و دووردا دەسوڕایەوە بۆ لای نزیك پارسەنگ دەدرێت گەر هاوبەڵگە(نیمچە بەڵگە)یەك پێچەوانەی ئەوە ئاماژەی نەدەكرد) هەروەها لەبەر ئەوەی هەڵواردەكردنەكە بۆ پێویستییە، پێویستیش بە ئەندازەی خۆی ئەندازەگیری بۆ دەكرێت بۆ نەهێڵانی ئەو پێویستییە گەڕانەوەی سنووردار كردنەكە بۆ لای سزای سێیەمە(لێدانی مۆری فاسقبوون)

فەرمان بە جێبەجێ کردن، پێویستە لەسەر ئیدارەی بەندیخانە سەرۆکی دەستەی داوەری گشتی ئاگادار بکاتەوە تاکو پێداچوونەوەی خۆی بە وەزیری داد پێشکەش بکات بە داواخستنی جێبەجێ کردنی حوکم یان سووککردنی، وەزیری دادیش هەڵبستێت بە بەرزکردنەوەی ئەو پێداچوونەوەیە بۆ سەرۆك کۆمار، گەر کارە دیاریکراوەکە دوای ئەوەی دەکرد سزای لە سێدارەدانەکە جێبەجێ بکرێت، ئەوا جێبەجێ ناکرێت تا تێپەڕبوونی چوار مانگ لە مێژووی دانانی سکەکەی، یەکسانە بەر لە هاتنی ئەو فەرمانە سکەکەی دابنێت یان دوای ئەو فەرمانە) ئەم دەقە ئاماژەیەکی ناڕۆشنی تێدایە بە گۆکردنێکی ناڕاشکاوانە لەسەر ئەوەی کە دواخستنی حوکم بریتییە لە پارێزگاری لە ژیانی منداڵەکە، گەر بە ڕێگەی زانستی نوێ زانرا سکپڕبوون بوونی نییە یان کۆرپەکە لە سکی دایکیدا مردووە، ئەوا جێبەجێ کردنی حوکمەکە دواناخرێت، هەر بەو جۆرە گەر منداڵەکە دوای لەدایکبوون و پێش کۆتاهاتنی چوار مانگەکە بمرێت .

## جۆگەی پێنجەم: تێگەیشتنی تەبا لەگەڵ دەقدا:

بەوەی حوکمی لێ بێدەنگ بوو تەبا بێت لەگەڵ حوکمی پێ گۆکراو بەهۆی یەکگرتنی هەردوو حوکمەکە لە "هۆ"دا، لە پیادە کردنەکانی ئەم شێوازە:

أ. مادەی (٢٣٧) لە یاسای سزاکانی میسر کە بە گۆکردنێکی ڕاشکاوانە ئاماژە دەکەن لەسەر ئەوەی کە: (هەر کەس لەناکاو کەوت بەسەر ژنەکەیدا لە کاتی ئەنجامدانی زینادا و لەو حاڵەدا پیاوەکە ژنەکەی و ئەوەی زینای لەگەڵ دەکات کوشت، ئەوا بە بەندکردن سزا دەدرێت) بە تێگەیشتنی دڵنیادانان ئاماژە دەکات گەر هەردووکیانی تووش کرد بە نەخۆشییەکی بەردەوامی پەکخەر یان بە لێدان هەتا مردن ئەوا سزادانی بە بەندکردن لەپێشترە بەهۆی بەشداربوونی گو پێکراو و لێ بێدەنگ بوو لە هۆی سووککردنی حوکم وڵە بەندکردن، ئەوەش بریتییە لەو ڕەوش و دیمەنە ناشیرینەی کە پیاوەکە کەوتووە بەسەریدا و کاری کردۆتە سەر دەمار و ویستی. یاسادانەری عێراقی کارێکی باشی کردووە لە کۆکردنەوەی ئەو دوو حاڵەتەدا لەناو گۆکراوێکی ڕۆشندا، مادەی (٤٠٩) لە یاسای سزاکان داوەستاو کە: (بە بەندکردن سزا دەدرێت بە مەرجێك لە سێ ساڵ زیاتر نەبێت هەر کەس لەناکاو ژنەکەی خۆی بینی یان یەکێك لە مەحرەمەکانی خۆی بینی لە حاڵی ئەنجامدانی زینادا یان لەناو یەك جێگەدا لەگەڵ هاوبەشەکەیدا بینی و یەکسەر

هەربووکیانی کوشت یان یەکێکیانی کوشت یان دەستدرێژی کردە سەریان یان دەستدرێژی کردە سەر یەکێکیان بە دەستدرێژی کردنێك سەرکێشێت بۆ مردن یان سەرکێشێت بۆ نەخۆشییەکی هەمیشەیی).

ب. قورئان بە گۆکردنی ڕاشکاوانە و ڕۆشن ئۆفکردنی منداڵ لە دایك و باوکی حەرام کردووە، بەو ئایەتە پیرۆزە: ﴿فَلاَ تَقُلْ لَهُمَا أُفٍّ وَلاَ تَنْهَرْهُمَا وَقُلْ لَهُمَا قَوْلاً كَرِيمًا﴾[1] بە تێگەیشتنی تەبا لێدان و هاوشێوەکانی –لە دەروازەی لەپێشتر– حەرام کردووە، دەتوانرێت بوترێت قورئان وشەی "ئۆف"ی ناویردووە مەبەست پێی هەموو جۆرە ئازارێکە ئەوە لە دەروازەی ناوهێنانی تایبەتە بۆ مەبەستی گشت.

ج. قورئان بە گۆکردنی ئاشکرا و راشکاوانە گەنجینەکردنی ئاڵتوون و زیو و بەرهەم نەهێنانیان لە پەرەپێدانی ئابووری و کۆمەلآیەتیدا و خەرج نەکردنیان لە بەرژەوەندی تایبەت و گشتیدا حەرام کردووە، بە ئایەتی: ﴿وَالَّذِينَ يَكْنِزُونَ الذَّهَبَ وَالْفِضَّةَ وَلاَ يُنفِقُونَهَا فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَبَشِّرْهُمْ بِعَذَابٍ أَلِيمٍ﴾.[2] بە گۆکردنی ئاشکرا گەنجینەکردنی زێڕ و زیوی حەرام کردووە بە تێگەیشتنی تەبا هەموو پارەیەکی کانزایی و کاغەزی حەرام کردووە کە لە جێگەی ئاڵتوون و زیو دادەنیشن لە مامەڵە و ئاڵوگۆڕی نێوان خەڵکیدا.

## جۆگەی شەشەم: تێگەیشتنی پێچەوانە

حوکمی پەیپێبراوی پێچەوانە پێچەوانە دەبێت لەگەڵ حوکمی گۆکراوی ڕۆشن و ڕاشکاو، ئەمەش هەرکات سنووردانان(بەستنەوە)ی هاتوو لە دەقە گوزارشت لێکراوەکە لەناو حوکمی گۆپێکراوی ڕاشکاودا دوابکەوێت، چونکە ئەو بەستنەوەیە وەك مەرجێك وایە بۆ پیادە کردنی، بەمەرجگیراو کۆتایی پێ دێت بە کۆتاهاتنی مەرجەکەی، لە پیادە کردنەکانی ئەم حاڵەتە:

أ. مادەی (٣٩) لە یاسای سزاکانی عێراقی ڕاوەستاو بە گۆگردنی ئاشکرا هاتووە کە: (تاوان نییە گەر ڕوداوێك ڕوویدات لە کاتی هەستان بە ئەرکێك یاسا سەپاندبێتی) بۆیە سنووردارکردنی "هەستان بە ئەرکێك یاسا سەپاندبێتی" کردارەکەی لە سیفەتی تاوان

[1] سورة الاسراء / ٢٣
[2] سورة التوبة / ٣٤

دلڕنی و گۆڕی بۆ کارێکی موباح گەر هەستان بە کاری تاوانەکە جێبەجێ کردنی ئەرکێك بێت یاسا سەپاندبێتی.

تێگەیشتنی پێچەوانەکەی کردار ناگۆڕێت بۆ موباح بەڵکو پارێزگاری لە سیفەتی تاوانی خۆی دەکات گەر هەستان نەبێت بە ئەرکێك یاسا سەپاندبێتی و هیچ هۆیەکی تر لە هۆکانی موباح کردن لە ئارادا نەبێت.

مەرجە بۆ جێبەجێ کردنی گۆکراوی راشکاو و رۆشنی ئەم مادەیە ئەم مەرجانە بوونیان هەبێت:

١. پێویستە ئەو کارە لە کەسێکەوە دەرچووبێت کە سیفەتی فەرمانبەری گشتی یان داوالێکراوی هەبێت لە خزمەتێکی گشتیدا.
٢. فەرمانەکە جێبەجێ کردنی ئەوە بێت یاسا فەرمانی پێکردووە.
٣. کەسی جێبەجێکار خاوەنی دەسەڵاتی خەمڵاندن بێت.
٤. هۆیەك بوونی هەبێت ببێتە پاساو بۆ بەکارهێنانی دەسەڵاتی خەمڵاندن.
٥. کارەکە تەبا و پڕاوپڕ بێت لەگەڵ یاسا لە رووی شێوە و بابەتەوە.
٦. فەرمانبەر لە کارەکەیدا مەبەستی دەستەبەرکردنی ئامانجێك بێت یاسای لێ وەردەگیرێ بۆ سەرپشکی دەسەڵات.

گەر یەکێك لەم مەرجانە دواکەوت ئەوا پێویستە لەسەر قازی ئەو کارە بە موباح نەزانێت، بەڵکو پارێزگاری لە سیفەتی تاوانی خۆی دەکات کە بریتییە لە تێگەیشتنی پێچەوانە لە دەقە ئاماژە بۆکراوەکە.

ب. هەروەها لە جێبەجێ کردنەکانی جۆگەی شەشەم مادەی (١/١٢٩)ە لە یاسای مەدەنی عێراقی راوەستاو، کە ئەمە دەقەکەیەتی: (دەگونجێ شوێن و جێی(خودی شتەکە) پابەندبوون بوونی نەبێت(نادیار بێت) لە کاتی گرێبەستی نێوان دوو لایەندا، گەر ئەگەری بەدەستهێنانی هەبوو لە داهاتوودا و بە دیاریکردنێکی نەرێکەر بۆ نەزانی و فریودان دیاریکرا.

گۆکردنی راشکاو و ئاشکرا بۆ ئەم برگەیە بریتییە لە: (گونجاویی فرۆشتنی نادیار) گەر دوو کۆت و بەندی تێدا ئامادە بوو، ئەگەر یەکێکیان یان هەردووکیانی لێ دواکەوت لەسەر قازی

پێویستە تێگەیشتنی پێچەوانە جێبەجێ بکات بۆ گۆکراوەکە، ئەوەش: (نادروستیی فرۆشتنی نادیار)ە لەوێشەوە بەتاڵبوونەوەی گرێبەستەکە.

تێبینی ئەوە دەکرێت کە یاسادانەری عێراقی تێکەڵییەکی لا دروست بووە لە نێوان شوێن و جێی گرێبەست و شوێن و جێی پابەندبووندا، بۆیە دروستە بوترێت: (گەر شوێن و جێی(خودی شتەکە) گرێبەست نادیاربوو لە کاتی گرێبەستدا، چونکە شوێن و جێی پابەندبوون هەمیشە کارێکە لە کارەکانی مرۆڤ و ئەوە بریتییە لە بابەتی پابەندبوون نەك شوێن و جێی بابەت بوون، هەروەها لە هەڵەکانی یاسای مەدەنی عێراقی ئەوەیە کە لە برگەی یەکەمی مادەی یەکەمدا هاتووە، دەقەکەی ئەمەیە: (١-دەقە یاساییەکان بەسەر هەموو پرسەکاندا تێدەپەڕێن کە ئەو دەقانە لە گوزارەیاندا یان لە ناوەڕۆکیاندا دەیگرنە خۆ)).

ئەم مادەیە تەنها دوو کەناڵ دەدات بە قازی بۆ هەڵگوزینی حوکمەکان، چونکە دەربڕینی(لە گوزارەیاندا) تەنها گۆکراوی راشکاو و رۆشن لەخۆ دەگرێت، هەروەها دەبڕینی(لە ناوەڕۆکیاندا) تەنها تێگەیشتنی تەبابوون لەخۆ دەگرێت، یاسادانەر کەوتۆتە ناو هەمان هەڵەوە لە برگەی یەکەم لە مادەی یەکەم لە یاسای باری کەسێتی عێراقی گوێڕاوی رلوەستاو.

هەر بەو جۆرە کەوتۆتە ناو هەمان هەڵەوە لە برگەی یەکی مادەی یەك لە هەردوو یاسای سزا میسریەکانی رلوەستاو[1] و یاسای مەدەنی میسری رلوەستاو[2]، هەڵەی یاسادانەری عێراقی بەهۆی چاولێکەری پرۆژە یاسای میسرییەوە بووە، لەپاڵ ئەوەی کە سەرۆکی لیژنەی دانانی پرۆژە یاسای ئێستای مەدەنی عێراقی خوالێخۆشبوو "سەنهوری" بووە.

---

(١) رقم ٥٨ لسنة ١٩٣٧

(٢) رقم ١٣١ لسنة ١٩٤٨

# باسی دووەم:
# چۆناندنی تاوتوێکردنەکان و رووداوەکان

چۆناندنی تاوتوێکردنە یاساییەکان و رووداوە یاساییەکان لە پێشەکی دژوارییە یاسایی و رێکارە یاساییەکانە کە قازی رووبەرووی دەبێتەوە، هەروەها لەو پێویستییانەن کە ناتوانرێت پشتگوێ بخرێن بەهۆی وەستانی بیرۆکەی دادپەروەری و یەکسانییەوە لەسەر ئەو چۆناندنە لە لایەکەوە و لەلایەکی ترەوە قازی ناتوانێت دەقەکە -کە جێبەجێ کردنی پێویستە- لە پرسەکەدا دیاری بکات کاتێك لێی ورد دەبێتەوە، گەر پێشتر سیفەتی یاسایی بۆ بابەتەکە دیاری نەکات، یەکسانە تاوتوێ کردنی یاسایی بێت یان رووداوی یاسایی.

تا ئێستا لە یاساکان و لێکدانەوەکانیاندا چاوم بە پێوەرێکی بابەتییانە نەکەوتووە بۆ جیاکاری نێوان "تاوتوێکردن" و "رووداو"، بەڵکو کۆمەڵێك پێناسە و پێوەر بۆ جیاکاری دەبینینەوە کە لە لۆژیکی یاساوە رەفزکراون.

پێناسەی ناسراوی بەناوبانگ بۆ "تاوتوێکردنی یاسایی" بریتییە لە: (رووتێکردنی ویست بەرەو سەرپێهەڵدانی کاریگەریی کە یاسا گرنگی پێبدات(لای بەلایدا بکاتەوە)).

ئەم پێناسەیە نادروست و نا لۆژیکییە لەبەر ئەم روونەی لای خوارەوە:

أ. "رووتێکردنی ویست" واتە پەیوەستبوونی ویست، رەفتارەکە بریتییە لە پەیوەستکەر، جیاوازی نێوان "پەیوەست" و "پەیوەستکەر" رۆشنە وەك رۆشنی خۆر لە نیوەڕۆدا.

ب. رەفتارکردن بە رەهایی لە بەدیهێنانەکانی توانای مرۆڤە، نەك ویستی مرۆڤ چونکە هەموو کارێکی خوازەکی کە مرۆڤ لێی دەچێتە پێش یەکەمجار پەی پێبردنی پێوە پەیوەست دەبێت پاشان ویست و دواجاریش توانین، واتە توانین شوێنی ویست دەکەوێت، ویستیش شوێنی پەیبردن دەکەوێت، بۆیە کارەکانی مرۆڤ کە لێی دەوەشێتەوە لە دروستکراوی توانینی مرۆڤە نەك لە ویستی مرۆڤەوە.

ج. ڕەفتارکردن–یاسایی بێت یان بەدەر لە یاسایی– قسە و کردار دەگرێتەوە، بۆیە کورتهەڵهێنانی لە قسەدا پێچەوانەیە بۆ زمان و عورفی عەرەب، هەر بەو جۆرە کورتهەڵهێنانی لە تاوتوێکردنی وتەکەیدا پێچەوانەیە لەگەڵ واقیع.

د. کورتکردنەوەی ڕەفتارە گوزارەییەکان لە گرێبەست و ویستی تاکەکەسیدا–سەرەڕای گشتگیر بوون و سەرلەپاگیربوونی– بۆ ئەو دولە و شتانی تریش لە لۆژیکی یاساییدا دیسان ڕەفزکراوە، بینا لەسەر ئەمە پێشنیار دەکەم: تاوتوێکردنی یاسایی و ڕووداوی یاسایی بەم جۆرە پێناسە بکرێت: (تاوتوێکردنی یاسایی: هەموو ئەوەی لە مرۆڤێکی جیاکەرەوەی ژێری ئازاد لە هەڵبژاردن دەوەشێتەوە شیاوبێت بەوەی یاسا کاریگەری(پاشینە) یاسایی لەسەر پێکبهێنێت).

بینا لەسەر ئەم پێناسەیە پێویستە لە هەر ڕووداوێکدا کە بە ڕەفتاری یاسایی سەرژمێر دەکرێت ئەم ڕەگەزانە بوونیان هەبێت:

١. ڕووداوەکە لە مرۆڤەوە سەرهەڵدابێت، هەر شتێك لە ئاژەڵان و سروشت بوەشێتەوە بریتییە لە هەڵکەوت.

٢. پێویستە لە مرۆڤێکی جیاکەرەوەوە پەیدا بووبێت، هەر شتێك لە منداڵێك بوەشێتەوە کە توانای جیاکردنەوەی نییە هەڵکەوتە.

٣. پێویستە لە مرۆڤێکی ژێر ڕوویدابێت هەر شتێك لە شێت بوەشێتەوە هەڵکەوتە.

٤. دەبێ لە مرۆڤێك کە توانای هەڵبژاردنی هەبێت ڕوویدابێت، بۆیە هەر شتێك لە مرۆڤێکی ناچار یان زۆرلێکراو بوەشێتەوە هەڵکەوتە.

٥. دەبێت کەسەکە هۆشیار بێت، بۆیە هەموو ئەوەی لە سەرخۆش و خەوتوو و بێهۆش و خەڵەفاو و هاوشێوەکانی ئەمانە دەوەشێتەوە هەڵکەوتە.

٦. دەبێت شتێك بێت لە شانوشکۆیدا هەبێت یاسا شوێنەواری یاسایی لەسەر پێکبهێنێت، کار و کردەوە ئاساییەکان کە لە مرۆڤ دەوەشێتەوە بە ویستی تاکەکەسی خۆی یان بە هاوکاری دوو ویست و زیاتر لە دوو ویست کاتی بەریەك کەوتنی خەڵکی هەندێکیان بە هەندێکی تریان و یاسا لەسەریان شوێنەواری یاسایی کە ناکەونە ژێر ڕەفتاری یاسایی و ڕووداوی یاساییەوە پێکناهێنێت.

## پیادەکردنەکانی چۆنانَدن:

چۆناندنی هەموو ئەوەی رەفتاری یاسایی و رووداوی یاسایی لە ئامێزی دەگرن بریتییە لە پێبەخشینی سیفەتێکی یاسایی بۆ هێنانە بۆ کەوتنە ژێر باری مادەیەکی دیاریکراو کە یاساڕێژی بۆ کراوە لە پێناو جێبەجێ کردنی بەسەر ئەو و هاوشێوەکانیدا.

بە دەربڕینێکی تر ملکەچکردنی بۆ ژێر بار کردنی بۆ دەقێکی یاسایی دیاریکراو، ئەم بابەتە بە خستنەرووی نموونە لە پرسە مەدەنی و سزاییەکاندا دەست بۆ دەبەین.

### یەکەم: لە جێبەجێکردنەکانی چۆنانَدن لە پرسە مەدەنییەکان بریتییە لە چۆنانَدنی گرێبەست

مادەی(٧٣) لە یاسای مەدەنی عێراقی رلوەستاو پێناسەی گرێبەستی کردووە، بەوەی: (گرێدانی ئەریّ بۆکردن(رازیبوون) دەرچوو لە یەکێك لە دوو کەسی گرێبەستکار بە قبوولّ کردنی ئەوی تریان لە روویەکەوە کاریگەرییەکەی لەسەر گرێبەست لەسەرکراو جێگیر ببێت).

تێبینی دەکرێت لەسەر ئەم پێناسەیە کە پێناسەیەکی ناتەواوە، ولپێویست بوو کۆتایی پێناسەکە بەم جۆرە بوایە: (لەسەر روویەك کە کاریگەرییەکەی لەسەر گرێبەست لەسەرکراو و گرێبەستکار جێگیر ببوایە) چونکە کاریگەری گرێبەست یان مافە کە لەناو گرێبەست لەسەرکراودایە یان پابەندبوونە کە لەسەر کەسی گرێبەستکارە، لە گرێبەستی فرۆشتندا -بۆ نموونە- کاریگەری هەیە لەناو گرێبەست لەسەرکراودا(فرۆشراو، نرخ) گواستنەوەی مولکییەتی فرۆشراو بۆ کەسی کڕیار و مولکییەتی نرخ بۆ کەسی فرۆشیار، پابەندبوونی دوو کەسە گرێبەستکارەکە بریتی دەبێت لە (رادەست کردن و پێدان) ، واتە(رادەستکردنی فرۆشراو و پێدانی نرخ).

دەتوانرێ چۆناندنی گرێبەست بۆ سێ بەش دابەش بکرێت:

<u>بەشی یەکەم:</u> دابەشکردنێکی سیانی لە رووی چۆناندن بۆ گرێبەستی دروست و پووچەلّ و قابیلی پووچەلکردنەوە، ئەوەش بریتییە لە دابەش کردنی فیقهی خۆرئاوایی، هەندێ لە یاسا مەدەنییەکانی دەولّەتانی عەرەبی پێی کاریگەر بوون، لەوانە مصر[1] و سوریا[1] و لوبنان[2] و کوێت[3].

[1] رقم ١٣١ لسنة ١٩٤٨

١. ئەو گرێبەستەی کە هەموو پایە و مەرجەکانی تێدا ئامادەیە و سەلامەتە لە ئەنگیەکانی ویست[٤] چۆناندنی بۆ دەکرێت بەوەی گرێبەستێکی دروستە و دەچێتە ژێر دەقە یاساییەکانەوە کە چارەسەری ڕەگەز و حوکمەکانی دەکات.

٢. ئەو گرێبەستەی کە پایەیەك لە پایەکانی یان مەرجێك لە مەرجەکانی دامەزراندنی لێ دوادەکەوێت یان شوێن و جێگەی یان هۆیەکەی ناتەواوە، چۆناندن دەکرێت بەوەی گرێبەستێکی پووچەڵە و دەکەوێتە ژێر ئەو دەقانەوە کە چارەسەری ئەو حوکمانەی لەسەری پەیدا دەبن لە ئەستۆ دەگرێت.

٣. ئەو گرێبەستەی کە پایە و مەرجەکانی تێدا ئامادەیە، بەڵام پایەی ڕازیبوونی ناتەواوە چۆناندنی بۆ دەکرێت بەوەی گرێبەستێکە دەتوانرێت پووچەڵ بکرێتەوە، واتە بۆ ئەو کەسەی توانای بەتاڵکردنەوە و سڕینەوەی بۆ بڕیاردراوە.

شایانی باسکردنە ئەوەی قابیلی پووچەڵ کردنەوەیە لە فیقهی خۆرئاواییدا هەردوو گرێبەستی ڕاگیراو و گرێبەستی جێبەجێکراوی ناپابەند دەگرێتەوە، هەروەها لە هەندێ لە یاسا مەدەنییەکانی کاریگەر بە فیقهی ئیسلامی وەك یاسای مەدەنی عێراقی[٥] و ئوردەنی[٦] و یەمەنی[٧].

بەشی دووەم: دابەشکردنی چواری لە رووی چۆناندنەوە، ئەوەش ئەوەیە کە جمهوری فەقیهانی شەریعەتی ئیسلامی کاریان پێکردووە، هەندێ لە یاساکان ئەوەیان وەرگرتووە لەوانە یاسای مەدەنی عێراقی[٨].

١. ئەو گرێبەستەی بە دروستی جێبەجێ دەکرێت، بەڵام کاریگەری لە مافەکان و ئەرکەکان لەسەر پەیدا نابێت مەگەر لەدوای مۆڵەتدانی لەو کەسەوە کە مافی مۆڵەتدانی هەیە، چۆناندنی

---

[١] رقم ٨٤ لسنة ١٩٤٩

[٢] الصادر في اذار ١٩٣٢

[٣] رقم ٦٧ لسنة ١٩٨٠

[٤] ئەوەش بریتییە لە زۆرلێکردن و فریودان و بەهەڵەدابردن و بەکارهێنان و ڕەنجخۆری.

[٥] رقم ٤٠ لسنة ١٩٥١.

[٦] رقم ٤٣ لسنة ١٩٧٦

[٧] رقم ١٩ لسنة ١٩٩٢.

[٨] رقم ٤٠ لسنة ١٩٥١

بۆ دەکرێت بەوەی گرێبەستێکی دروستی ڕاگیراوە وەك گرێبەستی کەسی خۆخزێن و و گرێبەستی ئەو کەسەی لێوەشاوەیی ناتەواوە[1].

٢. ئەو گرێبەستەی مەرجەکانی دامەزراندنی گرێبەستی تێدایە و ئەگەری هەڵوەشانەوەی هەیە لەلایەن دوو کەسی گرێبەستکارەوە وەك گرێبەستی خواستن و گرێبەستی وەکالەت، یان ئەگەری هەڵوەشانەوەی هەیە لە لایەن یەکێك لە دوو کەسی گرێبەستکارەوە بە ویستی تاکەکەسی خۆی بەبێ ئەویتریان، وەك گرێبەستی کەفالەت، کەسی کەفیلکراو مافی خۆیەتی گرێبەستەکە هەڵبوەشێنێتەوە بەبێ کەفیلەکە، هەروەها وەك گرێبەستی بارمتە، قەرزدەری بارمتەوەرگر مافی خۆیەتی گرێبەستەکە هەڵبوەشێنێتەوە بەبێ قەرزکەری بارمتەدەر، چۆناندنی بۆ دەکرێت بەوەی گرێبەستێکی دروستە و جێبەجێکەرە(ڕەفتاری لەسەر پەیدا دەبێت) پابەند نییە(قابیلی هەڵوەشانەوەیە) و دەچێتە ژێر دەقە یاساییەکانەوە کە دەست دەبات بۆ ڕەگەزەکان وحوکمەکانی.

٣. ئەو گرێبەستەی مەرجەکانی دامەزراندنی گرێبەست و دروستی و جێبەجێ کردن و پابەندبوونی تێدایە چۆناندنی بۆ دەکرێت بەوەی گرێبەستێکی دروستە و جێبەجێ دەکرێت و پابەندە(قابیلی هەڵوەشاندنەوە نییە بە ویستی تاکەکەسی) و دەچێتە ژێر دەقە یاساییەکانەوە کە تایبەت کراون بە ڕەگەزەکان و حوکمەکانی.

٤. هەر گرێبەستێك پایەك لە پایەکانی یان مەرجێك لە مەرجەکانی دامەزراندنی گرێبەستەکەی لێ دواکەوت چۆناندنی بۆ دەکرێت بەوەی پووچەڵە و دەچێتە ژێر دەقە یاساییەکانەوە کە چارەسەریان کردووە.

<u>بەشی سێیەم:</u> دابەش کردنی پێنجی، ئەمەش بریتییە لە دابەش کردنی چواری پێشتر باسکراو بە خستنە سەری بەشی پێنجەم کە هەندێ لە فەقیهانی ئیسلام دایانهێناوە(وەك حەنەفییەکان)،

---

[1] لە هۆکارەکانی ڕاگیرانی گرێبەست نەبوونی لێوەشاوەیی تەواوە لە جێبەجێ کردنی ڕەفتار کردندا، وەك گرێبەستی لێوەشاوەیی ناتەواو یان نەبوونی دەسەڵاتی سەرپەرشتیاری بەسەر شتی گرێبەست لەسەر کراودا، وەك گرێبەستی خۆخزێن(فرۆشتنی ماڵی کەسانی تر یان بۆ کڕینی بەبێ پرسی ئەو) یان پەیوەستبوونی مافی کەسانی تر وەك وەسێت زیاتر لە سێ یەك ڕاگیراوە لەسەر مۆڵەتی میراتگر بەبێ مردنی میراتلێگیراو.

یاسادانەری عێراقیش وەریگرتووە لە یاسای باری کەسێتی ڕاوەستاودا[1]، هەروەها یاسای مەدەنی ئوردەنی ڕاوەستاو[2]، هەر بەو جۆرە یاسای مەدەنی یەمەنی ڕاوەستاو[3].

ئەم بەشە بریتییە لەوەی کە هەر گرێبەستێك گەر لە بنەڕەتدا ڕەوا بوو، بەڵام لە وەسفیدا ناڕەوا بوو چۆناندنی بۆ دەکرێت بەوەی گرێبەستێکی تێکچووە.

تێکچوونی گرێبەست لە لای ئەوانەی جیاوازی دەکەن لە نێوان تێکچوون و پوچەڵدا، بەم هۆیانەی لای خوارەوەیە:

١. جیاکاری لە نێوان هەڵبژاردن و ڕازیبووندا، یەکەمیان ڕاستەوخۆ بریتییە لە هۆ، بەڵام دووەمیان بریتییە لە حەز لە سەرهەڵدانی کاریگەری لەسەر هۆ، ئەو دوانەش دوو پایەی مەعنەوین، گەر بەیەکەوە دەستەبەر بوون گرێبەستەکە دروست دەبێت، گەر پێکەوە دولکەوتن گرێبەستەکە پووچەڵە، گەر هەڵبژاردن بەبێ ڕازیبوون دەستەبەر بوو چۆناندنی بۆ دەکرێت بەوەی گرێبەستێکی تێکچووە، بەڵام بوونی ڕازیبوون بەبێ هەڵبژاردن وێنا ناکرێت.

٢. جیاکاری لە نێوان نەهیکردن لە شتێك بەهۆی خودی خۆیەوە لەگەڵ نەهیکردن لە شتێك بەهۆی وەسفێکی پێویست تیایدا، یەکەمیان چۆناندنی بۆ دەکرێت بەوەی گرێبەستێکی پووچەڵە وەك فرۆشتنی ماددە هۆشبەرەکان، دووەمیان چۆناندنی بۆ دەکرێت بەوەی گرێبەستێکی تێکچووە وەك گرێبەستی سووئامێز.

٣. جیاکاری لە نێوان بنەڕەتی گرێبەستەکە و وەسفی گرێبەستەکە، گەر بنەڕەت دولکەوت چۆناندنی بۆ دەکرێت بە گرێبەستێکی پووچەڵ، گەر وەسف دولکەوت چۆناندنی بۆ دەکرێت بە تێکچوو.

### أ- بنەڕەت و وەسفی گرێبەست:

بنەڕەتی گرێبەست بریتییە لەم مەرجانەی خوارەوە:

١. پڕاوپڕبوونی ئەرێبوون و قبوولکردن.

٢. یەککگرتنی دانیشتنی ئەرێبوون و قبوولکردن.

---

[1] المادة (٦) والمادة (٢٢) منه

[2] رقم ٤٣ لسنة ١٩٧٦

[3] رقم ١٩ لسنة ١٩٩٢

٣. جیاکاری لە قەرەبووکردنەوەکاندا و گرتنەوە لە بەخششەکاندا.
٤. فرەیی گرێبەستکەر بە حەقیقەت یان وەك حەکەم.
٥. شتەکە دیاریکراوبێت یان قابیلی دیاریکردن بێت.
٦. شتەکە قابیلی مامەڵەکردن بێت.
٧. شتەکە قابیلی رادەست کردن بێت.

**ب. وەسفی گرێبەست:**

سێ مەرجی یەکەمی باسکراو پێویستی بە وەسفی تەواوکار نییە بەپێچەوانەی چوارەکەی ترەوە، ئەوانە ئاتاجن بە وەسفی تەواوکار، وەك:

١. جیاکاری یان زیری کە رەگەزی رازیبوونی لەسەر چڕدەبێتەوە ئاتاجی وەسفێکی تەواوکارە ئەوەش بریتییە لە خاڵیبوونی لە زۆرلێکردن، چونکە گرێبەستی زۆرلێکراو تێکچووە.
٢. ئەو شتەی گرێبەستەکەی لەسەر دەکرێت دیاریکراو بێت یان قابیلی دیاریکردن بێت ئاتاجە بە وەسفێکی تەواوکار ئەوەش خاڵیبوونییەتی لە فریوکاری.
٣. بەوەی شتەکە قابیلی مامەڵە پێکردن بێت ئاتاج دەبێت بە دوو وەسفی تەواوکار، ئەو دوانەش: خاڵیبوونی لە سوو، گرێبەستی سووئامێز گرێبەستێکی تێکچووە، دووەم خاڵیبوونی لە مەرجی تێکدەر، گرێبەستی هاوتا بە مەرجی تێکچوو-بەوەی پێچەوانە بێت بە دڵوڵکاری گرێبەستەکە تێکچووە.
٤. شتەکە قابیلی رادەست کردن بێت ئاتاجە بە وەسفێکی تەواوکار ئەوەش خاڵیبوونییەتی لە زەرەر لە کاتی رادەستکردندا، هەموو رادەست کردنێك زەرەری لەسەر پەیدا ببێت تێکچووە.

تێکچوو و پووچەڵ هاومانان لەلای جمهوری فەقیهەکانی شەریعەت، یاسادانەری عێراقیش هەمان شتی بۆ یاسای مەدەنی راوەستاو وەرگرتووە، بەڵام دابەشکردنە پێنجییەکەی لە یاسای باری کەسێتیدا وەرگرتووە، وەك پێشتر باسمان کرد.

"أبو حنيفة" هۆی هێناوەتەوە بۆ فەلسەفەی جیاوازی نێوان "تێکچوو" و "پووچ" بەوەی گەر گرێبەستی رەوا بە بنەڕەتەکەی و ناڕەوا بە وەسفەکەی بە گرێبەستێکی دروست دانرا، ئەوا پێویست دەکات لە نێوان ئەو و رەوا بە بنەڕەتەکەی و بە وەسفەکەی ناکۆکی هەڵبگیرێت، ئەمەش

ژیری تەندروست و لۆژیك نەرێی دەکەن، گەر بە پووچەڵیش دانرا دیسان پێویست دەکات لە نێوان ئەو و نارەوا بە بنەڕەتەکەی و وەسفەکەی ناکۆکی هەڵبگیرێت، ئەمەش دیسان پێچەوانەی ئەقڵ و لۆژیکە.

**بەری جیاکاری نێوان پووچەڵ و تێکچوو:**

١. لە مامەڵە داراییەکاندا: گەر هۆی تێکچوون لە گرێبەستی تێکچوودا لادرا ڕاستەوخۆ دەگۆڕێت بۆ گرێبەستی دروست، بۆ نموونە: لە گرێبەستی سووئامێزدا گەر کەسی سووخۆر لە سووەکە دابەزی گرێبەستەکە دەگۆڕێت بۆ دروست.
هەروەها لە گرێبەستی زۆرلێکراودا گەر دوای لادانی کاریگەری زۆرلێکردن کەسەکە ڕێگەی دا ئەوا گرێبەستەکە دەگۆڕێت بۆ دروست.
بە پێچەوانەی گرێبەستی پووچەڵەوە، گەر هۆی پووچەڵییەکە لابدرێت ناگۆڕێت بۆ دروست، بەڵکو پێویستە سەرلەنوێ پیاهەڵچوونەوەی بۆ بکرێت، بەدەر لە هۆی پووچەڵ کردنەکە.

٢. لە باری کەسێتیدا: لە هاوسەرگیری پووچەڵدا چوونە لای یەکتر بە تاوانی زینا دادەنرێت بۆ ئەو کەسەی کە زانستی بە پووچەڵبوونەکە هەیە لە زیناکەری ژن و پیاو، بە پێچەوانەی هاوسەگیری تێکچووەوە چوونە لای یەکتری ژن و پیاو ئەم کاریگەرییە شەرعیانەی لەسەر پەیدا دەبێت:

أ. ڕەچەڵەکی منداڵی پەیدابوو لەو بەیەکتر گەیشتنە سێکسییەی ژن و پیاوەکە ڕەچەڵەکێکی دروستە، بۆیە هیچ جیاوازییەك نییە لە نێوان ئەوە و ڕەچەڵەك لە هاوسەرگیری شەرعی دروستدا لە ڕووی ماف و ئەرکەکانەوە.

ب. خزمایەتی ژن و ژنخوازی جێگیر دەبێت لە نێوان بنەڕەت و لقی پیاوەکە و ژنەکەدا.

ج. عیدە لەسەر ئافرەتەکە پێویست دەکرێت.

د. پێویستە مارەیی هاوشێوە بۆ ئافرەتەکە دابین بکرێت وەك بارپوویەك بۆ زیانی ئەدەبی(مەعنەوی) کە لە چوونە لای سەریهەڵداوە.

ه. سزای زینا لە هەردوو ژنەکە و پیاوەکە لادەدرێت سەرەڕای زانستیان بە تێکچوونی گرێبەستەکە، ئەوەش بەهۆی بوونی شوبهەیەکی حەڵاڵ تیایدا، بەهۆی ڕاستبوونەوەی هاوسەرگیری لە ڕواڵەتدا.

٣. لە عیبادەتەکاندا:

هەر کەس نەزری کرد لەسەر خۆی رۆژێك بەرۆژوو بێت بەبێ دیاری کردن، رۆژی جەژن بەرۆژوو بوو بەرپرسیارێتی رۆژووگر نامێنێت و داوای لێ ناکرێت رۆژێکی تر بەرۆژوو بێت، بە پێچەوانەی ئەوانەوە کە جیاوازی ناکەن لە نێوان تێکچوو و پووچەڵدا، لەو جێگەوە کە پێیان وایە نەزرەکەی بە رۆژووی رۆژی جەژن لەسەری لانادرێت.

شایانی باسە، "السنهوري" –خوالێخۆش بوو– لە کتێبەکەیدا "مصادر الحق" دەڵێت: فەقیهەکانی یاسا مەدح و سەنای "أبي حنیفة"یان کردووە بەوەی جیاکاری کردووە لە نێوان پووچەڵ و تێکچوودا، چونکە بەو کارەی زۆرێك لە مامەڵە دارایییەکانی لە روخان پاراستووە.

**دووەم: لە پیادە کردنەکانی چۆناندن لە پرسە سزاییەکاندا:**

لە پیادە کردنەکانی چۆناندن لە پرسە سزاییەکاندا چۆناندنی تاوانگەلێکە کە پەیوەستە بە ژیانی تاکەکان و سەلامەتی جەستەیانەوە.

تاوان: هەر قەدەغەکراوێك کە لەپایدا سزای لەسەر بدرێت چۆناندنی بۆ دەکرێت بەوەی "تاوان"ە.

پایە گشتییە هاوبەشەکانی نێوان تاوانەکان:

هەر شتێك شتێکی لەسەر وەستابێت و بەشێك بێت لە چییەتی(الماهیة) ئەو شتە چۆناندنی بۆ دەکرێت بەوەی "پایە"یە.

**پایە گشتییە هاوبەشەکانی نێوان تاوانەکان سیانن: پایەی شەرعی، و پایەی مادی، و پایەی مەعنەوی:**

پایەی شەرعی: هەر سیفەتێکی نارەوا کەوتبێتە ژێر دەقێکی تاوانبارکردنەوە خاڵی بێت لە هۆیەك لە هۆکانی موباحبوون چۆناندنی بۆ دەکرێت بەوەی پایەیەکی رەوایە.

پەیەی رەوا لەسەر بوونی دوو رەگەز دەوەستێت:

١. هاتنەژێرباری دەقێکی تاوانبارکردن

٢. نەهاتنە ژێرباری هۆیەك لە هۆیەکانی موباحبوون.

پایەی مادی: هەر چالاکییەك لە مرۆڤەوە سەرهەڵبدات بە نیێتی رووداني سەرئەنجامێكی تاوانكارانە لەگەڵ پەیوەندێكی هۆئامێز لە نێوانیاندا چوواندنی بۆ دەكرێت بەوەی پایەیەكی مادییە و لەسەر بوونی سێ رەگەز وەستاوە:

١. چالاكییەكی تاوانكارانە لە مرۆڤێكەوە بە نیێتی دەستەبەربوونی سەرئەنجامێكی تاوانكاری.

٢. دەستەبەربوونی سەئەنجامێك كە سزای لەسەر دەدرێت.

٣. بوونی پەیوەندی هۆئامێز لە نێوان چالاكییەكە و سەرئەنجامەكەدا.

پایەی مەعنەوی: ویستی دەرچوون لە یاسای سزایی بە كردن یان نەكردن چوواندنی بۆ دەكرێت بەوەی پایەیەكی مەعنەوییە[1].

كوشتن: كوشتنی رۆحی مرۆڤێك كە لە ژیاندا بووە چوواندنی بۆ دەكرێت بەوەی كوشتنە و لەسەر دوو رەگەز وەستاوە:

١. كوشتنی رۆحی مرۆڤێك.

٢. مرۆڤەكە لە ژیان دەرنەچووبێت بەر لە رووداني كارەكە.

بینا لەسەر ئەمە لە زاراوەدا پێی ناوترێت كوشتن گەر كارەكە كوشتنی رۆحی ئاژەڵێك بێت، یان مرۆڤێك بێت ژیانی بەجێهێڵا بێت(مربیێت) بەر لە رووداني كارەكە، بۆ كوشتن لە رووی چوواندنەوە چەندین جۆر بوونی هەیە، لەوانە:

١. كوشتنی موباح: بریتییە لە كوشتنی تۆڵەسەندنەوە یان بەرگری لە نەفس یان ناموس یان ماڵ و سامان، چوواندنی بۆ دەكرێت بە موباح و نە لە رووی سزاییەوە و نە لەرووی مەدەنییەوە لێ پێچینەوەی لێ ناكرێت.

٢. كوشتنی بەمەبەستی دوژمنكارانە: كوشتنی رۆحی مرۆڤێك كە لە ژیاندا بێت بە مەبەستەوە و بەبێ پاساوێكی یاسایی چوواندنی بۆ دەكرێت بە كوشتنی بەمەبەستی دوژمنكارانە.

٣. كوشتنی سادە: كوشتنی بەمەبەستی دوژمنكارانە هاوتا نەبێت بە رەوشێكی توند یان سووك چوواندنی بۆ دەكرێت بە كوشتنی سادە[2].

[1] د. رؤوف عبيد /مبادئ القسم العام من التشريع القضائي/ص٢٧٤.

[2] وەك لە مادەی (٤٠٥) لە یاسای سزای عێراقی بەركار، دەقەكەی(هەر كەس بە ئەنقەست كەسێكی كوشت بە بەندكردنی هەتا هەتایی یان كاتی بەند دەكرێت)

٤. کوشتنی هەڵە: کوشتنی رۆحی مرۆڤێك کە پایەی مەعنەوی تێدا بەدینەهاتبێت (مەبەستی سزایی).

٥. هەڵەی هۆشیارانە: ئەگەر کەسی هەڵەکار پێشبینی هەڵەکەی خۆی دەکرد، بەڵام شانی لەسەر لێوەشاوەیی و شارەزایی خۆی دادەدا، وەك ئەو کەسەی ئۆتۆمبێلەکەی بە خێراییەکی رێگە پێنەدراو لە شەقامێکی قەرەباڵغدا لێ دەخورێت، بە شان دادان لەسەر لێوەشاوەیی خۆی لە ئۆتۆمبێل لێخوڕیندا و زاڵبوونی بەسەر دوورکەوتنەوە لە ئەنجامدانی کاری ناڕەوا، لەگەڵ ئەوەشدا کارێکی ناڕەوای ئەنجامدا چۆناندن بۆ هەڵەکەی دەکرێت بەوەی هەڵەیەکی هۆشیارانەیە بۆیە لە رووی سزایی و مەدەنییەوە لێی دەپێچرێتەوە.

٦. هەڵەی ناهۆشیارانە: ئەوەیە کە کەسی هەڵەکەر پێشبینی ناکات وەك ئەو کەسەی ئۆتۆمبێلەکەی لێ دەخورێت بە خێراییەکی رێگە پێدراو بەڵام لەناکاو منداڵێك بۆ سەر شەقامەکە دەردەچێت و ئاراستەی ئۆتۆمبێلەکە دەگۆرێت بە ئاراستەی باخچەی ماڵێك و دەیشێلێت، یان حەوشە و پەرژینەکەی دەروخێنێت چۆناندنی بۆ دەکرێت بەوەی هەڵەیەکی ناهۆشیارانەیە، بۆیە کەسی هەڵەکار بەرپرسیارێتی سزایی نایەتە سەر، بەڵام بەرپرسیارێتی مەدەنی بۆ باربووکردنەوە دێتە سەر.

هەڵە لە بەرپرسیارێتی کەمتەرخەمیدا: بریتییە لە کەمتەرخەمی بە ئەرکێکی یاسایی لەگەڵ پەیبردنی کەمتەرخەمانە لەگەڵی، بینا لەسەر ئەم پێناسەیە ئەم جۆرە هەڵەیە لەسەر دوو رەگەز دەوەستێت:

١.رەگەزی مادی(بابەتیانە) ئەوەش بریتییە لە کەمتەرخەمی بە ئەرکێکی یاسایی.

٢.رەگەزی مەعنەوی: بریتییە لە زانستێکی کەمتەرخەمکار بەوەی کەمتەرخەمی کردووە بە ئەرکێکی یاسایی.

<u>هەڵەی تاوانکاری:</u> گەر ئەو ئەرکەی کەسی هەڵەکار کەمتەرخەمی تێدا ئەنجام دابوو بە یاسای سزایی دیاریکرابوو، ئەوا چۆناندنی بۆ دەکرێت بە تاوانکاری یان سزایی.

<u>هەڵەی مەدەنی:</u> گەر بەرەهایی بە یاسا دیاریکرابوو مەدەنی بێت یان سزایی یان بەشێوەیەکی راستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ وەك پابەندکردنی هەموو مرۆڤێك بە یاسا بەوەی زیان بە کەسانی تر نەگەیەنێت، چۆناندنی بۆ دەکرێت بە هەڵەیەکی مەدەنی، هەتا تاوانکاری دەستەبەر ببێت هەڵەی

مەدەنی دەستەبەر دەبێت، نەك بە پێچەوانەوەی گشتییەوە، چۆناندنی بۆ دەکرێت بەوەی کوشتنی هەڵەیە و دەچێتە ژێر ئەو دەقەوە کە حوکمی بەسەردا دەکات.

١. کوشتنی هاوتا لەگەڵ رەوشی توند: کوشتنی رۆحی مرۆڤێك لەگەڵ سووربوونی پێشینە یان چوونە شکار بۆی یان هاوتابوون بە تاوانێکی تر چۆناندنی بۆ دەکرێت بەوەی کوشتنی هاوتابووە بە رەوشێکی توند، کەسی تاوانکاری لەسەر سزا دەدرێت بە سزایەك توندتر لە تاوانی کوشتنی سادە و دەچێتە ژێر دەقی سزاییەوە کە چارەسەری حوکمەکەی دەکات.

٢. کوشتنی هاوتابوو بە رەوشی سووك: کوشتنی رۆحی مرۆڤێك لەگەڵ پێشینە تووڕەکردنی دەستدرێژکار لەلایەن دەست بۆدرێژکراوەوە، بۆ نموونە، چۆناندنی بۆ دەکرێت بە کوشتنی هاوتا بە رەوشی سووك، بە سزایەك سزا دەدرێت کە قەبارەکەی کەمتر بێت لە سزای کوشتنی سادە و دەچێتە ژێر دەقی سزایی تایبەتەوە.

٣. لێدانێك سەرکێشێت بۆ مردن: کوشتنی رۆحی مرۆڤێك بە لێدانێك کە بکەرەکەی مەبەستی نەبووە ئەو سەرئەنجامە تاوانکارییەی لێوە پەیدا بێت چۆناندنی بۆ دەکرێت بە لێدانی سەرکێش بۆ مردن کەسی تاوانکار سزا دەدرێت بە سزای کەمتر لە کوشتن بەمەبەستی دوژمنکارانە، و دەچێتە ژێر دەقێکی سزاییەوە کە حوکمی بەسەردا دەکات.

زۆرێك لە جێبەجێ کردن بوونی هەیە بۆ چۆناندن لە پرسە سزاییەکاندا، بەم بڕە رادەوەستین بۆ ئەوەی خۆمان لە درێژکردنەوەی شەکەتکەر دووربخەینەوە.

**پەیبردن بە هەڵەی قازی لە چۆناندندا:**

گەر قازی بابەت هەڵەی کرد لە چۆناندنی رووداوێکدا دەتوانرێت پەی پێببرێت لە دادگای باڵا وەك دادگای پێداچوونەوە.

بۆ نموونە، لە سەردەمی جەنگی عێراق ئێراندا لە هەشتاکاندا یەکێك لە ئەفسەرەکان گەڕابوویەوە بۆ ماڵەکەی خۆی لە کاتێکی درەنگی شەودا، جەستەی پیاوێکی لە باخچەی ماڵەکەیدا بینی بوو کە بە تەلی کارەبایی درێژکراوە بەسەر پەرژینی باخچەکەدا مردبوو، پاشان دواییەکی لەسەر راستکرایەوە لەلایەن کەسانی پەیوەندیدارەوە، لەبەردەم قازی بابەتدا وتی بە مەبەستی بەرگری لە نەفس و ماڵ بەو کارە هەستاوە، بەهۆی ئەو رەوشە ناجێگیرەی بەهۆی جەنگی عێراق ئێرانەوە سەریهەڵداوە، بۆیە قازی بابەت حوکمی بێتاوانی بۆ دەرکرد، دوای ئەوەی رووداوەکەی چۆناندبوو بە رووداوێکی بەرگری شەرعی، دوای پێداچوونەوەی حوکمەکە دادگای

پێدلچوونەوە بڕیاری قازییەکەی هەڵوەشاندەوە بەهۆی ئەوەی کە بەهەڵەدلچوو بوو لە چۆناندنی رووداوەکە، بەهۆی نەبوونی رەگەزی بەرگری رەوا تیایدا، لەنێوانیاندا بوونی ئەو ترسەی هەڕەشە دەکات لە مافێك لە مافەکانی کە بە یاسا پارێزراون، چونکە ترسێك بوونی نەبووە لە حاڵ و دەمی رووداندا بێت.

## جۆرەکانی چۆناندن:

چۆناندن دابەش دەبێت بۆ دوو جۆر:

١. چۆناندنی یاسایی: بریتییە لە پێدانی سیفەتێکی یاسایی بۆ رەفتارێکی یاسایی یان رووداوێکی یاسایی بە مەبەستی دیاری کردنی دەقێك کە پیادە کردنی پێویستە، وەك چۆناندنی وزەی کارەبایی بەوەی ماڵێکی گوازراوەیە تاوانی دزی تێدا دەستەبەر دەبێت.
هەروەها وەك چۆناندنی پەیوەندی نێوان دەستدرێژکار و دەستبۆدرێژکراو لە باری خیانەت لە ئەمانەتدا بەوەی پەیوەندییەکی گرێبەستانەیە وەك هاوشێوەکانی لە بەکرێگرتن و خواستن.
هەروەها وەك چۆناندنی رووداوەکان کە تاوانی لەسەر راستدەبێتەوە بەوەی نارەوایە بەپێی یاسای سزاکان.

٢. چۆناندنی نایاسایی: بریتییە لە چۆناندنی شتێك کە ناچێتە ژێر رەفتارە یاساییەکان و رووداوە یاساییەکانەوە لە هەر شتێك کە دەرئەنجامەکەی پێشبینیکراو بێت لەسەر بڕگەلێك کە سروشتی یاساییان نییە، وەك چۆناندنی کردارێك لە کەسێك وەشابێتەوە کە رسواکەرە و سنووری شەرم و حەیا دەبەزێنێت[1].

---

[1] د. محمود نجيب حسني /المرجع السابق/ص٤٩٠.

# بەشی چوارەم

# شرۆڤە و لێکدانەوە

ئەم بابەتە لە دوو باسدا دەست بۆ دەبەین

یەکەمیان تایبەت دەکرێت بە شرۆڤە و دووەمیان بە لێکدانەوەوە.

# باسی یەکەم:
# شرۆڤە (التفسیر)

لە زمانەوانیدا وشەی "التفسیر" مانای پەردە لەسەر لادان و والاکردن و رۆشنکردنەوە و خستنەروو و سڕینەوەی تەومژ و لێڵی(الکشف والبیان والإیضاح والتبیین و إزالة الغموض)ی هەیە[1].

"شرۆڤە" و "ناساندن" لە زاراوەی زانستی ژیرێژی(مەنتق)دا: ئەو دوانە لە یەکترەوە نزیکن لە رووی ناوەرۆك و مەبەستەوە.

زانایانی ژیرێژی(مەنتق) پێناسە و رۆشنکردنەوە و والاکردنیان بۆ چەندین بەش دابەش کردووە، ئەمەش لە چەندین رووەوە، وەك ئەمانەی کە دێن:

## یەکەم: لەرووی مەرامی گوزارەیی و بەئاگاهێنانەوە:

١. شرۆڤەکردنی گوزارەیی: مەبەست پێی شرۆڤەی نادیارێکە بە وشەیەکی رۆشنتر لە خۆی لە رووی ئاماژەوە لەسەر ماناکە، سەرچاوەی شان لەسەر دادراو بۆ ئەم جۆرە بریتییە لە فەرهەنگە زمانەوانییەکان.

٢. شرۆڤەکردنی بەئاگاهێنان: مەبەست پێی ئامادەکردنی وێنەیەکی تۆمارکراوە لە زەینی گوێگردا کە لێی بزر بووە لەدوای ئەوەی زانستی پێی هەبووە، بینا لەسەر ئەمە ئەم جۆرەیان ناچێتە دەروازەی بەدەستهێنانی نادیار لە زانراوەوە، چونکە هیچ بەدەستهێنانێکی نوێ بوونی نییە، بەڵکو تەنها ئامادەکردنەوەی ئەوەیە کە بزر بوو بوو، و وەبیرهێنانەوەی کەسی گوێگرە.

[1] لسان العرب: فصل التاء حرف الراء.

## دووەم: لەرووی زانست بە بوونی وشەی پێناسەكراو لە دەرەوەی زەینەوە و نەبوونیان:

**سەرزاری و راستەقینە.**

شرۆڤەی سەرزاری: تایبەتە بە بوونە زەینییەكان، وەك چۆن شرۆڤەی راستەقینە تایبەتە بە بوونە دەرەكییەكانەوە، وەك بەرچاوە هەبووەكانی دەرەوەی زەین.

١. شرۆڤەی سەرزاری: والاكردن و شرۆڤەی زاراوە زانستییە بایەخ پێدراوەكانە، وەك پێناسەی شتێكی بەرچاو پێش بوونی، یان پێش زانست بە بوونی، وەك پێناسەیەكی دەرخەر پێش دەرخستنی، هەروەها وەك والاكردن و رۆشنكردنەوەی تایبەتمەندییەكانی پرۆژەیەك بەر لە دروستكردنی.

٢. شرۆڤەی راستەقینە: ناساندنی ئەوەی بوونی دەزانرێت لە دەرەوەی زەینەوە.

پێناسەكان بۆ بوون لە دەرەوەی زەینی مرۆڤەوە پێناسەگەلێكی راستەقینەن، وەك پێناسەی گوازراوە كە بریتییە لە هەر شتێك بتوانرێ بگوێزرێتەوە لە شوێنێكەوە بۆ شوێنێكی تر بەبێ گۆڕانی، هەروەها پێناسەی خانووبەرە بریتییە لە هەر شتێك نەتوانرێت بگوێزرێتەوە بە هۆكارێكی ئاسایی لەگەڵ پارێزگاری لە شێوەی.

## سێیەم: شرۆڤەی ژیربێژییانە(مەنتقیانە)

لە رووی رەگەزەوە دابەش دەبێت بۆ رادەیی و وێنەیی، هەر یەكێك لەم دوانە دابەش دەبێت بۆ: تەواو و ناتەواو.

١. رادەی تەواو: بریتییە لەوەی كە پێكدێت لە رەگەزی شتێك و جیاكەرەوەكەی نزیك و هاوتا بەیەكتر، وەك پێناسەی تاوان، بەوەی: (قەدەغەكراوە و لەسەری سزا دەدرێت) یەكەمیان رەگەزە و هەموو قەدەغەكراوە سزاییەكان و ناسزاییەكان دەگرێتە خۆ، دووەم جیاكەرەوەیە و قەدەغەكراوە ناسزاییەكان بەهۆیەوە دەكرێنە دەرەوە، وەك ئەو زیانانەی شایستەی باربووكردنەوەن.

٢. رادەی ناتەواو: بریتییە لە پێناسە بە رەگەزی دوور و جیاكەرەوەی نزیك، وەك پێناسەی تاوان بەوەی رووداوێكە سزای لەسەر دەدرێت.

٣. وێنەیی تەواو: بریتییە لە پێناسە بە رەگەز و جیاکەرەوە و تایبەتمەندی: وەك پێناسەی تاوان بەوەی قەدەغەکراوێکی سزا لەسەردراوە و زیانبەخشە بە تاك و کۆمەڵ.

٤. وێنەیی ناتەواو: بریتییە لە پێناسەی شتێك بە تایبەتمەندییەکەی، وەك پێناسەی مولکداری بەوەی: یاسا کەسەکە سەرپشك دەکات بە تاوتوێکردن و بەکارهێنان و قۆزتنەوە و بندەستخستن[1].

شرۆڤە لە زاراوەسازی فەلسەفەدا: بریتییە لە شرۆڤە کردنی راستییەکی زانستی و رۆشنکردنەوەی، یان بریتییە لە پێویستییەکە لە بنەما بەڵگەنەویستەکان، شرۆڤەکردن(التفسیر) گشتگیر ترە لە هۆهێناوە(التعلیل)، چونکە هۆهێنانەوە بریتییە لە گواستنەوەی زەین لە کارکەرەوە بۆ شوێنەوار(کاریگەری) جیاوازی نییە گەر هۆیەکە تەواو بێت یان ناتەواو، هەموو هۆهێنانەوەیەك بریتییە لە شرۆڤە و رۆشنکردنەوە، بەڵام هەموو شرۆڤەیەك بریتی نییە لە هۆهێنانەوە[2].

شرۆڤەی زاراوە سازی شەرعی: بریتییە لە پەردە لادان لەسەر مەرامی وشەکانی قورئان.

شرۆڤە لە زاراوەسازی یاسایی: بریتییە لە دیاریکردنی ئەو مانایەی یاسادانەر مەبەستی بووە لە وشەکانی دەقەکەدا، بۆ ئەوەی گونجاو بێت بۆ جێبەجێ کردن بەسەر رووداوەکانی ژیاندا[3]، واتە شرۆڤە بریتییە لە گەڕان بەدوای ویستی یاسادانەردا بە وشەگەلێکی دیاریکراو کە دەقی یاسایی لێ پێکدێت، بۆ ئەو مەبەستە شیکارکردن بۆ ئەو وشانە و پەردە لادان لەسەر ئاماژەکانیان پێویست دەکات، مانای بە مەبەستگیراو لە دەقەکەدا بریتییە لە رێکخستنی یاسایی بۆ بابەتێکی دیاریکراو.

فەلسەفەی شرۆڤەکردن(هۆی بەئامانجگیراو) بریتییە لەوەی دەقەکە وا لێبکەیت گونجاو و شیاو بێت بۆ پیادە کردن بەسەر ئەوەی بۆ قەزا دەخرێنەروو لە رووداوەکان، بەجۆرێك دەستەبەری دڵنیەرەوەری بکات.

---

[1] ینظر مؤلفنا المنطق القانوني في التصورات ص ١١٥ وما يليها

[2] المعجم الفلسفي للدكتور جميل صليبا ١ / ٣١٤

[3] ینظر موجز شرح قانون العقوبات – القسم العام للدكتور محمود نجيب حسني ص٥٤

## جۆرەكانی شرۆڤە:

شرۆڤە لە رووی سەرچاوەوە(ئەو لایەنەی سەرپەرشتی دەكات) دابەش دەبێت بۆ پێنج بەش: یاسایی و فیقهی و قەزایی و زانستی و ژیریێژی(مەنتقی)

**یەكەم: شرۆڤەی یاسایی:** بریتییە لەوەی كە خاوەن شەرع(الشارع) یان یاسادانەر(المشرع)[1] دەیگرێتە دەست، یان ئەو كەسەی پێی رادەسپێررێت.

لە نموونەكانی شرۆڤەی خاوەن یاسارێژی تایبەت كردنی دەقێكی گشتی بە دەقێكی تر، وەك تایبەت كردنی كۆی مادەی شەشەم لە یاسای سزاكانی عێراقی راوەستاو: (حوكمەكانی ئەم یاسایە بەسەر هەموو تاوانێكدا جاری دەبێت كە لە عێراقدا ئەنجام دەدرێن، وا دادەنرێت كە تاوانەكە لە عێراق ئەنجام دراوە گەر كارێك لە كارەكان كە پێكیدەهێنێت تیایدا روویدابێت، یان گەر سەرئەنجامەكەی تێدا دەستەبەر بوو بێت، یان دەویسترا تیایدا دەستەبەر ببێت).

لە هەموو بارەكاندا یاسا دەسەپێ بەسەر هەر كەسێكدا بەشداری دەكات لە تاوانێكدا كە هەمووی یان هەندێكی لە عێراقدا روویدابێت، با بەشداری كردنەكەشی لە دەرەوە بێت، یەكسانە كەسەكە بكەر بێت یان هاوبەش بێت) گوزارەی(هەموو تاوانەكان) بۆ گشتاندنە، هەموو ئەوانە دەگرێتەوە تاوانێك لە هەرێمی عێراقی وشكانی یان ئاویی یان ئاسمانییدا ئەنجام بدەن، بەبێ گوێدانە رەگەزنامە و سیفەتی فەرمانبەرییەكەی.

بەڵام ئەم گشتاندنە مەبەستی یاسادانەر نەبووە، بۆیە بە مادەی یازدەی هەمان یاسا تایبەتی كردووە، كە دەقەكەی بریتییە لە: (ئەم یاسایە ناسەپێت بەسەر ئەو تاوانانەدا كە لە عێراقـدا روودەدەن لـەو كەسـانەی پارێزبەنـدی بڕیاربۆدراویـان هەیـە بـەپێی رێكەوتنـە نێودەوڵەتییەكان، یان یاسای نێودەوڵەتی یان یاسای ناوەكی).

هەروەها لە شرۆڤەی یاسایی بریتییە لە كۆتوبەند كردنی دەقی رەها وەك لە وشەی وەسێت(وصیة)دا هاتووە، ئەو وشەیە بە رەهایی لە قورئاندا هاتووە بۆیە وەسێت بە هەموو

---

[1] وشەی "الشارع–خاوەن شەرع" تایبەت بە شەریعەتی ئیسلامی بەكاردەهێنێت، چونكە داڕشتنەكە تێچوونی تێدا نییە، بە پێچەوانەی وشەی "المشرع–یاسادانەر" كە ئاماژە بە تێچوون و زۆرلەخۆكردن و هەڵگرتنی زەحمەت و ئەركی تێدایە لە یاسارێژیدا.

لێجێماوەکە یان بەشێکی لە ئامێز دەگرێت، لە دوو سێ یەکی یان نیوەی یان سێیەکی، یان هاوشێوەکانی ئەمانە.

بەلأم ئەم رەهاکردنە مەبەستی خاوەن-جل جلالە- نەبووە، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) کۆتوبەندی کردووە، بەو مافەی خودا پێی بەخشیوە لە ئایەتی: ﴿وَأَنزَلْنَا إِلَيْكَ الذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ﴾[1]، ئەم کۆتوبەندکردنە بە سێ یەك و بەرەوخوار بووە.

خودا-سبحانە وتعالی- دەفەرموێت: ﴿كُتِبَ عَلَيْكُمْ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ الْمَوْتُ إِن تَرَكَ خَيْراً[2] الْوَصِيَّةُ لِلْوَالِدَيْنِ وَالأقْرَبِينَ بِالْمَعْرُوفِ حَقّاً عَلَى الْمُتَّقِينَ﴾[3].

ئەم کۆتوبەندکردنە لە فەرموودەکەی "سعد بن أبي وقاص"دا هاتووە، کاتێك وتی: ((وتم: ئەی پێغەمبەری خودا، من خاوەنی ماڵ و سامانم، لە ریوایەتێکی تردا: من ماڵ و سامانی زۆرم هەیە، تەنها یەك کچ دەبێتە میراتگرم، ئایا دوو سێ یەکی ماڵەکەم بکەم بە صەدەقە؟ فەرمووی: نەخێر، وتم: نیوەی بکەم بە صەدەقە؟ فەرمووی: نەخێر، وتم: یەك سێ بەشی بکەم بە صەدەقە؟ یەك سێ بەش، یەك سێ بەشیش زۆرە، تۆ گەر میراتگرانت بە دەوڵەمەندی بەجێبهێڵیت باشترە بۆت تا بە هەژاری بەجێیان بهێڵی و دەست لە خەڵك پان بکەنەوە))[4]

**دووەم: شرۆڤەی فیقهی**: شرۆڤەی فیقهی ئەوەیە کە فەقیهەکان پێی هەڵدەستن لە دانراوەکان و باس و لێکۆڵینەوە زانستییەکانیاندا، هەروەها لە کاتی وتنەوەی وانەی یاسایی و هاوشێوەکانی ئەمانە.

شرۆڤەی فیقهی گرنگییەکی تیوری گەورەی هەیە و بە لۆژیکی ورد و بەڵگەی دەمکوتکەر جیادەکرێتەوە، سەرەڕای هەموو ئەمانەش، شرۆڤەی فیقهی بۆ قازی پابەند نییە ئاستی زانستی فەقیهە شرۆڤەکەرەکە هەرچۆنێك و هەرچەندێك بێت.

**سێیەم: شرۆڤەی قەزایی**: شرۆڤەی قەزایی ئەوەیە قازی دەیگرێتە دەست لە کاتی جێبەجێ کردنی یاسادا کە روخساری دادپەروەری تێدا رۆشن نەبێت و ئەو مانایەی کە ئەو لێی ورد

---

[1] سورة النحل / ٤٤

[2] اي مالا

[3] سورة البقرة / ١٨٠

[4] اخرجه البخاري في كتاب الوصايا باب الوصية بالثلث – فتح الباري / ٥ / ٢٤٦. والنسائي باب الوصية بالثلث ٦ / ٢٤١

دەبێتەوە بۆ مەرامی پیادە کردنەکە بەسەر پرسکەدا ئاشکرا نەبێت، بۆیە پێویستە لەسەر قازی ئەو ناڕۆشنییە هەڵبگرێت.

پێشتر رای باو ئەوە بوو شرۆڤە بە گشتی و شرۆڤەی قازی بە شێوەیەکی تایبەت بریتییە لە دیاریکردنی مانا کە یاسادانەر لە کاتی داڕشتنی یاساییدا بە وشەکانی ناو دەقەکە مەبەستی بووە، تاکو گونجاو بێت بۆ پیادە کردن بەسەر رووداوەکانی ژیاندا لەسەر ئەو بنچینەی ئەو مانایەی یاسادانەر مەبەستی بووە و ویستوویەتی لە دەقەکە لە کاتی داڕشتنیدا بریتییە لەو مەرام و مەبەستەی کە دەبێت بیانگەنێت و پیادەیان بکات.

ئەرکی سەرشانی شرۆڤەکار بریتی بوو لە گەڕان و وردبوونەوە لەو ویستە، واتە پێویست بوو لەسەری بەدوای نییەتی یاسادانەردا بگەڕێت لە کاتی یاساداڕشتندا، بۆیە ئامادەکاری لە پێشەکی سەرچاوەکانی شرۆڤەکردنی فەرمی بوو کە کەسی شرۆڤەکار کۆمەکی لێ وەردەگرت لە شرۆڤەکردنەکەیدا.

بەڵام لە ئێستادا وەك تێبینی دەکرێت لە سیستەمە دەستورییە نوێیەکاندا ئەوە بوونی نییە پێی دەوترا یاسادانەر کە دەویسترێت ویستەکەی بزانرێت و بەدوای نییەتەکەیدا کۆشش بکرێت، چونکە یاسادانان لەم سەردەمەدا ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکی بەشداری دەکەن لە دانانیدا، ئەوان لە بیروبۆچوون و مەیل و ئاراستەیاندا جیاوازن لە یەکتر، بۆیە بابەتی شرۆڤەکردن بووە بە ویستی یاسادانان، نەك ویستی یاسادانەر، چونکە یاسادانەر هیچی تر نییە جگە لە وێناکردنێکی زەینی، یاسادانەر لە ئێستادا کەسایەتییەکی مێژوویی راستەقینە یان مەجازی نییە، بۆیە پێویستە: شرۆڤەکردن جیلوەکردن بێت بۆ مانایەك لە ئێستادایە کە لە رێسایەکی یاسایی یان ویستێکی یاساداڕێژیدا دەژی.

یاسادانان مەرامێکی سەربەخۆ لە نییەتی دانەرەکەی لەئامێز دەگرێت، بۆیە پێویستە لەسەر شرۆڤەکار هەردوو چاوی بخاتە سەر ئامانجی یاسادانان کە مەبەست لێی رێکخستنی پەیوەندیگەلێکی دیاریکراون لەپێناو تێرکردنی پێویستیگەلێکی دیاریکراودا.

بۆیە شرۆڤە کردن پێویستە بابەتیانە بێت، بەدوای ویستی یاسادانەردا ناگەڕێت و سروشتی بابەتیانە داوا دەکات کە یاسادانان بەهایەك بێت جیا لە بەهاکەی یەکەمجاری کە دانەرەکانی کردبوویان بە بەریدا، هەروەها سەرئەنجام و ئاسەوارێکی لێوە بەرهەم بێت چاوەڕوان نەکراوبێت، و لە کاتی دانانی یاسادا پێشبینی نەکرابێت، بۆیە رێسای یاسایی لەگەڵ کات بواری پیادە کردنی

بـەرینتر وەردەگرێـت، درێژدەبێتـەوە بـۆ پەیوەندییـەکان کـە هەنـدێ جـار جیـاوازە لـەو پەیوەندییانەی بە مەبەست گیراون لە کاتی یاسادانانا.

پوختەی قسە: کاری قـازی دەسـتەبەرکردنی دادپەروەرییـە، بۆیـە دەبێت بـەدوای مـەرامی یاسادانەردا نەگەرێت لە کاتی یاسـادانانی دەقێکدا، چـونکە دادپـەروەری و حیکمـەت دوای لـێ دەکەن دەقی یاسا پیادە بکات بـەپێی واقـع و پڕاوپـڕ لەگـەڵ داواکارییـەکانی ژیـانی سـەردەم و کاتی پیادە کردن.

**بەراورد لە نێوان هەردوو شرۆڤەی فیقهی و قەزایی:**

١. تەفسیری فیقهی وردەکاری زۆرترە و نـزیکترە بـە زیرییـژی، چـونکە مەیـدانی فەقیـه بـۆ بیرکردنەوە زۆرتر و بەرینترە لـە مەیـدانی قـازی، هـەروەها لەبـەر ئـەوەی کـاری فەقیـه هەمیشە لەسەر شرۆڤەی دەقەکان و لێکدانەوەیان و قسەکردن لەسەریان وەستاوە.

٢. شـرۆڤەی فیقهـی مـەودای بـەرینترە و زۆرتـر گشـتگیرە، چـونکە شـرۆڤەی قـەزایی لـە ناوەڕۆکیدا شرۆڤەی چەند حاڵەتێکی دیاریکراوە، واتە هەر یەکەیان بە تەنها و بە جیا[1].

٣. شرۆڤەی فیقهی لە ناوەڕۆکیدا لـە رەخنـەی ئازادانـە و لێکۆڵینـەوەی زانسـتییەوە جـاری دەبێت، بۆیە زۆر ئازاتر و بوێرتر و قووڵترە.

٤. سەرەڕای ئەو جیاکەرەوە ئاماژەبۆکراوانە کە بـۆ شـرۆڤەی فیقهـی بـوونی هەیـە، لەگـەڵ ئەوەشدا شرۆڤەی قەزایی بەوە جیادەکرێتەوە کەمیانەگیری زۆرتـری تێدایـە و زیـاتر بـە یاسـادانانەوە لکـاوە، ئـەوەش لەبـەر ملکەچبوونی قـازی بـۆ یاسـادانان، هـەروەها بـۆ دەستەبەر کردنی بەرپرسیارێتی خۆی لەبەردەم دەستوور و یاسادا[2].

---

[1] د. ثروة الاسيوطي: – نشأة المذاهب الفلسفية وتطورها ص ٢٩٦ و ص ٤٨٧، د. عبدالحي حجازي: – المدخل لدراسة العلوم القانونية ص ٥١٨ وما يليها.

[2] د. عبدالحي الحجازي / المرجع السابق / ص٥١٣

## چوارەم: شرۆڤەی زانستی:

پێشکەوتنی هەربوو جیهانی تەکنەلۆژی و پزیشکی و مەیدانەکانی تریش لە دەرکەوتەکانی ژیاری مرۆڤایەتی و پێشکەوتنی زانستی هەموو ئەولنە سەریکێشا بۆ لۆزینەوەی نوێ بۆ هەندێ لە بوونە گەربوونییەکان کە مرۆڤ پێشتر نەیدەزانین.

بەهۆی شرۆڤەی ئەو لۆزینەوە زانستییانەوە سروشتی زۆرێك لە کاروبارە شارلوەکان لە ناو سکی زەوی و هەبوو لەسەر پشتی زەوی بۆ خێزانی مرۆڤایەتی رۆشن بوویەوە، ئەو شرۆڤە زانستییە یارمەتی مرۆڤیدا بۆ جیاکاری نێوان سوودبەخشەکان و زیانبەخشەکانی ئەم شتە نوێیانەی کە هاتوونەتە ئارلوە، بۆیە سوود و قازانجی لەولنە بینی کە سوود و قازانجیان تێدابوو و ئەوەش کە زیانبەخش بوو لەخۆی دوورخستەوە، هەر بەو جۆرە کۆمەڵە رێوشوێنێکی خۆپارلستنی گرتەبەر بۆ خۆپارێزی لە هەر شەرێك زیان بە ژیانی دەگەیەنێت و کار دەکاتە سەر سەلامەتی جەستەیی ئەو و پارێزگاری ماڵ و سامانی.

هەر بەو جۆرە قەزا سوودێکی زۆری لە رێگەی شرۆڤەی زانستی بینیوە، لە کاروبارە پزیشکییەکان کە پەنای پێ دەبرێت لە بولرەکانی لۆزینەوەی تاوان و ئاسەولرەکانی و رادەی ترسناکی کەسی تاوانکار لەسەر کۆمەڵگە و لە روویەکی تایبەتەوە لە رێگەی پزیشکی دانگۆزارییەوە، وەك لە بەشی دلهاتووە بە پشتیوانی خودا باسی لەبارەوە دەکەین.

## پێنجەم: شرۆڤەی لۆژیکییانە(مەنتقیانە):

لەو بنەما مێژووییانەی کە دەق و پێشینە پێناسەکانی تر بەیەکترەوە گرێ دەدات، هەروەها لەو پەیوەستیانەی کە دەق بە تەولوی دەقەکانی تر و فاکتەرە کۆمەلآیەتییەکانەوە گرێ دەدات، ئەمانەن:

فاکتەری ژیری: بۆ هەموو دەقێك ئامانجێك هەیە(هۆیەکی ئامانجدار) کە هەوڵدەدات پێی بگات بەپێی حیکمەتی ئەو کەسەی دلیناوە، بۆیە حیکمەت لە یاسادلنان بریتییە لەو مەرلمەی کە یاسادلنان دەیەوێت دەستەبەری بکات، ئەوە بریتییە لە هۆی بوونی یاسادلنان و هەر ئەوەش ئامانجی راستەوخۆیەتی یان رۆحی یاسادلنانە.

پێویستە تێگەیشتن لە دەق بوونی هەبێت لەسەر ئەو مانای کە پێویستە زۆرترین دەستەبەرکەری حیکمەت بێت، هەندێ جار حیکمەتی یاسادلنان لەگەڵ کاتدا دەگۆرێت، بۆیە

شرۆڤەکار کە لە ڕێسایەك دەکۆڵێتەوە لە زەمەنێکی دوورەوە دانراوە بەسەریدا تاسەپێت بکۆڵێتەوە لەو هۆیەی لەو کاتەدا یاسادانەری پاڵناوە بۆ دانانی ئەو ڕێسایە، بەڵکو پێویستە لەو کاتەدا لە بنچینە ئەقڵییەکەی بکۆڵێتەوە کە شرۆڤەی بۆ دەکات.

## بەرتەسکبوونەوە و فراوانبوون لە شرۆڤەکردندا:

جمهوری فەقیهانی یاسا پێیان وایە شرۆڤەی دەقە سزاییەکان پێویستە زۆر بەرتەسك بێت لەسەر بنچینەی(بنەمای رەوابوون) واتە (هیچ تاوان و سزایەك بوونی نییە بە یاسا نەبێت) گەر بەرینکردنی قازی لە شرۆڤەی دەقی سزاییدا ئەو بنەمایەی تیادەبرد، چونکە سەردەکێشێت بۆ بەرینکردنی ئاسۆی دەقی سزایی بەجۆرێك کردەوەگەلێك بگرێتەوە کە یاسادانەر حەرامی نەکردووە و سزای لەسەر دانەناوە، لە کاتێکدا کەسانێکی تر[1] پێچەوانەی ئەوەیان پێ دروستە، چونکە شرۆڤەی بەرتەسك واتە سەپاندنی کۆتوبەندی دادگایی بەسەر چالاکی زەینی شرۆڤەکاردا، رووالەتی بوونی شرۆڤە کردن لەپاڵ ئەوەی نەرێی دادپەروەری دەکات دەقەکە لە سروشتی زانستی رووت دەکاتەوە، و دەیگۆڕێت بۆ دووبارەکردنەوەی چەند گوزارەیەکی یاسا لە داڕشتن و وشەی تردا، ئەمەش وادەکات یاسا دەستەوسان بێت لە رووبەڕووبوونەوەی رەوشە نوێیەکان، لەوێشەوە دەستەوسان دەبێت لە پارێزگاری مافەکانی کۆمەڵ، پاشان سەردەکێشێت بۆ زاڵبوونی کۆمەڵێك وشە و ئامراز بەسەر ئامانجدا.

بەڵام لە هەموو بارەکاندا پێویستە کارەکە نەگاتە رادەی بەکارهێنانی پێوانە(قیاس) لە شرۆڤەکردنی دەقە سزاییەکاندا، وەك رێزلێنانێك بۆ بنەمای رەوایی، بۆیە بۆ قازی نییە کارێك کە دەقێك لەسەر تاوان کردنی نەهاتووە پێوانە بکاتە سەر کارێك کە دەقێك بۆ تاوان کردنی هاتووە، بۆ کاری یەکەمیان سزای کاری دووەم دەربکات، بەڵام رێگرتن لە پێوانە مانای رێگرتن نییە لە شرۆڤەکردنس بەرین، ئەمەیان موباحە هەر کات دادپەروەری داوای بکات.

---

[1] د. محمود نجيب حسني / المرجع السابق / ص ٥٨ ومابلبها

**رێگەدان بە پێوانە لەو دەقانەدا کە دەقی تاوانبارکردن نین:**

کە رێگرتن لە پێوانە لە پرسە سزاییەکاندا بیناکرابێت لەسەر رێزگرتنی بنەمای رەوایی، ئەوا سەرئەنجامی پێویستی ئەوە بریتییە لە رێگەدان بە پێوانە، لە کاتێکدا بوارێك بۆ پیادە کردنی ئەو بنەمایە نەمابێتەوە وەك لە پرسە مەدەنییەکاندا.

**شرۆڤەی شک لە بەرژەوەندی تۆمەتبارە:**

دەقی سزایی لێڵ(ناڕوون) قازی لە پشتگوێخستن نابورێت، چونکە ئەو کات بە تێکچوونی دادپەروەری دەژمێررێت، بەڵام گەر دیاریکردنی نەگونجاو بوو، هەروەها فرەیی روو لە دیدی قازیەوە یەکسان بوو، دەکرێت دەقەکە لێکدانەوەی بۆ بکرێت بەپێی ئەوەی لەسەر قازی پێویست دەبێت ئەو رووە پارسەنگ بکات کە بەرژەوەندی تۆمەتباری تێدایە و بە بنەمای(شك لە بەرژەوەندی کەسی تۆمەتبار لێکدانەوەی بۆ دەکرێت) کار بکات، چونکە بنەڕەت لە کاروکردەوەکاندا موباح بوونە[1].

**ئامرازە دیاریکراوەکانی قازی لەسەر شرۆڤەی دەقەکان:**

لەسەر قازی پێویستە لە شرۆڤەی دەقەکاندا ئەم خاڵانە بەهەند وەربگرێت:

١. بەهەند وەرگرتنی هاوشێوەیی سیستمیانە کە دلوا دەکات دەق لە شوێنی دیاریکراوی خۆی دابنرێت لە ئامێزی سستمێکی یاساییدا وەك کارکردن بە گۆکراوی دەق یان تێگەیشتنی تەبا یان تێگەیشتنی ناتەبا(پێچەوانە) یان ئاماژەی دەق و یان ئاماژەی شاراوە و خێرای دەق و دلواکاری دەق وەك پێشتر باس کراوە.

٢. بایەخپێدانی مێژوویی: کە دلوای گەڕانەوە بۆ ئەسڵە مێژووییەکان دەکات لەپێناو دەقدا وەك لە مادەی(١/٦٠٣) لە یاسای مەدەنی عێراقی راوەستاو: (بەخشش لە گوازراوەدا نایەتە دی بە دەست بەسەرداگرتن نەبێت)، لێکدەرەوانی یاسای مەدەنی عێراقی رووبەرووی هەڵبوونەتەوە لە شرۆڤەی"لا تتم-نایەتە دی" بە"لا تنعقد- دانامەزرێت"لێکیان داوەتەوە، گەر بگەڕاینەوە بۆ سەرچاوەی مێژوویی ئەم مادەیە کە بریتییە لە فیقهی ئیسلامی دەیانبینی کە مەبەست بە "لا تتم" لە رووی ئاسەوارەوە

[1] د. محمود نجيب حسني / المرجع السابق / ص٦٠ ومايليها

وەک: بەخشش دادەمەزرێ و هەندێ ئاسەواری لێوە پەیدا دەبێت کە بریتییە لە پابەندبوونی بەخشەر بە رادەستکردنی بەخشراو بۆ پێبەخشراوەکە، بەلاّم هەندێ ئاسەواری تر بەرهەم ناهێنێت کە بریتییە لە مافەکان وەک گواستنەوەی مولکییەتی بەخشراو بۆ پێبەخشراوەکە بەر لە دەست بەسەرداگرتن مافی ئەوەی نییە تاوتوێکاری تێدا بکات.

بینا لەسەر ئەوە "هاتنەدی تەواو" بۆ ئاسەوارە نەک بۆ رەگەزەکان، چونکە دەست بەسەرداگرتن نە مەرجە و نە پایە بۆ دامەزرانی گرێبەستێکی بەرجەستە کە بریتین لە (خەلاّت، قەرز، بارمتە، خواستن،...)، دەستگرتن بەسەر شتەکەدا مەرجە بۆ تەواویی ئاسەواری ئەم گرێبەستانە، رەگەزێک نییە تیایدا وەک ئەو کەسەی کە بە هەڵەداچووە لە پێناسەی گرێبەستی بەرجەستەیی بەوەی بۆ دامەزرانی گرێبەستەکە بەتەنها رازی بوونی هەردوو لا بەس نییە، بەڵکو لەسەر دەستگرتن بەسەر ئەو شتەی کە گرێبەستی بۆ کراوە دادەمەزرێت.

بایەخپێدانی کۆمەڵایەتی: وەک پەیبردن بە دووتوێی کۆمەڵایەتی کە پێویستبوونی دەقی دەرهاوێشتووە بەوەی لە واقیعی کۆمەڵ تێرابمێنرێت کە لەسەری بووە لە کاتی یاسادانانی و ئەو واقیعە دوای ئەو یاسادانانەی کردووە، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ بیربۆزەی فەیلەسوفی فەرەنسی(مونتسکیو) کە پوختەکەی بریتییە لە: یاسای هیچ کۆمەڵگەیەک بۆ کۆمەڵگەیەکی تر شیاو نییە، چونکە یاسا پێویستە لە واقیعی کۆمەڵگە و داواکارییەکان و پێویستییەکانی ژیانییەوە هەڵبگوزرێت لە هەموو کات و شوێنێکدا[1]

٤. ئیعتیباری ئامانجدار: کە دوای گەڕان بەدوای هۆی ئامانجدار و حیکمەتی بڕیاری دەق دەکات، بۆ نموونە لەباربردن حەرامە، بەلاّم وشەیەکی ناروون و لێڵە بەهۆی گشتگیری ماناکەی بۆ لەباربردنی کۆرپە لە هێلکەیەکی پیتراوەوە تا چرکەساتی پێش لەدایکبوون، خودا-سبحانه وتعالى- بۆ قۆناغەکانی دروستکردنی مرۆڤ دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ مِن سُلَالَةٍ مِّن طِينٍ، ثُمَّ جَعَلْنَاهُ نُطْفَةً فِي قَرَارٍ مَّكِينٍ، ثُمَّ خَلَقْنَا النُّطْفَةَ عَلَقَةً فَخَلَقْنَا

[1] روح الشرائع / مونتسکیو / ١١٩ /١

الْعَلَقَةَ مُضْغَةً فَخَلَقْنَا الْمُضْغَةَ عِظَاماً فَكَسَوْنَا الْعِظَامَ لَحْماً ثُمَّ أَنشَأْنَاهُ خَلْقاً آخَرَ فَتَبَارَكَ اللَّهُ أَحْسَنُ الْخَالِقِينَ﴾[1]

بە دلواکاری ئەم ئایەتە و لەبەر رۆشنایی زانستی نوێدا مرۆڤ بەم قۆناغانەی دروستکردندا تێدەپەرێت:

١. پاڵفتەیەك لە قوڕ
٢. قۆناغی پیتاندن لە نێوان سپێرم و هێلکەدا.
٣. هەڵواسراو(پارچە خوێنێکی بەسترلو)
٤. جوولو(پارچە گۆشتێك بە ئەندازەی شتێکی جوولو لە دەمدا)
٥. قۆناغی دروستبوونی ئێسك
٦. قۆناغی داپۆشینی ئێسك بە گۆشت دوای تێپەربوونی (١٢٠) رۆژ بەسەر پیتاندندا
٧. قۆناغی وەرگەڕان لە ژیانی رووەکییەوە بۆ ژیانی مرۆیی.
٨. قۆناغی کامڵ بوون و ئامادەبوون بۆ لەدایکبوون.

یاساناسان جیاوازی کەوتۆتە نێوانیانەوە لە دیاریکردنی قۆناغی حەرامکردنی لەباربردن، ئایا لەبربردن هەموو قۆناغەکان ئاماژە بۆکراوەکان دەگرێتەوە، لە پیتاندنەوە بۆ لەدایکبوون، یان تەنها قۆناغێکی دیاریکراوی ئەم قۆناغانەیە، وەك قۆناغی دوای وەرگەڕان و گواستنەوە لە ژیانی رووەکییەوە بۆ ژیانی مرۆیی؟

بەڵام گەر لە هۆی ئامانجداری دروستبوونی مرۆڤ وردببینەوە و سەرنج بدەین لە حیکمەتی پارێزگاری لە رێزگرتنی مرۆڤ و فەلسەفەی پاراستن لەسەر نادروستیی بڕینی قۆناغەکانی کۆرپەلە لە پیتاندنەوە بۆ لەدایکبوون روون دەبێتەوە لەباربردن هەموو قۆناغەکان دەگرێتەوە لە پیتاندنەوە بۆ لەدایکبوون.

---

[1] سورة المؤمن / ١٢ — ١٤

# باسی دووەم:
# تەئویل

تەئویل لە زماندا بریتییە لە ڕۆشنکردنەوەی ئەوەی کاروبارەکان دەگەڕێنەوە بۆ لای، لە وشـەی "الأول-یەکەم" داتاشراوە، واتە گەڕانەوە بۆ سەر بنەڕەت، دەوترێت"أوله إليه" واتـە گەڕاندیانـەوە بۆ لای، هەروەها بە مانای "التفسير والمصير"یش[1] هاتووە، واتە شرۆڤە و سەرئەنجام.

لەوانە ئایەتی: ﴿ذَلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلاً﴾[2]، تـەئویل لـە تیۆلۆجی(ئیلاهیـات)دا بریتییـە لـە شرۆڤەکردنی کتێبە پیرۆزەکان بە شرۆڤەیەکی ڕاستەقینە یان مەجازی، پەردە لەسەر مانـا شـاراوە بەمەرامگیراوەکان لادەبات.

لە زاراوەی فەلسەفیدا تەئویل بریتییە لە باس و لێکۆڵینەوە و گەڕان بـەدوای هـۆی شـتەکان بـۆ بەرزبوونـەوە لێیـەوە بـۆ لای هـۆی یەکـەم کـە "الله"یـە[3]، لـە زاراوەی زانایـانی ئوسـوڵی فیقـه و یاساناساندا بریتییە لە: لادانی وشە لە مانا رووالەتییە پارسەنگەکەی بۆ مانایـەکی تـری ناپارسـەنگ کە هەڵیدەگرێت، چونکە نەگونجان و زەرورەت و بەرژەوەنـدی و دڵنیـەروەری بـانگی بـۆ دەکـەن، هەروەها هاوشێوەکانی ئەمانە وەك لێکدانەوەی وشەکە بە مانـای مـەجازی گـەر مانـای ڕاسـتەقینە گونجاو نەبوو[4].

---

[1] لسان العرب/ فصل الالف حرف اللام، معجم المفردات الفاظ القرآن للعلامة الراغب الأصفهاني/ ص ٢٧

[2] سورة النساء / ٥٩ وتتمة الاية ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ أَطِيعُواْ اللّهَ وَأَطِيعُواْ الرَّسُولَ وَأُوْلِي الأَمْرِ مِنكُمْ فَإِن تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللّهِ وَالرَّسُولِ إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ ذَلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلاً﴾.

[3] المعجم الفلسفي — المرجع السابق / ١ / ٢٣٤

[4] لە ڕێسا گشتییەکان (گەر ڕاستەقینە گونجاو نەبوو بادەدەینەوە بـە لای مـەجازدا) مجلـة الاحکـام العدليـة /المادة ٦١

بنەڕەت لە قسەکردندا تەئویل نەکردنە، بەڵام گەر پێویستی یان بەرژەوەندی یان دڵپەروەری دڵوای کرد ئەو کات بە پێچەوانەی ئەو بنەڕەتەوە هەنگاوهەڵدەگیرێت[1].

## بوارەکانی تەئویل:

تەئویل دەچێتە ناو تایبەتی وشەوە نەك گشتی وشە، کە زیاتر لە مانا و حوکمێك لەئامێز دەگرن[2].

## مەرجەکانی تەئویل:

کۆمەڵێك مەرج بۆ تەئویل هەیە، گرنگترینیان:

١. گونجاویی وشەکە بۆ تەئویل کردن، بەوەی زیاتر لە مانایەك(حوکمێك)ی هەبێت، گەر ئامازەکەی بڕاوە بوو بواری تەئویل کردن بوونی نییە، خودا–سبحانه وتعالى– دەفەرموێت: ﴿وَلَكُمْ نِصْفُ مَا تَرَكَ أَزْوَاجُكُمْ إِن لَّمْ يَكُن لَّهُنَّ وَلَدٌ﴾[3]، واتە گەر لە ئەو و لە مێردێکی تر منداڵی نەبێت.

٢. تەئویلەکە تەبابێت لەگەڵ نۆخی زمان یان بەکارهێنانی باو بۆ زاراوەرێژی شەرع یان یاسا، بەوەی ئەو مانایەی وشەکەی بۆ دەگەڕێتەوە لەو مانایانە بێت کە وشەکە هەڵیدەگرێت و ئامازەی بۆ دەکات، گەر لە ڕێگەی مەجازیشەوە بێت، گەر لەو مانایانە بوو کە وشەکە هەڵینەدەگرت و لە هیچ ڕوویەکەوە ئامازەی بۆ نەدەکرد ئەوا تەئویلەکە دروست نییە.

٣. ڕاستبوونەوەی بەڵگەیەکی شەرعی یان یاسایی لەسەر ویستی خاوەن شەرع یان یاسادانەر بۆ مانا تەئویلکراوەکە، واتە پێویستە تەئویل لەسەر بنەمایەکی شەرعی یان یاسایی شان دڵبدات کە لادانی وشەکە لە مانا ئاشکراکەی بۆ مانایەکی تر پاساو بدات[4].

٤. لە زانایەکی لێوەشاوە و شایستەوە تەئویلەکە دەرچوووبێت، چونکە تەئویل پرۆسەیەکی ئیجتیهادییە.

---

[1] موسوعة القضاء والفقه / ص ٢٨٨

[2] پێچەوانەی ئەوانەی وا گومان دەبەن تایبەتکردنی گشتی و سنووردارکردنی ڕەها تەئویلە

[3] سورة النساء / ١٢

[4] موسوعةالقضاء والفقه ص ٤٩٠

٥. وشەکە مانا ئاشکراکەی هەڵنەگرێت و بۆی شیاو نەبێت[١].

## جۆرەکانی تەئویل:

تەئویل بەپێی دروستی و نادروستی: یان دروست و قبوولکراوە گەر مەرجەکانی بەدیهاتبوون، یان نادروست و قبوولْ نەکراوە گەر مەرجێك لە مەرجەکانی لێ دواکەوت.

تەئویلی دروست بەپێی هەلگرتنی زمان بۆی بۆ نزیك و دوور دابەش دەبێت:

أ. تەئویلی نزیك: ئەوەی دەکەوێتە بەر زەین و بۆ جێگیرکردنی کەمترین بەڵگە بەسە بۆی، وەك هەلگرتنی وشەی "الأب–باوك" بۆ مانای "الجد–باپیر" و هەلگرتنی وشەی "الأم–دایك" بۆ مانای "الجدة–داپیر" لە میراتدا، وەك ئەم ئایەتە پیرۆزە: ﴿وَلأَبَوَيْهِ لِكُلِّ وَاحِدٍ مِّنْهُمَا السُّدُسُ مِمَّا تَرَكَ إِن كَانَ لَهُ وَلَدٌ﴾. [٢]، هەر کەس بمرێت و باپیر و داپیر بەجێبهێڵێت و باوك و دایکی نەبێت بۆ هەریەکەیان شەش یەك هەیە، گەر کەسەکە کوڕی لێ بەجێمابوو.

هەروەها وەك فەرموودەکەی پێغەمبەر(ﷺ): ((إذا حكم الحاكم فاجتهد فأصاب فله أجران وإذا حكم وأخطأ فله إجر)) ، ئەو بەشەی فەرموودەکە "إذا حكم" تەئویل دەکرێت بە مانای "إذا أراد أن يحكم–گەر ویستی حوکم دەربکات"، چونکە ئیجتیهاد بەر لە حوکمدانە نەك دوای حوکمدان.

ب. تەئویلی دوور: ئەوەیە کە ناکەوێتە بەر زەین و ئاتاجی پارسەنگێکە پارسەنگی بکات و لە مانا رووالەتییەکەی لابدات، تاکو تەئویلەکە قبوولکراو بێت، وەك تەئویلی حەنەفییەکان لە بابەتی کەفارەتدا، وەك ئایەتی: ﴿فَإِطْعَامُ سِتِّينَ مِسْكِيناً﴾[٣]، بەوەی مانای شەست گەدا یان یەك هەژار لە شەست رۆژدا هەڵدەگرێت، دەڵێن: مەبەستەکە پێدانی خواردنی شەست

---

[١] الموسوعة الفقهية الميسرة /د. محمد رواس قلعة جي / ١ / ٤٠٥

[٢] سورة النساء / ١١

[٣] تەواوکەری ئایەتەکە (والذين يظاهرون من نسائهم ثم يعودون لما قالوا فتحرير رقبة من قبل ان يتماسا ذلكم يوعظون به والله بما تعملون خبير فمن لم يجد فصيام شهرين متتابعين من قبل ان يتماسا فمن لم يستطع فاطعام ستين مسكينا ذلك لتؤمنوا بالله ورسوله وتلك حدود الله وللكافرين عذاب اليم) سورة المجادلة / ٣ و٤

گەدلیە، لەسەر ئەو بنچینەی کە پێویستی یەک گەدا لە شەست رۆژدا وەک پێویستی شەست گەدا ولیە لە یەک رۆژدا.

فەقیهەکانی تر جگە لە حەنەفییەکان دەڵێن: ئەمە تەئویلێکی دوورە، چونکە بە مەرلمگرتنی وشەی "طعام-خۆراك"ە لە تەئویلەکەدا کە لە ئایەتەکەدا نەهاتووە، و سڕینەوەی وشەیەکە کە لە دەقەکەدا هاتووە ئەویش وشەی "ستین-شەست"ە.

پاشان دەڵێن: (خواردن دان بە شەست گەدا لە رۆژێکدا زیندووکردنەوەی دەستەیەکە لە باوەڕدلران و بێنیاز کردنیانە لە رۆژێکدا، لەو رۆژەدا بۆ خودا گەردنکەچ دەبن و دەپاڕێنەوە و دەبنە کۆمەککاری یەکتر بۆ عیبادەت کردنی خودا و دوعاکردن بۆ ئەو کەسەی کەفارەتەکەی لەسەر پێویست بووە، خودا لێی خۆش دەبێت و سوود و قازانجەکەی گشتگیر دەبێت، دیسان لە تەئویلەکانی حەنەفییەکان بۆ فەرموودەکەی پێغەمبەر(ﷺ) لە بابەتی زەکاتی مەردا: (لە هەر چل کاوڕێك کاوڕێك بەوەی نرخەکەی بگرێتە خۆ، وتیان: مەبەست بە کاوڕ خودی کاوڕ و نرخی کاوڕەکەیە بە نرخی بازاڕ، لەسەر ئەو بنچینەی کە حیکمەتی ولجب بوونی زەکات پڕکردنەوەی پێویستی هەژارە، ئەم پێویستییە وەك چۆن بە خودی کاوڕەکە پڕ دەکرێتەوە بە نرخەکەشی پڕ دەکرێتەوە، لە دیدگای ئێمەوە حەنەفییەکان پێکاویانە و تەئویلەکە تەئویلێکی دوور نییە، چونکە ئەو هەژارەی کە کاوڕێك وەردەگرێت زۆرجار خودی کاوڕەکەی ناوێت، بەڵکو بۆ فرۆشتنی دەوێت بۆ پڕکردنەوەی پێویستییەکانی بە بەهای کاوڕەکە، گەر بەهای راستەقینە درا بە هەژاران ئەوە بۆ ئەوان باشترە تا رەوانە کردنی بۆ بازاڕ و فرۆشتنی کاوڕەکە)

## لە جێبەجێ کردنەکانی تەئویل لە یاسادا:

تەئویل کردنی وشەی "الولد-کوڕ"لە ئایەتەکەدا بەجۆرێك کوڕی کوڕیش بگرێتەوە، هەرچەند لە مادەی(١/٧٤)ی یاسای باری کەسێتی عێراقی رلوەستاودا هاتووە کە دەقەکەی دەڵێت: (گەر منداڵێك مرد کوڕ بێت یان کچ بێت پێش مردنی باوکی یان دایکی ئەوا لە حوکمی زیندوواندا دادەنرێت لە کاتی مردنی هەریەك لەو دوانە، شایستەبوونەکانی لە میرات دەگوێزرێتەوە بۆ منداڵەکانی نێر بن یان مێ بەپێی حوکمە شەرعییەکان لەو رووانگەوە کە وەسێتی ولجبکرلوە بە مەرجێك سێ یەکی لێجێماو تێنەپەڕێنێت)

ئەم دەقە بە گۆکرلو و ژنەورلوییەوە ئاماژە بۆ ئەم حوکمانە دەکات:

١. پێویستە لەسەر هەموو کەسێك بەر لە مردنی وەسێت بۆ منداڵی ئەو کورەی بکات کە مردووە لە ژیانی ئەودا، لەسەر ئەوەش بێبەشبوونی لە لێجێماو سەرهەڵدەدات لە رێگەی میراتەوە بەهۆی بوونی منداڵی کوڕ و کچەوە کە مەحرومیان دەکەن لە میرات.

٢. گەر بمرێت و وەسێتی نەکردبێت قازی لە جێگەی ئەو بۆ ئەو کارە دادەنیشێت بەپێی یاسای وەرگیراو لە بۆچوونی هەندێ لە فەقیهەکانی موسڵمانان لەوانە زاهیریەکان[1]

٣. وەسێت وەك بەشی مردووەکە وایە لە باوکە مردوەکەی کوڕەزاکاندا، گەر رۆڵەی کوڕ بن، هەروەها بەشی دایکی مردوویان گەر رۆڵەی کچ بن، بەڵام ئەم بەشە لە راستییەکەیدا وەسێتە و حوکمی وەسێتی بەسەردا جاری دەبێت، بۆیە پێویستە زیاتر نەبێت لە سێیەکی لێجێماو، مەگەر بە مۆڵەتی میراتگران لە دوای مردنی میرات لێگیراو، نەك لەژیانیدا تاکو لە ناچارکردنی ئەدەبی دووربخرێتەوە.

٤. لەباری دابەش کردنی لێجێماودا و دیاریکردنی بەشەکانی میرات، وادادەنرێت کەسی مردوو(باوك و دایك و نەوە(کوڕەزا)) هێشتا لە ژیاندا ماون و لەسەر میراتگران سەرژمێری میراتگری زیندوویان بۆ دەکرێت، لەبەر رۆشنایی ئەم دانانەدا بەشەکەی بڕیاری لێ دەدرێت، پاشان راستەوخۆ دەچێت بۆ ئەوانەی لە دوای ئەو بەجێماون لە کوڕ و لە کچ.

## مەرجەکانی جێبەجێ کردنی وەسێت واجبە:

بۆ جێبەجێ کردنی وەسێتی واجب لەسەر قازی پێویستە رەچاوی ئەم مەرجانە بکات:

١.کوڕەکان لەگەڵ رۆڵەکانیاندا کۆبکاتەوە، چونکە کوڕەزا گەر لەگەڵ کچی مردوودا یان کوڕی مردوو کۆنەبنەوە ئەوا شایستەی لێجێماو لە رێگەی میراتەوە بەبێ وەسێتی واجب، گەر کوڕەزا بێبەش نەکرێت، گەر بێبەش کرا لە رێگەی وەسێتی واجبەوە وەردەگیرێت.

٢.کەسی مردوو(باپیر یان داپیری کوڕەزاکان) لە ژیانیدا بەشی کوڕەزاکانی نەدابێت بەبێ باربووکردنەوەیەك کە یەکسان بێت بە بڕی وەسێتە واجبەکە لە رێگەی بەخششەوە، ئەگەر نە، ئەوا بەشی خۆیان لە رێگەی وەسێتی واجبەوە بەدەست ناهێنن، گەر بڕێکی لە ماڵ و سامانی خۆی بەبێ باربووکردنەوە پێ بەخشین، کەمتر لە بەشی وەسێتە واجبەکە

[1] المحلی/٩ /٣١٤

ئەوا ئەو برە لە ڕێگەی وەسێتی ولجبەوە تەولو دەکرێت، ئـەم مەرجـە یاسـادانەری عێراقـی پشتگوێی خستووە، لەسەر ئەوەش تەولوی یاساڕێژییەکانی دەوڵەتە عەرەبییەکان[1].

٣. گەر نەوە(کوڕەزا) نێـر و مـێ پێکـەوە وەسـێتی ولجبیـان بەسـەردا دابـەش بکرێـت بـەپێی ڕێسای(بۆ هەر نێرێك بە ئەندازەی بەشی دوو مێ) چونکە شایسـەتەبوون وەك مـیرات وایـە بۆیـە ناچـێتە ژێـر حوکمـەکانی وەسـێتکردنەوە کـە لێیـەوە دابەشـکردنەکە بەسـەر وەسـێتبۆکراواندا بـە یەکسـانی ئـەنجام دەدرێـت، گـەر وەسـێتکەرەکە پێچـەوانەی ئـەوە وەسێتی نەکردبێت.

٤.کوڕەزا بکوژی باپیر و داپیری مردوو نەبێت، هەروەها بکوژی دایك و بـاوکی مـردووی خـۆی نەبێت، ئـەم مەرجـە لـە برگـەی دووەم لـە مـادەی (٦٨) یاسـای بـاری کەسـێتی عێراقـی راوەستاو وەرگیراوە: (بەمەرجدەگیرێت کەسەکە بکوژی وەسێتکەرەکە نەبێت)

٥. وەسێت زیاتر نەبێت لە سێ یەکی لێجێماو، وشەی "الولد" لە نێـر و مێـی کـوڕەزا پێویسـتە تەئویل بکرێت بۆ منداڵی کوڕەزا و منداڵی منداڵی کوڕەزا با زیاتریش شۆڕبیبێتەوە.

هەنـدێ لـە یاسـادانانی جیهـانی عـەرەبی ئـەم گشـتگیرییەیان بـە دەق هێنـاوە، وەك مادەی(١/٢٥٧) لە یاسای باری کەسێتی سوری کە بە دەق هـاتووە: (هـەر کـەس مرد و منـداڵی هەبوو و ئەو کوڕە بەر لە ئەو(بەر لە باوکی) یـان لەگـەڵ ئـەو مربـوو، بـۆ کوڕەزاکـانی سـێ یـەکی لێجێماوی وەسیتەکەیان بۆ ولجب دەبێت، ئەم وەسێتەش بـۆ منـداڵی کوڕەکـەی و منـداڵی کـوڕی کوڕەکەی شۆڕدەبێتەوە)

تێبینی دەکرێت لەسەر ئەم یاسایە کە دانی نـەناوە بـە وەسـێتی ولجبـدا بـۆ منـداڵی کچـەکەی ئەمەش هەڵەیەکە جێگەی لێخۆشبوون نییە[2].

هەروەها لە پیادە کردنەکانی لە باری کەسێتیدا تەئویلی مەرجی هاتوو لە مادەی حەوتـەم: (لـە تەولویی لێوەشاوەیی هاوسەرگیری: ئەقڵ و تەولوکردنی هەژدە ساڵ بەمەرج دەگیرێت) بە مـەرجی

---

[1] وەك یاسای باری کەسێتی سوری(٢٥٧/ب) (یان لە ژیانیدا وەسێتی بۆ کردبن یـان پێیبەخشـی بـن بـەبێ بەرانبەری برێك لەوەی شایستەن پێی لە ڕێگەی ئەو وەسێتە پێویستەوە، گەر بە کەمتر لەوە وەسێتی بۆ کردن پێویستە تەولو بکرێت)

[2] لمزيد من التفصيل ينظر مؤلفنا احكام الميراث والوصية وحق الانتقال في الفقه الاسلامي المقارن والقانون / ص ٤٢ ومابليها

پابەندبوون بەبێ مەرجی دامەزراندن و دروستی، ئەم سنووردارکردنە تەنها بۆ لایەنی ڕێکخستنە، ئەگەر نە، قەزای عێراقی دان دەنێت بە هاوسەرگیری کەمتر لە هەژدە سالّدا، هەروەها لە جێبەجێ کردنەکانی لە هەمان یاسادا تەئویلی(مادەی نۆ/١) کە دەقەکەی دەڵێت: (هیچ خزم و بێگانەیەک مافی ئەوەی نییە کەسێك نێر بێت یان مێ ناچار بکات بە هاوسەرگیری بەبێ ڕەزامەندی خۆی، و گرێبەستی هاوسەرگیرییەکە پووچ دەکرێتەوە گەر نەچووبنە لای یەکتر).

پێویستە لەسەر قازی وشەی "باطلا–پووچەڵ" لە دەقەکەدا بە "الفاسد–تێکدەر" یان "ڕاگیراو" تەئویل بکات، چونکە "تێکچوو" بەهۆی زۆرلێکردنەوە وەك "ڕاگیراو" وایە، مۆڵەتی بەدوادا دێت، بە پێچەوانەی "پووچەڵ"ەوە یاسایەك نییە لە هەموو دەوڵەتانی جیهاندا بگاتە ئەو ئەنجامەی کە "پووچەڵ" دەگۆڕێت بۆ "دروست بە مۆڵەت" چونکە "پووچەڵ" و "نەبوو" یەکسانن.

سەرباری ئەمە پێویستە چوونە لای یەکتر بە زۆر نەبێت، ئەگەر نە، لە کەسی زۆرلێکراوەوە بۆ هاوسەرگیری بە مۆڵەت دانانرێت.

لە جێبەجێ کردنەکانی تەئویل لە یاسای سزادا تەئویل کردنی "اللیل–شەو" بەو تاریکییەی کە پێی دەوترێت"السجی یان الدجی–پەردە و ڕەشی" بەهۆی دانانی بە ڕەوشێکی توند لە تاوانی دزی لە مادەی (٤٤٠) لە یاسای سزاکانی عێراقی ڕاوەستاو کە دەقەکەی دەڵێت: (هەر کەس دزییەکی کرد ئەم ڕەوشانەی تێدا بوو: ١.لە نێوان خۆرئاوابوون و خۆرهەڵاهاتندا ڕوویدابێت بە بەندکردنی هەتاهەتایی یان کاتی سزا دەدرێت).

بۆیە پێویستە بە "تاریکی" تەئویل بکرێت، تاکو حیکمەتی ئەوە بێتە دی کە بریتییە لە: ترس و نامۆبوون لە دۆخی تاریکی شەودا.

لەبەر ئەوەی جیاوازییەك نییە لە ئەنجامدانی تاواندا لەنێوان ڕۆژ و نێوان ئەو کاتەی دەکەوێتە نێوان کەمێك دوای خۆرئاوابوون و تاوێك پێش خۆرهەڵهاتن بە نزیکی چارەکێك یان زیاتر، بۆیە ئەنجامدانی تاوانی دزی لەو ماوەیەدا پێش خۆرهەڵهاتن بە کەمێك و دوای خۆرهەڵهاتن بە کەمێك وەك ئەوە وایە لە ڕۆژدا ئەنجامی دابێت.

## بەراورد لە نێوان تەئویل و شرۆڤە:

تەئویل و شرۆڤە–بەدەر لە شرۆڤەی یاسادانان– لەم بارانەدا لەگەڵ یەکتر کۆك و تەبان:

أ. هەردووکیان کردەیەکی ئیجتیهادین رووی تێدەکرێت لە پێناو بەدیهاتنی دادپەروەریدا.

ب. بواری هەر یەکێکیان لەو دەقانەدا کورتدەبێتەوە کە گومان ئاماژەن(ظني الدلالة) گەر دەقەکە ئاماژەکەی براوە بوو(قطعي الدلالة) لەسەر(مانا یان حوکم) ئەوا لەو شوێنەدا بواری ئیجتیهاد بوونی نییە لە پێناو شرۆڤەکردن یان تەئویل کردندا، وەك ئەو رێسایەی کە دەقەکەی: (بە بوونی دەق ئیجتیهاد گونجاو نییە[1]). بۆیە دەق گەر گومان ئاماژە بوو شیاوە تەئویل و شرۆڤەی بۆ بکرێت، جا دەقەکە لەرووی جێگیرکردنەوە براوە بێت(قطعي الثبوت) بەوەی بەشێك بێت لە قورئان یاخود گومانئامێز بێت لە رووی جێگیرکردنەوە(ظني الثبوت)، وەك لە فەرموودەی ئاحادی سوننەتی پێغەمبەردا هاتووە.

ج. هەر یەکەیان پێویستیان بە بەلگەیەکی شەرعی یان پاڵپشتێکی یاسایی هەیە پاساوی بدات، چونکە تەئویل یان شرۆڤە پێچەوانەی بنەڕەتە.

سەرەڕای کۆکبوون و تەبابوونیان لەو خاڵە ئاماژە بۆکراوانەدا لە زۆرێك شتی جەوهەری تردا جیاوازن لەوانە:

١. لەرووی چییەتی(الماهیة)وە: چییەتی شرۆڤە کردەیەکی زەینی هزرییە لەلای موجتەهیدەوە بۆ رۆشنکردنەوەی دەقێك کە جێبەجێکردنی واجبە ئەگەر رۆشن و روون نەبوو، لە کاتێکدا تەئویل بریتییە لە لادانی وشەکە لە مانای دیاری پارسەنگی بۆ مانایەکی ناپەرسەنگ کە هەڵدەگرێت لەبەر ئەو پێویستییە یان ئەو بەرژەوەندییە یان ئەو دادپەروەرییەی داوای دەکات.

٢. لە رووی سەرچاوەوە: ئاسۆی شرۆڤە بەرینترە لە تەئویل، بۆیە تەئویل لە فەقیهەوە یان لە قازییەوە دەبێت، نەك لە یاسادانەر و پێشکەوتنی زانستی، وێنا ناکرێت یاسادانەر پەنا بیات بۆ تەئویلی قسەی خۆی، بە پێچەوانەی شرۆڤەوە.

٣. لە رووی ئامرازەوە: ئەو ئامرازانەی هەر یەك لە شرۆڤەکار و تەئویلکەر پەنای پێ دەبەن لەیەکتر جیاوازن، کەسی شرۆڤەکار هەندێ جار پەنا دەبات بۆ دەقێکی تری نزیك لەو دەقە، یان هەندێ جار پەنا دەبات بە هۆکەلێکی پێویست، یان پەنا دەبات بە یادلشتی

---

[1] مادەی دووەم لە یاسای مەدەنی عێراقی بەرکار.

ڕۆشنکەرەوە، یـان هاوشـێوەی ئەمانـە لـە ئامرازەکـانی تـر[1]، ئەمـە لـە کاتێکـدا کەسـی تەئویلکەر پەنا دەبات بە شتێك کە لادان لـە پارسـەنگی ڕۆشـن بۆ ناپەرسـەنگ پاسـاودار بکات، بەهۆی پێویستییەکەوە یان بەرژەوەندییەك، یان هاوشێوەکانی ئەمانە.

٤. لە ڕووی پاساودارییەوە: پاساو بۆ شرۆڤە بریتییە لە نارۆشنی ئاماژەی دەق لەسەر حوکمی ویستراو بـە ئاماژەیـەکی ڕۆشـنی ڕاشـکاو، لـە کاتێکـدا پاسـاو بـۆ تـەئویل بریتییـە لـە ڕەچاوکردنی دادپەروەری یان بەرژەوەندی یان پێویستی، یان هاوشێوەکانی ئەمانە.

٥. لە ڕووی پابەندکردن و پابەندبوونەوە: قازی پابەندکراوە بە پەنابردن بۆ شرۆڤە بەتایبـەت لـە پرسە مەدەنییەکاندا، بۆیە مافی ئەو نییە ڕێگری بکـات لـە پیـادە کردنـی دەق بـە بیـانووی نارۆشنبوونی، چـونکە ئـەو کاتـە بـە پێشـێلکاری دادپـەروەری دادەنرێـت، بـە پێچـەوانەی تەئویلەوە گەر قازی ڕێگری لێ کرد پرسیاری لـێ ناکرێـت و لەسـەری دادگـایی ناکرێـت نـە مەدەنی و نە سزایی و نە ئایینی و نە قەزایی.

٦. شرۆڤەی یاسادانان: بەهۆی پێشەکاریگەری(أثر رجعي)ەوە دەبێـت بـۆ مێـژووی دەقێکـی شرۆڤەکراو لە کاتێکدا تەئویل بەکارناهێنرێت بۆ داهاتوو نەبێت.

٧. لەڕووی جۆرەوە: شرۆڤە دابـەش دەبێـت بـۆ یاسـادانان و فیقهـی و قـەزایی و زانسـتی، لـە کاتێکدا تەئویل دابەش دەبێت بۆ نزیك و دوور.

٨. لە شرۆڤەدا کار بە خودی شرۆڤەکراو دەکرێت، لە کاتێکدا لە تەئویلـدا مانـا بنەڕەتییەکـە واز لێ دەهێنێت و کار بە مانای هەڵوەردەی پارسەنگ دەکات.

٩. شرۆڤە زۆرجار سەردەکێشێت بۆ بەرینکردنی دەق، گەر ئامرازی بەکاربراو تیایدا پێوانـە یـان بەرژەوەندی بێت، بەڵام ئەم بەرینکردنە کە لە پرسە مەدەنییەکاندا دەستی بۆ دەبرێت، لـە پرسـە سـزاییەکاندا کـاری پـێ ناکرێـت گـەر سەریکێشـێ بـۆ سـەرپێهەڵدانی تاوانێـك یـان سزایەك، چونکە تاوان و سزا بوونیان نییە بـە یاسـا نـەبێت، بـە پێچـەوانەی تەئویلـەوە کـە زۆرجار سەردەکێشێت بۆ بەرینکردنی دەقی تەئویلکراو چونکە پێچەوانەی بنەڕەتە و تـەنها

---

[1] لمزيد من الاطلاع على تلك الوسـائل ينظـر تفسـير النصـوص المدنيـة دراسـة مقارنـة بـين الفقهـين المـدني والاسلامي للاستاذ الدكتور محمد شريف أحمد/ط٢/ ص٢٩٧ ومايليها.

بۆ بار و دۆخێکی هەلاّوەردەیە، هەلاّوەردەش بۆ پێویستییە، پێویستیش ئەندازەگیری دەکرێت بە ئەندازەی خۆی.

١٠. شرۆڤ وەك چۆن بە قسەیە، هەندێ جاریش بە ئامرازی ڕۆشنکردنەوە، هەندێ جاریتریش بە کارگەلێك و قسەگەلێك، وەك چۆن پێغەمبەر(ﷺ) شرۆڤەی نوێژی کردووە لەدوای ئەوەی فەرمان بە ئەنجامدانی دەکرێت لەلایەن موسڵمانانەوە، دەقە قورئانییەکە پوختە و پاڵفتەیە، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) بە کارەکانی شرۆڤەی کردووە، لەبەردەم کۆمەڵێك خەڵکی زۆردا نوێژی کردووە وەك چۆن خودا فەرمانی پێکردووە، پاشان پێی فەرموون: ((بەو جۆرە نوێژی بکەن کە منتان بینیوە نوێژ دەکەم)). هەر بەو جۆرە وەك هەستاوە بە پیادە دروشمەکانی حەج لە بەردەم خەڵکیدا پاشان پێی فەرموون: ((لە منەوە دروشمەکانتان وەربگرن)) بە پێچەوانەی تەئویلەوە کە تەنها بە قسەیە.

١١. شرۆڤە هەندێجار بە ئاماژەیەکی ژنەوراوە وەك ئاماژەی کەڕ و لاڵ بەپێچەوانەی تەئویلەوە.

١٢. هەندێ جار بێدەنگی والآکردن و شرۆڤەیە، (بۆ مانا یان بۆ حوکم)ی بە مەبەستگیراو، وەك چۆن ڕێسایەکی گشتی شەرعی و یاسایی بە دەق دەڵێت: (بێدەنگی لە میانەی پێویستیدا ڕۆشنکردنەوە و والآکردنە)، بۆ نموونە گەر سەرپەرشتیاری ناکامی جیابوەوە کە لەژێر سەرپەرشتی ئەودایە کاری کڕینەستی قەرەبووکاری ئەنجامدا و بێدەنگ بوو، ئەوا بێدەنگییەکەی بە شرۆڤەی مۆڵەت دەژمێررێت، بۆیە کڕینەستەکە دادەمەزرێت و جێبەجێ دەکرێت و ئاسەوارەکانی لێوە سەرهەڵدەدات لە ماف و ئەرکەکان، بەبێ پێویستی بۆ مۆڵەتی ئەو بەشێوەیەکی ڕاشکاوانە[1]، بە پێچەوانەی تەئویلەوە.

١٣. شرۆڤە بەزۆری بۆ ئاماژە(دال) لەسەر حوکم دەکرێت، لە کاتێکدا تەئویل بەزۆری بۆ ئاماژەبۆکراو(مدلول) دەکرێت.

١٤. لە ڕووی مەرامەوە: مەرام لە تەئویل ڕەچاوکردنی بەرژەوەندی و دادپەروەری و پێویستییە، لە کاتێکدا مەرام لە شرۆڤە دیاریکردنی حوکمی واجب و پیادە کردنییەتی.

---

[1] کشف الاسرار للبزدوي/٣/١٥١، مجلة الاحکام العدلية. / المادة ٦٧

١٥. تەئویل پێچەوانەی بنەڕەتە، بنەڕەت لە قسەدا بریتییە لە کارکردن بە بنەڕەتەکەی و ئاشکرلکەی، و کارنەکردن بە پێچەوانەی بنەڕەتەوە، بە پێچەوانەی شرۆڤەوە کە تەبا و کۆکە لەگەڵ بنەڕەتدا.

١٦. هەندێ جۆری شرۆڤە پابەندکراوە، وەك شرۆڤەی تەشریعی، بە پێچەوانەی تەئویلەوە کە ناپەندکراوە لە هەموو جۆرەکانیدا.

١٧. تەئویل تەنها لە دەق و قسەدا جاری دەبێت، لە کاتێکدا شرۆڤە وەك چۆن بۆ دەقە، هەندێ جاریش بۆ شتانی تری جگە لە دەق، وەك شرۆڤەی قەزاییانە، وەك چۆن دەق دەگرێتەوە چۆناندن و شرۆڤەی رەفتاری یاسایی و رووداوی یاسایی دەگرێتەوە.

هەروەها وەك شرۆڤەی زانستی کە والاکردنی سروشتی بوونە گەردوونییەکان و پەردە لەسەر لادراوەکان لە رێگەی دۆزینەوە زانستییە نوێیەکان و والاکردنی سوودەکانی و زیانەکانی دەگرێتەوە.

## بەراورد و هەڵسەنگاندن لە نێوان چۆناندن و شرۆڤە:

کۆك و تەبان لە دەستەبەرکردنی حوکمێکی دادپەروەر کە لەسەر هەردووکیان وەستاوە، بەڵام جیاواز و پێچەوانەی یەکترن لە چەندین رووەوە، لەوانە:

١. لە رووی چییەتییەوە: چۆناندن پێدانی سیفەتێکی یاساییە بۆ رەفتاری یاسایی یان رووداوی یاسایی بۆ دیاریکردنی دەقێك کە پیادە کردنی پێویستە لە بابەتەکەدا، لە کاتێکدا شرۆڤە بریتییە لە والاکردنی مانای ویستراو لە دەقێك کە کار پێکردنی پێویستە.

٢. چۆناندن پێویستە لە هەموو بارەکاندا، لە کاتێکدا شرۆڤە تەنها لە باری ناڕۆشنی دەقدا دەبێت.

٣. چۆناندن: تەنها لە قازییەوە دەبێت یان لە کەسێك کە لە جێگەی ئەو دادەنیشێت، بە پێچەوانەی شرۆڤەوە کە قازی و کەسانی تریش ئەنجامی دەدەن، وەك پێشتر ئاماژەمان پێدا.

٣. شرۆڤە بەسەر دەقدا دەڕژێت بە پێچەوانەی چۆناندنەوە کە شوێنەکەی بریتییە لە رەفتاری یاسایی و رووداوی یاسایی.

# بەشی پێنجەم

## پەنابردن بۆ کەسانی تر

لێکۆڵینەوەی بابەتەکە بەسەر دوو باسدا دابەش دەبێت:

باسی یەکەم پەنابردن بۆ پزیشکی دادگوزاری.

باسی دووەم پەنابردن بۆ ئەهلی شارەزایی و پسپۆڕی.

# باسی یەکەم:
# پەنابردن بۆ پزیشکی دادگوزاری

بۆ دەستەبەرکردنی دادپەروەری لە پرسە سزاییەکاندا بە زۆری قازی پەنا دەبات بۆ پزیشکی دادگوزاری، چونکە بۆ ئەم سەرچاوەیە گرنگیەکی گەورە هەیە لە چەندین رووەوە، گرنگترینیان ئەمانەن:

## ١. جیاکردنەوەی بوونەهۆی راستەوخۆ لە ناڕاستەوخۆ بۆ مردن:

لە هۆ راستەوخۆکان ئەوەیە کە زیان پێگەیاندن یان ئافەتە برینیەکان بە تەنها بەس بن بۆ روودانی مردنەکە، وەك خوێنبەربوونی دەماغی یان پارچە پارچە بوون یان هاوشێوەکانی ئەمانە لە بەرکەوتنە برینییەکاندا، بۆ نموونە گەر وا دابنێین کەسێك دای لە کەسێکی تر بە ئامێرێکی تیژ و کەسەکە بە کاریگەری ئەوە مرد، دوای توێکاری جەستەکەی رۆشن بوویەوە ئەو زیانە گەورەیە کە ئامێرە بەکاربراوەکە لە دەستدرێژیکردندا سەرپێهەڵداوە بە هۆی راستەوخۆ دەژمێررێت بۆ مردنی تاوانلێکراو.

لە هۆ ناڕاستەوخۆکان هەر وێرانکارییەك لە جەستەدا پەیدا دەبێت کە بەتەنها بەس نەبێت بۆ روودانی مردنەکە، بەڵکو مردنەکە بەهۆی ئافەتێکی نەخۆشی تایبەت بووە بەو کەسە، کەسی لێدراو پێیەوە گرفتار بووە بەر لە روودانی تاوانەکە، هەروەها لە هۆ ناڕاستەوخۆکان ئەوەیە کە پەیوەندی هۆکەرایی لە نێوان کاری تاوان و دەرئەنجامدا دەبرێت، وەك پشتگوێخستن لە چارەسەر و روودانی بەرەو خراپ چوون، بینا لەسەر ئەمە پێویستە لەسەر پزیشك وردبێت لە جیاکردنەوەی نێوان هۆی راستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ بەهۆی جیاوازی رادەی سزا بڕیاردراوەکە لە رووی شەرع و یاساوە بۆ کەسی تاوانبار لە هەردوو بارەکەدا.

### ٢. دیاریکردنی رادەی بەرپرسیاریتی بکەرەکە:

لە رێگەی توێکارییەوە پزیشک دەتوانێت لە بارگەلێکی تایبەتدا بەڵگەی زانستی پێشکەش بکات بۆ روناکردنەوەی لێکۆڵینەوە، بۆ ئەو بەڵگەیە گرنگییەکی لەرادەبەدەر هەیە، لەو رووەوە کە قازی رێگەی پێ رۆشن دەکاتەوە لە کاتی دەرکردنی بریاری قەزاییدا، هەروەها ئەو بەڵگە هونەریانە کۆمەکی دەکەن لەسەر گوناهبارکردنی تۆمەتبار یان بێگوناهی مەیدانەکەی، یان سووککردنی بریارەکە لەسەری، هەر بەو جۆرە پزیشک-کە هەڵدەستێك بە کاری توێکاری- دەتوانێت زیانی هەر ئامێرێکی بریندارکەر بە تەنها دیاری بکات، لەوەی گەر چەندین ئامێر بەکارهێنرابێت لەلایەن زیاتر لە یەك کەس لە تاوانەکەدا، پاشان دیاریکردنی پەیوەندی زیانگەیاندنی هەر یەکێکیان بە تەندروستی مردوەکە، بەپێی رەوشی رووداوەکە و سروشتی تاوانەکە.

### ٣. پشتگوێخستنی چارەسەریی:

پزیشک هەر پشتگوێخستنێکی چارەسەریی کە بۆی روون دەبێتەوە بۆ لێکۆڵەری داد(یان قازی لێکۆڵەر) رۆشن دەکاتەوە، پاشان بریاردەدات لەسەر رادەی پەیوەندی پشتگوێخستنەکە بە مردنی کەسەکەوە، لەسەر ئەم بنچینەیە هەندێ لە دەوڵەتان[1] یاسایان دارشتووە بۆ رێگری لە پزیشکی دادگوزاری لە پیشەی پزیشکییەکەی بە شێوەیەکی تایبەت، بەهۆی دژبەیەکی سیفەتی راوێژکاری و سیفەتی چارەسەری.

### ٤. شاردنەوەی مەشخەڵی تاوان:

ئەوەی زانراوە ئەوەیە کە کەسی تۆمەتبار هەندێ جار هەوڵی سەرلێشێواندنی قازی دەدات بە چەندین هۆکاری دەستەبەر لەلای، مادەی نەوت دەکات بەسەر جەستەی قوربانییەکەدا و دەیسووتێنێ، پزیشکی دادگوزاریش لە رێگەی توێکارییەوە دەگاتە ئەو ئەنجامەی کە سووتان بە شێوەیەکی لابەلا روویداوە و هیچ پەیوەندییەکی بە هۆی مردنەکەوە نییە، لەوانەیە بکوژەکە جەستەی کوژراوەکە هەڵبواسێت تاکو قازی لێکۆڵەر بە

---

[1] وەك لە کۆماری میسری عەرەبیدا پێچەوانەی ئەوەی یاسای عێراقی بەرکار.

هەڵەدا ببات گوایە کەسەکە بە خۆ خنکان خۆی کوشتووە، بەڵام پزیشکی دادگوزاری دەتوانێت جیاکاری بکات لە نێوان راستەقینە و ئەوەی تۆمەتبارەکە پێی هەستاوە بۆ شاردنەوەی واقیع و راستەقینە و لەوێشەوە سەرلێشێوانی لێکۆڵەر یان قازی.

## ٥. کاریگەری(زیندوویی) لێدان:

ئەم حاڵەتی لێدانە پێی دەوترێت زیندوویی(یان کاریگەریی) گەر لە جەستەیەکی زیندوودا روویدا، بە توێکاری جەستەکە پزیشك دەتوانێت زیندوویی و کاریگەری برینەکە لە نەبوونی جیابکاتەوە، هەروەها لە هەمان کاتدا هۆی مردنی راستەقینە دیاری بکات.

لە جێبەجێ کردنەکانی ئەم حاڵەتە رووداوێکی تاوانە کە روویدا، پاشان دەستەی لێکۆڵەران لەناویاندا پزیشکی دادگوزاری بانگکران بۆ پشکنینی جەستەی کەسێك وترابوو بە قەزا و قەدەر مردووە، ئەنجامی دۆزینەوەی دەرەکی ئاشکرا و پشکنینی توێکاری روون بوویەوە کە سووتانەکە لە هەندێ شوێنی دیاریکراوی جەستەی قوربانییەکەدا کاریگەرە، و لە هەندێ شوێنی تردا ناگەریگەر، توێکاری پزیشکی دادگوزاری دەریخست کە هەندێ شت لەناو بۆشایی دەمیدا بووە، ئەوەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی بەهۆی مادەیەکی نا زیرەوە بە زۆر خراوەتە ناو دەمییەوە وەك پارچە قوماشێك، هەر بەو جۆرە پشکنینەکە بوونی لێدانی کاریگەری لەسەر سەری دەرخست بەهۆی ئامێرێکی برەرەوە وەك تەور، دوای ئەوەی ئەم زانیارییە توێکاریانە پێشکەشکرا بە قازی لێکۆڵەر کارەکەی بۆ رۆشن بوویەوە دوای کۆشانێکی زۆر و دەرخستنی ئەوەی رووداوەکە لەخۆی دەگرت لە لێڵی و ناروونی، کاتێك بکەرەکەی گرت دانی بەوەدا نا کە جامەدانەکەی سەری خستۆتە دەمی قوربانییەکەوە تاکو هاوار نەکات و پاشان چەند جارێك تەورەکەی کێشاوە بەسەریدا، و ئاگری لە ئاگردانەکەدا کردۆتەوە لە نزیك سەری کوژراوەکە دوای ئەوەی زانیویەتی مردووە.

هەروەها بۆ پزیشکی دادگوزاری دەرکەوتبوو کەسی لێدراو لەو کاتەدا لە حاڵەتی بێهۆشیدا بووە لە رێگەی بینینی برینی زیندووەوە لەسەر جەستەی، پاشان رۆشن بوویەوە کەسێکی بەکارهێنراو دوای رووداوەکە چووتە ژوورەکە و جامەدانەکەی لە دەمی کوژراوەکە

دەرهێنـاوە، هەناسـەدانێكی دەسـتكردانەی بـۆ ئەنجامـداوە بـەو گومانـەی كـە هێشـتا لـە ژیاندایە، پاشان پۆلیسی لە ڕوودلوەكە ئاگاداركردۆتەوە[1].

## ٦-دیاریكردنی ئاراستەی لێدان:

هەندێ جار داوا لە پزیشكی دادگوزاری دەكرێت ئاراسـتەی لێدانەكـە لەسـەر جەسـتەكە دیاری بكات بـۆ سـوودبینین لێـی تـاكو بزانرێـت بـە كـام دەسـت ئـامێرە بریندارکەرەكـەی گرتووە، وەك لە حاڵەتی لێدانی خۆكوژی یان تاوانكاری یان هەڵبەستراو(دروسـتكراو) یـانبۆ ئەنجامگیری شوێنی تاوانبار، ئایا لەسەر ئاستی بالاتر لە كوژراوەكە یان نزمتر لە كوژراوەكە بووە، لە پێشەوە لێیداوە یان لە دواوە، یان لەلاوە تاكو حاڵەتە خۆكوژییـەكانی لـە حاڵەتـە دەستدرێژییە تاوانكارییەكانی پێ جیابكرێتەوە.

## ٧- دیاریكردنی ئامێری تاوانەكە:

پزیشكی دادگوزاری لە زۆر حاڵەتدا—پاڵپشت بە سیفەتی زیانپێگەیاندنەكـە و شـێوەی و فراوانی و قووڵی و ئاراستەی— دەتوانێت ئەنجامگیری لەو ئامێرە لەتكەرە بكات، ئایـا یـەك دەم بووە یان دوو دەم، شـێوەی ئامێرەكـە لوولـەكی بـووە یـان بازنـەیی بـووە، یـان هـەر شێوەیەكی تر، ئایا ئامێری ئاگرین یەك لولە بووە وەك تفەنگ یان دەمانچە یاخود زیـاتر لـە یەك لوولەی هەبووە وەك تاپڕ، ئەوەی ئاشكرایە دیاریكردنی ئامێری بەكارهاتوو لە جێبەجێ كردنـی تاوانەكـەدا ڕۆڵێكـی گرنگـی هەیـە لـە دیـاریكردنی ڕادەی سـزا پاڵپشـت بـۆ ڕادەی ترسناكی تاوانبار و دڵڕەقی و هەستان بە تاوانەكە.

## ٨- چۆنێتی ڕوودانی لێدان

توێكاری پزیشكی لە زۆرێك لە ڕووداوەكاندا یارمەتیـدەرە بـۆ ئـەنجامگیری سەرچـاوەی زیانپێگەیاندنەكە، یان زانینی شێوازەكەی، بـۆ نموونـە، لـە ڕووداوی ئۆتۆمبێلـدا ئامانجەكـە بریتییە لە زانینی چۆنێتی بەرهەم هاتنی لێدانەكە، ئایـا لـە كـاتی ڕۆیشـتنی ئۆتۆمبێلەكـەدا

[1] ينظر الطب العدلي علما وتطبيقا/الدكتور وصفي محمد علي/ مطبعة المعارف/١٩٧٦/ ١/ ٧٧

روویداوە یان بەریووەتەوە بەسەر ئۆتۆمبێلەکەدا یان بەرهەمی فشارێکی زۆر لەسەر جەستەی بەهۆی هاتنە دواوەی ئۆتۆمبێلەکەوە، یان هاوشێوەکانی ئەمانە کە بەرپرسیارێتی و کەمتەرخەمی شۆفێری ئۆتۆمبێلەکە دیاری دەکات، لەوێشەوە بوونە هۆی مردنی لێدراوەکە.

## ٩- خەملاندنی حالەتی تەندروستی:

خەملاندنی حالەتی تەندروستی لەسەر ئەوەی پزیشکی توێکار پێشکەشی دەکات وەستاوە، لە خەملاندنەکەیدا کە کۆی بینینە توێکارییەکان و پشکنینی تاقیگەیی کە پەنای پێ دەبرێت لەخۆ دەگرێت، ئەوەی ئاشکرایە ئەو حالەتە پێویستە بۆ فەرمانگە فەرمییەکان و کومپانیای دەستەبەرکردن لە بابەتی پابەندبوونیان بە پێدانی باربووی دارایی بۆ میراتگرانی مردووەکە لەدوای دڵنیابوونەوە لەوەی ئایا مردنەکەی لە کاتی هەستان بە کارێکی فەرمانبەری بووە کە پێی راسپێرراوە یان نە، هەروەها لەوەی گەر هۆی مردنەکە بەرهەمی ئەوە بووە بە شێوەیەکی راستەوخۆ یان ناراستەوخۆ، وەك ئەوەی کرێکارێك تەوژمی کارەبا لێیبدات کاتێك خەریکی چاککردنەوەی هەندێ هێڵی کارەبا بووە، لە حالەتی بینینی پزیشکدا بۆ هەر ئافەتێکی نەخۆشی پێویست پەیوەندی بەهۆی مردنەکەوە رۆشن بکاتەوە[1].

---

[1] لمزيد من التفصيل ينظر المرجع السابق ١ / ٧٢ – ٧٩

# باسی دووەم:
# پەنابردن بۆ ئەهلی شارەزایی و پسپۆڕی

لەسەر قازی پێویستە پەنا ببات بۆ ئەهلی شارەزایی لە پرسە مەدەنییەکاندا بۆ خەملاندنی زیان و قەبارەی باربووکردنەوە بۆ دوورخستنەوەی ستەم لە زیانبەرکەوتووەکە و ئەو کەسەی باربوو دەکاتەوە، لەوێشەوە دەستەبەرکردنی دادپەروەری بۆ هەموو لایەنەکان.

بۆ ئاسەواری تاوان بۆ نموونە وەك پەڵەی خوێن، پەنا دەبات بۆ شیکاری خوێن، بۆ ئاسەوارەکانی تریش وەك جێپەنجە پەنا دەبات بۆ لێکۆڵینەوەکانی تاوان.

بۆ نەخۆشییە ئەقڵییەکان و نەخۆشیە نەفسییەکان پەنا دەبات بۆ پزیشکان و پسپۆڕان و زانایانی دەروون.

گەر کەسی تۆمەتبار یان وەکیلەکەی یان کەسێکی تر لە خاوەن پەیوەندی بانگەشەی ئەوەی کرد کە تۆمەتبار لە کاتی هەستان بە تاوانەکەدا تووشبووە بە نەخۆشی ئەقڵی، یان گرفتار بووە بە فێ و تێکچوونی دەماغی کە بە تۆرەی لەناکاو دەناسرێتەوە لە لەدەستدانی هۆشیاری و زۆرجار رەقبوونی ماسولکەکانی[1] لێوە پەیدا دەبێت، یان تووش بووە بە هیستریا کە بریتییە لە تووڕەبوون و زیادبوونی بارگەی هەڵچوون و هەستێك کە بەرهەم دێت لە نێوان خودێکی هەستکەر و حەز و ئارەزووی نەستی پەرچێنراو(چەپێنراو)[2]، یان هاوشێوەکانی ئەمانە لە رێگری بەردەم بەرپرسیارێتی سزایی، بۆیە لەسەر قازی پێویستە پەنا ببات بۆ پسپۆڕان لەپێناو دڵنیابوونەوە لە بوونی لابەلایەکی رێگر یان نەبوونی، هەروەها بۆ دڵنیابوونەوە لە رادەی کاریگەری لەسەر ویستی تاوانبار، هەروەها لەسەر قازی

---

(1) الموسوعة العربية الميسرة ص ١١٢٢

(2) د. مصطفى القللي – في المسؤلية الجزائية ص ٣٧٨

پێویستە پەنا ببات بۆ زانایانی دەروون و کۆمەڵ(دەروونناس و کۆمەڵناس) بۆ لێکۆڵینەوە لە پاشخانی تۆمەتبار و ئەو فاکتەرانەی کە تۆمەتباری والێکردووە هەستێت بەو تۆمەتەی دراوەتە پاڵی.

فەیلەسوفان و بیرمەندان جیاوازییان لەنێواندا هەیە لەمەڕ پرسە سزاییەکان لە ژێر زەمانەوە، لە کاریگەری فاکتەرە خودییەکان(ناوەکییەکان) و فاکتەرە دەرەکییەکان لەسەر ویستی تاوانبار، بۆ سێ ئاراستە دابەشبوون: ئاراستەی ویست و هەڵبژاردن، و ئاراستەی بێویستی و ئاراستەی میانەگیر، لەم ڕۆشنکردنەوانەدا کە دێن:

## یەکەم: ئاراستەی ئازادی هەڵبژاردن:

لە پایەی مەعنەوی تاواندا وادادەنرێت گەر تاوانبار رووی ویستی بە شێوەیەك بێت پێچەوانە بوەستێتەوە لەگەڵ فەرمانە یاساییەکان و نەهیکردنە یاساییەکاندا، ئەوا ئەو ویستە سەرپێچیکەرە بۆ فەرمانەکانی یاسا و نەهیکردنەکانی، لەوێشەوە ئەو ویستە جێگەی سەرزەنشتە و خاوەنەکەی شایستەی لێپرسینەوەی سزاییە، سەرخەرانی ئەو ئاراستەیە قسەکەیان لەسەر ئەوە بینا دەکەن کە ئازادی هەڵبژاردن بنچینەی بەرپرسیارێتی سزاییە بۆ تاوانبار، چەندین بەڵگە دەکەنە پاڵپشت لەوانە:

أ. بەرپرسیارێتی لە ناوەرۆکیدا ڕەنگێکە لەسەر ئاکاری سەرپێچیکەر لە یاسا، جێگەی سەرزەنشت نییە مەگەر ئاکارێکی تری لە تواناد هەبێت، گەر بەسەریدا سەپابوو ئەوا جێگەی بەرپرسیارێتی سزایی نییە.

ب. بۆ تاوانی هەڵبژاردن لە ویژدانی کەسی ئاساییدا پاڵپشت بوونی هەیە، یان هەستکردن بە توانینی خۆی لەسەر بەچاکزانین لە نێوان پاڵنەرە هەڵچووەکاندا، هەست بکات بە ئازادبوونی لە دەستبەسەردا گرتنی کۆمەڵێك فاکتەر کە پەنای پێ دەبات بۆ ئاکارێکی دیاریکراو.

ج. دەمکوت کردنی تایبەت(دەمکوتکردنی تاوانبار لەوەی جارێکی تر بگەڕێتەوە بۆ تاوانکردن) و دەمکوت کردنی گشتی(ڕێگری لە کەسانی تر چاوی لێبکەن) وێنا ناکرێن و نایەنە دی مەگەر کەسێك دەستی بەسەر هەڵسوکەوتەکانی خۆیدا گرتبێت و بتوانێت نەفسی خۆی پابەند بکات بە ئاکارێکی تەبا و کۆك لەگەڵ یاسادا.

سەرخەرانی ئەم ئاراستەیە قسەکەیان لەسەر ئەوە بینا کردووە کە بەرپرسیارێتی سزایی بریتییە لە ئازادی هەڵبژاردن و توانای دیاریکردنی چاك و خراپ، سەرباری هەموو ئەو پاساوانە ئەم ئاراستەیە رووبەرووی رەخنەی توند بووەتەوە لەوانە[1]:

١. ئەم ئاراستەیە بەرپرسیارێتی سزایی لەسەر بنچینەیەکی وەهمی نا واقیعی دامەزراندووە، ئەوەش گریمانەی ئازادی مرۆڤە لە هەڵبژاردندا، لە کاتێکدا بەڵگەیەك بوونی نییە لەسەر سەلماندنی ئەم ئازادییە، بۆیە ئەو بنچینەیە هیچی تر نییە جگە لە بانگەشەیەکی بێبنەمای کۆن کە پاشین لە پێشینەوە وەریانگرتووە بەبێ لێکۆڵینەوە و گفتوگۆ لەسەری.

٢. ئەو قسەیەی کە تاوانبار لە هەڵبژاردنەکەیدا دەستکراوە و ئازادە و تاوان بەتەنها لەدایکبووی ویستی ئازادی ئەوە و پێویستە وەڵامی بانگی ویژدانی خۆی بداتەوە و خۆی لە تاوانەکە کەنارگیر بکات: قسەیەکە واقیعی بەرهەست بە درۆی دەخاتەوە، بۆیە بکوژ کە تاوانی کوشتن ئەنجام دەدات وەك تۆڵەیەك بۆ شەرەف کاتێك سووکایەتی پێکراوە، هەروەها ئەو دزەی کە بە پاڵنەری پێویستییەکی سەختی پێداگر دزی پێ دەکات، و هاوشێوەکانی ئەو دوانە لە تاوانی ئەنجامدراو لەژێر فشارێکی پێداگردا، چۆن دەبێ بوترێت هەر کەس لەوانە ئازادە لە هەڵسوکەوتیدا بە ئازادییەکی رەها، لە واقیعدا ئەو کەسە راپێچکراوە بۆ تاوانەکە بە کاریگەری فاکتەری هەمە جۆر.

٣. گەر خۆمان رادەستی ئەو بۆچوونە بکەین لە شرۆڤەی تاواندا لەسەر ئەو بنچینەیە، لە تاوانە ئەنقەستەکاندا کە ویستی تاوانبار فاکتەرێکی بنچینەییە ئەوا دەتوانرێت ئەو بنچینەیە گشتگیر بکرێت بەسەر تاوانە نائەنقەستەکاندا، لە کاتێکدا ویستی ئەنقەستکار نابینرێتەوە لە ئەنجامدانی کرداری تاواندا، بەڵکو تەنها پشتگوێخستن و هەڵە بوونی تێدا هەیە.

[1] د. محمود نجيب حسني /المرجع السابق/ص٣٩٩ ومايليها، الاستاذ عبدالجبار عريم/نظريات علم الاجرام/ص ٤٤ ومايليها.

٤. خۆڕادەست کردن بەو گریمانەیە بەوەی تاوان بەتەنها لەدایکبووی ویستی تاوانبارە سەرئەنجامی ترسناکی لێوە سەرهەڵدەدات، چونکە پەردە دەدات بەسەر ژێری بیرمەندان و کارکەران لە بابەتە سزاییەکاندا لە باس و توێژینەوەی زانستی لەمەڕ لێکۆڵینەوەی هۆی راستەقینە و پاڵنەر بۆ تاوانکردن.

٥. وەرگرتن و کارکردن بە ئاراستەی ئازادی هەڵبژاردنی تاوانبار لە ئەنجامدانی تاوانەکەیدا سەردەکێشێت بۆ پشتگوێخستنی لایەنێکی کەسی تۆمەتبار، لەوێوە بۆ بیناکردنی رادەی سزا لەسەر گەورەیی و ترسناکی تاوانەکە و چاودلخستن لە کەسی تاوانبار و رادەی ترسناکی ئەو، پاشان سەردەکێشێت بۆ خراپترین سەرئەنجام، ئەوەش وا دەکات مەبەستی داواکراو دەستەبەر نەبێت لە یاسای سزایی و سیستمی یاسای سزایی لە قەلاچۆکردنی تاوانکارییدا.

بۆیە گرنگی پێدانی لێکۆڵەران بە کار نەك بە بکەر ماناکەی بریتییە لە گرنگیدان بە لابەلا و پشتگوێخستنی کرۆك و ناوەرۆك، لەگەڵ ئەوەی تاوان دیاردەیەکە ئاماژە دەکات بۆ نەفسییەتێکی نەخۆشی لار و خوار هەروەها بەڵگە لەسەر بوونی کەسایەتییەکی نەخۆش لەسەر کۆمەڵگە، بۆیە پێویستە چارەسەر بکرێت و قەلاچۆی نەخۆشییەکە بکرێت[1].

## دووەم - ئاراستەی بێویستی: پوختەی ئەم ئاراستەیە بریتییە لەوەی کە هۆکاری تاوانکردن لە دوو کۆمەڵەی سەرەکیدا کورت دەبێتەوە:

١. کۆمەڵێك هۆ(فاکتەر)ی خودیی(تاکەکەسی) کە پێی دەوترێت ناوەکی جا رەچەڵەکی بن یا ئەقڵی(نەفسییەتێکی دەمارگیر و توند وتوڕە).

٢. کۆمەڵێك هۆ(فاکتەر)ی دەرەکی کە پەیوەستە بە ناوەند یان ژینگەوە کە کەسی تاوانباری تێدا گەورە بووە، جا سروشتی بێت(جوغرافیا و ئاو و هەوا) یان کۆمەڵایەتی بێت (ئەخلاقی و ئایینی و ئابووری و فێرکاری و تەندروستی) یان سیاسی بێت(رێکخراوەیی)، و هاوشێوەکانی ئەمانە[2].

---

[1] الاستاذ عبدالجبار عريم/نظريات علم الجرام/ص٤٥ ومايليها.

[2] ينظر فلسفة وتاريخ القانون الجنائي لاستاذنا الدكتور علي راشد ١٦١/١ ومايليها.

کاریگەری دوو کۆمەڵەکە بەپێی گۆڕانی حاڵەتی هەر تاوانبارێك گۆڕانی بەسەردا دێت، بەڵام زاڵبوونی کاریگەرییەکە بۆ فاکتەرە ناوەکییەکانە و زۆرترین بەش لە ڕوودانی تاواندا بۆ ئەو دەگەڕێتەوە.

بەڵام لە سەرخەرانی ئاراستەی بێویستی ڕەها پێچەوانەی ئەمە بیردەکەنەوە و کاریگەری زاڵ دەدەنە پاڵ فاکتەرە دەرەکییەکان، بەتایبەت فاکتەرە کۆمەڵایەتییەکان.

**ئەم ئاراستەیە بە کۆمەڵێك بەڵگە خۆیان پاڵپشت دەکەن:**

١. ئەم مەزهەبە جێبەجێ کردنی یاسایی هۆگەراییە لەسەر هەڵسوکەوتە مرۆییەکان، کرداری مرۆڤ لەو سۆنگەیەوە کە دیاردەیەکی سروشتی دەروونییە بە شێوەیەکی پێویست دەچێتە ژێر یاسای دیاردە گەردوونییەکانەوە، بوونی ئەم یاسایانە جێگەی گوناه نین، ئەوانە ئەنجامێکی حەتمین بەهۆی کۆمەڵێك هۆکارەوە کە سەردەکێشن بۆیان، بۆیە تاوان بەرهەمی ئازادی هەڵبژاردن نییە، بەڵکو بەرهەمی ئەو فاکتەرە ئاماژەبۆکراوانەن کە هەندێکیان ناوەکی و هەندێکیان دەرەکین.

٢. ئازادی هەڵبژاردن بەڵگەیەك لەسەر بوونی ڕاست نەبووەتەوە، ئەو بەڵگانەش کە سەرخەرانی پێشکەشیان کردووە بەهایەکی ئاماژەیی زانستی واقیعییان بۆ نابینیتەوە.

٣. بۆچوونی جەبرییەت و نەبوونی ویست دەرکەوتنی هۆکاری تاوان لە ئامێز دەگرێت، وەك ڕێخۆشکردنێك بۆ سنووردارکردنی و چارەسەری ترس و هەڕەشە بە پێچەوانەی بۆچوونی ئازادی هەڵبژاردنەوە.

٤. ئەم ئاراستەیە پارێزگاری کۆمەڵگە لەخۆ دەگرێت پێش ئەوانەی جیاکارییان پێ ناکرێت و پێش ناتەواوان، چونکە مەزهەبی ئازادی هەڵبژاردن پێیان وایە دەبێت سزا لەسەر ئەوانە نەبێت کە جیاکارییان پێ ناکرێت سەرەڕای ئەو ترس و هەڕەشە کۆمەڵایەتییەی کە تاوانی کەسەکە پەردەی لەسەر لاداوە، ئاراستەی بێویستی دان دەنێت بە بڕیاردان لە گرتنەبەری ڕێوشوێنی گونجاو، وەك پارێزگاری لە بەرژەوەندی کۆمەڵگە، بۆیە بنچینەی بەرپرسیارێتی سزایی لای ئەم ئاراستەیە بریتییە لە پارێزگاری بەرژەوەندی کۆمەڵگە لە ترس و هەڕەشە، چونکە تاوان گەر ڕوویدات هەردەبێت پەرچەکردارێك لەلایەن کۆمەڵگەوە ڕووبەڕووی ببێتەوە، وەك

چۆن تاوان پیادەکراوە بەسەر تاوانباردا هەر بەو جۆرە بەرگری کارێکی سەپاوە بەسەر کۆمەڵگەدا.

ئاراستەی جەبرگەرا و بێویستی لە چەند روویەکەوە رەخنەی لێگیراوە، لەوانە:

١. گەر کەسەکە ناچارکراوە لە ئەنجامدانی تاواندا چۆن دەتوانن تەبایی بدۆزنەوە لە نێوان ئەو ناچارکردنە و سەپاندنی سزا بەسەر تاوانباری ناچارکراودا، مەگەر سزا لەو بارەدا ستەمێکی دەمبەهاوار بێت.

٢. لەسەر ئاراستەی جەبرگەرا کەسی تاوانبار راپێچکراوە بۆ ئەنجامدانی تاوانەکەی بەهۆی کارێکی جەبری ناوەکییەوە یان دەرەکی، بۆیە ئەو وەك ئامێرێك وایە بەدەستی رەوشەکانەوە، ئیتر چۆن بەرپرسیارێتی سزایی ئاراستە دەکرێت و کارەکەی بە تاوان وەسف دەکرێت[1].

**راستکردنەوەی دوو مەزهەبەکە:**

١. هەریەکەیان لایەنێك لە حەقیقەت لەئامێز دەگرێت، بەلاّم لە هەمان کات هەریەکەیان نەقشێکی زیادەرەوی لە بۆچوونیدا هەیە، لە ئاراستەی یەکەمدا لە داننان بە ئازادی هەڵبژاردندا زیادەرەوی هەیە، لەوەی دووەمیاندا کەمرەوی هەیە لە لێگرتنەوەی ئەو ئازادییە لە کەسی تاوانبار.

٢. ئەو قسەیە دروست نییە مرۆڤ لە هەڵسوکەوتەکانیدا خاوەنی ئازادییەکی رەهایە، چونکە واقیع شایەتی دەدات کە هەموو کەسێك لە هەڵسوکەوتەکانیدا ملکەچە بۆ هەندێ فاکتەر کە ئاسۆی ئازادی ئەو بەرتەسك دەکاتەوە، هەر بەو جۆرە ئەو بۆچوونە راست نییە بە ژێربار کردنی مرۆڤ لە وێنەیەکی نەرێبەخشدا بۆ یاسای هۆگەرایی، لەسەر ئەو بنچینەی کەسەکە ئامێرێکە بە دەست رەوشەکانەوە، وەك پەڕێك لە بەردەمی بادا.

٣. یەکسانی لە نێوان مرۆڤ تەواوی بوونەکانی تردا بۆ ملکەچبوون بۆ رەوش، جیاوازی رۆشنی نێوان مرۆڤ و دروستکراوەکانی تر بەدرۆی دەخاتەوە.

---

[1] دکتور محمود نجیب حسني /المرجع السابق/ص٤٠٢ ومابليها، الاستاذ عبدالجبار عريم/المرجع السابق/ص ٤٨ ومابليها.

٤. مرۆڤ بە ئەقلْ دەناسرێتەوە و هەر بەو ئەقڵەش لەوانی تر جیادەبێتەوە، ئەو ئەقڵە جێگەی دلواکردنە لە مرۆڤ، مرۆڤیش بوونەوەرێکی هۆشیارە دەتوانێت زانستی هەبێت بەوەی دەورەیداوە، توانای هەیە ئامانجەکان دیاری بکات و بە کار و کردەوەکان هەوڵی دەستەبەرکردنیان بدات، مرۆڤ توانای ئەوەی هەیە باش و باشتر لەیەکتر جیابکاتەوە و هەڵبژاردنی هەبێت بۆ ئەو شتانەی بە گونجاویان دەزانێت، با ئەو شتەش بەپێی گومان و باوەڕ و رەوشی ئەو بێت.

٥. وەك چۆن ئازادی رەهای مرۆڤ بۆ هەڵبژاردن بەڵگەیەکی زانستی بەرهەستی لەسەر نییە، هەر بەو جۆرە ئەو بۆچوونەی کە مرۆڤ ئامێرێکە بە دەستی رەوشەکانەوە، ویستەکەشی هیچی تر نییە جگە لە ئامێرێك بۆ جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی ئەو رەوش و فاکتەرانە، ئەمەش دیسان بەڵگەیەکی زانستی بەرهەست لەسەری نییە، هەردوو بیرەکە لە رووی سەلماندنی زانستی ئەزموونییەوە لە یەك ئاستدان.

٦. لەسەر بیرمەندان و فەیلەسوفان و زانایانی یاسای سزایی پێویستە خۆدانە دەم ئەم گرفتە فەلسەفییە(گرێکوێرەی ئازادی ویست و هەڵبژاردن و نەبوونی ئازادی لە ویست و هەڵبژاردندا) واز لێ بهێنن، پێویستە لەسەریان گرنگی پێدانیان ئاراستە بکەن بۆ لێکۆڵینەوە لەسەر نەخۆشییە تاوانکارییەکان و دیاریکردن و بەرجەستەکردنی هۆیە سەرەکییەکانی و چارەسەری ئەو نەخۆشییانە بە رێگەی زانستی نوێ بۆ بەرەنگاربوونەوەی تاوان و قەلاچۆکردنی بە رێگەی زانستی نوێی ئاسانکراو.

## سێیەم- ئاراستەی تەبایی میانەگیر

راستەقینەی ئەم بابەتە بریتییە لە ناوەندی نێوان دوو ئاراستەکەی پێشوو تر، مرۆڤ لە رەوشە ئاساییەکاندا خاوەنی ئازادییەکی سنووردارە، کۆمەڵێك هۆکار هەیە تاوانبار ناتوانێت دەستی بەسەردا بگرێت، ئەو هۆکارانە بە جۆرێك ئاراستەی دەکەن کە هیچ هەڵبژاردنێکی ئەوی تێدا نییە، بەڵام ناگەنە رادەی سەپاندنی کارێك بەسەریدا، بەڵکو برێك لە ئازادی بۆ دەهێڵنەوە هەڵسوکەوتی تێدا بکات، ئەو برەش بەسە بۆ ئەوەی بەرپرسیارێتی لەسەری راست ببێتەوە، لە یەکدانی دوو مەزهەبەکە لە رووی دەرئەنجامەوە گونجاوە، بەرپرسیارێتی لەسەر بنچینەی ئازادی هەڵبژاردن راست دەبێتەوە، ئەوەش سزای بەدوادا دێت لە شێوەی

سزاداندا، بەلاّم سەرباری هەموو ئەگەرەکان و بۆچوونگەلێکی ناکۆك لەسەر قازی پێویستە بۆ مەرامی دەستەبەرکردنی دادپەروەری پەنا ببات بۆ ئەهلی پسپۆری تاکو بتوانێت ئاگادار بێت لەسەر ئریژەی هۆکارەکان کە تاوانبار دەدەنە بەر بۆ ئەنجامدانی تاوانەکەی، ئەو هۆکارە هەندێ جار رەوشی توندکراوەیە، لەوانەشە پاساوی سوککراو بێت وەك لە حالّەتی پێویستی و زۆر لێکردندا، لەوانەشە رێگر بێت لە بەرپرسیارێتی سزایی نەك بەرپرسیارێتی مەدەنی، وەك نەخۆشییە ئەقلّییەکان، لەوانەشە لە هۆی موباح کردن بێت، وەك لە حالّەتی بەرگری شەرعی و هاوشێوەکانی ئەمانە، لە هەموو ئەم گریمانە ئاماژەبۆکراوانەدا قازی ناتوانێت تەنها بۆ خۆی هەموو رەوشێك و کاریگەری لەسەر ویستی تۆمەتبار بناسێتەوە و لەوێشەوە بریار لە رادەی سزاکە بدات، پەنابردن بۆ کەسانی تر لە ئەهلی شارەزایی و ئەهلی پسپۆری لەو پێویستییانەیە دادپەروەری دەیسەپێنێت.

# بەشی شەشەم

# لۆژیکی یاسایی

ئەم دوو بابەتە دەست بۆ دەبەین لە دوو باسدا

یەکەمیان تایبەتە بە لۆژیکی یاسایی لە بینشەکاندا

دووەمیان بۆ لۆژیکی یاسایی لە بەڕاستزانینەکاندا

# باسی یەکەم:
# ژیربێژی یاسایی لە بینشەکاندا

پێناسەکەی: ژیربێژی(مەنتق) یاسای رەچاوکردنە، رێساکانی ئەقڵ لە هەڵە دەپارێزن لە بەدەستهێنانی نەزانراوەکان لە زانراوەکانەوە.

بابەتەکەی: زانراوە بینشییەکان و بەڕاستزانینەکانن لەو رێگەیەوە کە ئامرازگەلێکن بۆ بەدەستهێنانی نەزانراوە بینشی و بەڕاستزانینەکان.

ئامانجەکەی: پاراستنی ئەقڵ لە هەڵە کاتێ بیردەکاتەوە و لە ژنەورلو(المعقول)[1] ورد دەبێتەوە و رادەمێنێت.

## بینشەکان و بەڕاستزانینەکان:

أ.وێناکردن(بینش): بریتییە لە یەکێك لە چوار پەیبێبراوەکان کە ئەمانەن:

١. پەیبردن بە تاکە وشەکان بەبێ ئەوەی هەندێکیان بدرێنە پاڵ هەندێکی تریان، وەك پەیبردن بە وشەی"تاوان" و وشەی"چاکە" و هاوشێوەکانیان.

٢. پەیبردن بە گرێ(رستەی ناتەولو) وەك پەیبردن بە گوزارەی(تاوانی تەزویر) و (تاوانی کوشتن) و هاوشێوەکانیان.

٣. پەیبردن بە رستەیەکی تەولوی دارێژراو، وەك قسەی فرۆشیارێك بە کڕیارەکە (ئۆتۆمبێلەکەم پێ فرۆشتی بە ئەوەندە) ئەمە رستەیەکە کە لە دەرەوەی زەینەوە ناوەرۆکەکەی دیار نییە پێش دارشتن و سەرهەڵدانی، شایانی باسە هەموو رستە دارێژراوەکان لە دەروازەی وێناکردنن(بینشەکانن).

---

[1] ژنەورلوەکان بریتین لە زانیاری وێناکراویی و بەڕاستزانراویی هەڵگیراو(خەزنکراو) لەلای ئەقڵ.

٤. پەیبردن بە رستەیەکی راگەیاندن بەبێ گەردنکەچبوون، بەڵکو لە رێگەی شک و وەهم و ئەندێشەوە، وەك پەیبردن بە بوونی ژیان لەسەر هەسارەی مەریخ، ئەوەش تا ئێستا لە قۆناغی گوماندایە، تاکو هەنووکە پارسەنگێك بوونی نییە بۆ پارسەنگانی بوونی ژیان بەسەر نەبوونیدا، یان نەبوونی بەسەر بوونیدا.

ب- بەڕاستزانین: بریتییە لە پەیبردن بە رستەیەکی تەواوی راگەیاندن لە رێگەی ملکەچبوونەوە(قەناعەتکردنەوە) وەك پەیبردن بە: (تۆمەتبار بێ گوناهە تا تۆمەتبارکردنەکە دەسەلمێت)

**ئاستەکانی زانست:** دوو مانا بۆ زانست هەیە، مانای تایبەت: بریتییە لە باوەڕی تێر و تەواو و جێگیر و پڕاوپڕ لەگەڵ واقیعدا، لەگەڵ مانایەکی گشتی: بریتییە لە پەیبردنی رەها، ئەم بەشە بۆ حەوت بەشی تر دابەش دەبێت کە ئەمانەن لە سەرەوە بۆ خوارەوە بەپێی هێز و لاوازییان:

١. یەقین: بریتییە لە باوەڕی تێر و تەواو و جێگیر و دامەزراو و پڕاوپڕ لەگەڵ واقیعدا، وەك: "گشت گەورەترە لە بەش".

٢. نەزانی دووسەرە: بریتییە لە باوەڕی تەواوی جێگیر و دامەزراو و ناتەبا لەگەڵ واقیعدا، بۆیە ناونراوە بە "نەزانی دووسەرە" چونکە لە دوو نەزانی پێکدێت، یەکەمیان نەبوونی زانستی کەسەکە بە واقیع، و دووەمیان نەزانینی بەوەی کە واقیع نازانێت(نازانێت)، وەك ئەو کەسەی باوەڕی بە بوونی یان نەبوونی شتێکە بە باوەڕێك کە ناتوانیت بە ئاسانی بیسڕیتەوە، لەگەڵ ئەوەش خاوەنەکەی وادەزانێت لەسەر حەقە.

٣. چاولێکەری: ئەوەش بریتییە لە باوەڕی تەواوی ناجێگیر، وەك وەرگرتنی ڕا لە کەسێك و شوێنکەوتنی بەبێ ناسینی بەڵگەکەی، ئەم چاولێکەرییە(شوێنکەوتنە) ئامادەیی سڕانەوەی تێدایە بە وەرگرتنی رایەکی تر لە جێگەی ئەوەی یەکەم.

٤، ٥. گومان و وەهم: قوتابی چالاك باوەڕی بە دەرچوون لە تاقیکردنەوەدا هەیە بە رێژەی ٩٠٪ و وێنای شکستی خۆی دەکات بە رێژەی ١٠٪، پەیبردنی یەکەم بریتییە لە گومان و دووەمیان بریتییە لە وەهم، بینا لەسەر ئەمە هەمیشە گومان بریتییە لەلا پارسەنگەکە و وەهم بریتییە لە لا ناپەرسەنگەکە.

٦. شك: بریتییە لە دڵەڕاوکێ لە نێوان دوو باردا بەشێوەیەکی یەکسان بەبێ پارسەنگبوونی یەکێکیان لەسەر ئەویتریان، وەك شکی زانایانی گەردووناس لە بوونی ژیان لەسەر هەسارەی مەریخ.

٧. ئەندێشە(خەیاڵ): بریتییە لە پەیبردنی لای بەرانبەر بۆ یەقین، وەك ئەو کەسەی وێنا دەکات لە ژیانێکدا دەژی زیاتر لە ژیانی ئاسایی تەمەنی مرۆڤ بۆیە یەقین و نەزانی دووسەرە و چاولێکەری و گومان لە دەروازەی بەڕاستزانینەکان، بەلأم شك و وەهم و خەیاڵ لە دەروازەی وێناکردنەکانن، قازی داوای لێ ناکرێت بەوەی هەمیشە کاریکات بەپەیبردنی هاو وڵتا بە یەقین، ئەگەر نە، ئەوە سەردەکێشێت بۆ تیابردنی زۆرێك لە مافی مەردوومان، چونکە روونکردنەوە یاساییەکان لە دادبینیدا ئەگەری راستی و درۆ و حەق و باتڵیان هەیە، چونکە هەواڵن، هەموو هەواڵێکیش ئەگەری ئەوانەی تێدایە، بینا لەسەر ئەوە هەر کات قەناعەت بۆ قازی دروست بوو بەو بەڵگانەی کە لەلایەتی، مافی ئەوەی هەیە بەپێی قەناعەتەکەی خۆی بڕیار دەربکات با هەڵەش بێت.

## بەڵگەنەویست و بیردۆزەیی:

هەریەك لە وێناکردن و بەڕاستزانین یان بەڵگەنەویستن گەر سەلماندنی پێویستی بە بەڵگە نەبوو، وەك وێناکردنی گەرمی لە ئاگر، هەروەها وەك وتنی خۆر هەڵدێت، یان بیردۆزەییە و بۆ سەلماندنی پێویستی بە وردبوونەوە و بەڵگە هەیە، وەك پەیبردن بە "جینی مرۆیی" لە وێناکردنەکاندا و سەلماندنی داوا لەبەردەم قەزادا لە بەڕاستزانینەکاندا.

## وێناکردنەکان: بنەماکانیان و مەبەستەکانیان:

### یەکەم: بنەمای وێناکردنەکان:

لە گرنگترین بنەمای وێناکردنەکان لە ژیرێژیدا بریتییە لە پێنج هەمووەکییەکان(رەگەز، بەش، جۆر، لابەلای تایبەت و لابەلای گشتی).

ئەم پێنج بنەمایە لە بەشەکانی ژنەورلون، ژنەورلو ئەوەیە لە ئاماژەیەکەوە دەژنەورێت، لەو رێگەیەوە کە ئاماژە دەکاتە سەری پێیدەوترێت ئاماژەبۆکراو، لەو رێگەشەوە بە مەبەست دەگیرێت پێی دەوترێت مانا.

شایانی باسکردنە، زانستی ژیریێژی(مەنتق) گرنگی بە وشەکان نادات بە ئەندازەی ئاماژەیان بۆ سەر ژنەورلوەکان، ئاماژەی شتێك بۆ سەر ژنەورلوێك یان دلنرلوە یان ئەقلّییە یان سروشتییە.

دلنرلو: شتێك بکرێت بە بەلگە بۆ سەر مانایەك یان تێگەیشتنێك، وشەیەك بێت یان شتێکی تر، یەکسانە کەسەکە لە ئەهلی زمان بێت یان شەرع یان یاسا یان هەر زلرلوەیەکی تر.

ئاماژە: بەوەی شتەکە لە حالّەتێکدا بێت لە زانست بەو شتەوە—دوای زانست بەو حالّەتە—زانست بە شتێکی تر پێویست بێت، یەکسانە حالّەتەکە دلنرلو بێت یان ئەقلّ یان سروشت.

ئاماژە یان یان پرلوپرییە یان ئامێزگرییە یان پابەندبەندییە، بۆ نموونە، ئاماژەی گرێبەست لەسەر کۆی ئەرێکردن و قبوولّ کردن پرلوپرییە، چونکە وشەکە پرلوپرە لەگەلّ ماناکەدا بەبێ کەم و زیاد، ئاماژەی بۆ سەر ئەرێکردن بەتەنها یان قبوولکردن بەتەنها لەگەلّ کۆی گشتیدا ئامێزگرییە، ئاماژەشی بۆ سەر ماف و پابەندبوونەکانی پەیدا بوو لەسەری پابەندبەندییە.

**بەشەکانی ئاماژەی پرلوپری:**

١. ئاماژەی دلنرلوی گوزارەیی: وەك ئاماژەی وشەی "کوشتن" بۆ دەرچوونی گیانی مرۆڤ لە زلرلوەی یاسایی و شەرعیدا.

٢. ئاماژەی دلنرلوی ناگوزارەیی: وەك ئاماژەکانی رێگاویان بۆ سەر گونجاویی پەڕینەوە و رۆیشتن و نەگونجاویی پەڕینەوە و رۆیشتن، هەروەها وەك مارکە بازرگانییەکان و ناونیشانی شوێنە گشتییەکان.

٣. ئاماژەی ئەقلّی گوزارەیی: وەك ئاماژەی وشەی بیسترلو لە ئامێری بێتەل یان بەتەل لەسەر بوونی کەسێك کە وشەکان گودەکات.

٤. ئاماژە ئەقلّییە ناگوزارەییەکان: وەك ئاماژەی ئاسەواری تاوان لەسەر دیاریکردنی تاوانبار و سروشتی تاوانەکە.

٥. ئاماژەی سروشتی گوزارەیی: وەك ئاماژەی نرکە و نالّەی نەخۆش لەسەر ئازارەکانی و ئاماژەی وشەی لەرزۆك لە تۆمەتبارەوە لەسەر پەیوەندی ئەو بەو تۆمەتەی ئارلستەی کرلوە.

٦. ئاماژەی سروشتی ناگوزارەیی: وەك ئاماژەی خێرایی لێدانی دلّی تۆمەتبار لە کاتی هێنانە قسە و وەلاّم لێ وەرگرتندا لەسەر پەیوەندی ئەو بەو تۆمەتانەوە درلونەتە پالّی.

**بەشەکانی ژنەوراو بە پێی سەرا پاگیریی:**

أ. خودی: ئەوەیە لە چییەتی خۆیدا بە خۆیەوە رلوەستاوە، دلبەش دەبێت بۆ: رەگەز و بەش و جۆر.

ب. لابەلایی: ئەوەیە کە بە غەیری خۆیەوە رلوەستاوە، یەکسانە گەر لابەلای تایبەت بێت وەك پێکەنین بۆ مرۆڤ یان لابەلای گشتی بێت وەك هەناسەدلنی هەموو زیندوەرێك وەك لەم رۆشنکردنەوەدا هاتووە:

١. رەگەز: ئەوەیە کە هەمووەکی و خودییە، بەسەر راستەقینەکان و چییەتییە جۆرلوجۆرەکاندا جێبەجێ دەبێت، وەك گیانەوەر کە هەموو جۆرەکانی گیاندار دەگرێتەخۆ، هەروەها وەك تاوان گەر بەکارهێنرا هەموو جۆرەکانی تاوان دەگرێتەوە، هەروەها دزی و کوشتن و ناپاکی لە ئەمانەت و سووکایەتی بە ناموس و جاسوسی و هاوشێوەکانی ئەمانە.

٢. بەش: ئەوەیە کە هەمووەکی و خودییە، کارەکەی جیاکردنەوەی جۆرێکە لە جۆرێکی تر کە دەکەونە ژێر جۆرێکی هاوبەشەوە لە تەولوی جۆرە هاوبەشەکانی تر لەگەڵی لەو رەگەزەدا، وەك قسەکەر بۆ مرۆڤ لەگەڵ غەیری خۆی هاوبەشی دەکات بەوەی بوونێکی زیندووی جولاوی بەویستە، گەر وترا بوونێکی زیندووی قسەکەر ئەوا بە سروشتی مەبەستی مرۆڤە، چونکە وشەی "قسەکەر" بەشێکە لە هەرچی بوونە زیندووەکانی تر جیای دەکاتەوە .

٣. جۆر: ئەوەیە هەمووەکی و خودییە، لە رەگەزەکەی و بەشەکەی پێکدێت و هەموو بەشە کۆك و تەباکانی تر هەڵدەگرێت کە دەکەوێتە ژێرییەوە لە راستەقینە و چییەتی، جیاواز لە سیفەتە تایبەتەکان بە هەموو بەش و بەرجەستەکانییەوە، وەك جۆری خورما کە هەموو جۆرەکانی خورما دەکەوێتە ژێرییەوە، هەرروەها وەك کوشتن ئەمەش جۆرێکە لە رەگەزی تاوان، لەژێر ماناکەیدا هەموو جۆرەکانی کوشتن —لە کوشتنی بەئەنقەستی دوژمنکارانە و کوشتنی نیمچە ئەنقەست(لێدانێك سەریکێشێت بۆ مردن) و کوشتنی هەڵە و کوشتن بە ڕەوا، و جۆرەکانی تری کوشتن— لەخۆ دەگرێت.

٤. تایبەت (یان لابەلای تایبەت): ئەوەش هەموو لابەلایەکە تایبەت بە جۆرێك لە جۆرەکان یان بەشێك لە بەشەکان، و هەڵدەگیرێتە سەری، دەوترێت: مرۆڤ نووسەرە، یان خاوەن پێکەنینە، و هاوشێوەکانی ئەمانە.

٥. لابەلای گشتی: ئەوەش هەمووەکی لابەلایە، گەر بەکارهێنرا زیاتر لە یەك جۆر یان یەك رەگەز لەخۆ دەگرێت، وەك گەشە و جوڵانی بێویست، و هاوشێوەکانی ئەمانە.

چییەتی شتەکان لە خودییەکانیان(رەگەزەکانیان و بەشەکانیان) پێکدێت ، لەم بەشە ئامۆژەبۆکراوانەوە هەندێ لە هەڵە یاساییە باوەکانمان بۆ رۆشن دەبێتەوە، لەوانە:

أ. تێکەڵی لە نێوان "پارە" و شتانی تر لە پێوەرەکانی جیاکردنەوە لەگەڵ هاوشێوەیی و بەهایی، لەو رێگەیەوە کە فەقیهانی شەریعەت و زانایانی یاسا پێناسەی هاوشێوەییان کردووە بەوەی: (ئەو شتەی هاوشێوەی لە بازاردا دەبینرێتەوە بەبێ جیاوازییەکی حساب بۆکراو) وەك خورما لە یەك بەش و گەنم لە یەك بەش[1].

بەهاییشیان بەمە پێناسە کردووە: (ئەوەیە لە بازاردا هاوشێوەی نەبێت یان بوونی هەیە، بەڵام لەگەڵ جیاوازی حساب بۆکراو لە بەهادا)[2]، وەك ئۆتۆمبێل و گیانەوەر و هاوشێوەکانیان، لەگەڵ ئەوەی پێوەری جیاکاری لە نێوان هاوشێوەیی و بەهاییدا لە پارەدا ئەوەیە کە هاوشێوەیی پارە شتێکە یەکسانە پێی لە وێنە و مانادا، وێنەی هەر پارەیەك( سکەیەك) رۆشنە، ماناکەشی بریتییە لە هێزی مامەڵە پێکردنی، بینا لەسەر ئەمە گەر هێزی کڕین و فرۆشتنی پارەیەك دابەزی لە وڵاتێك لە وڵاتەکانی جیهان بەهۆی رەوشێکی تایبەتەوە وەك هەڵئاوسان یان بەرزبوویەوە بەهۆی ئاسایش و ئارامی و زۆربوونی بڕی رەسید لە بانقدا و هاوشێوەکانیان، ئەوا ئەو پارەیە لە هاوشێوەییەوە بۆ بەهایی دەگۆڕێت[3].

لەسەر گۆڕانە بەهای پارەکە لە کاتی وەرگرتن و لە کاتی گێڕانەوەدا حسابی بۆ دەکرێت.

بۆ نموونە یەکێك ژنێك مارە دەکات لەسەر مارەیەکی دواخراو کە بڕەکەی سەد دیناری عێراقی بێت، بەهای دینارەکە کاتی مارەبڕینەکە یەك مسقاڵ زێڕ بێت، دوای جیابوونەوەیان بە

---

[1] لەسەر ئەم بنچینەیە پارەیان لە یەك پۆلدا داناوە کە هاوشێوەکانە

[2] مجلة الاحكام العدلية المادتان (١٤٥ و١٤٦)

[3] ينظر مؤلفنا اصول الفقه في نسيجه الجديد ٢/٢٣٠ ومايليها

مردن یان تەلاق و هاتنی کاتی قەرزی مارەییەکە پێویستە دینارەکە بە بەهای دیناری رۆژی هاوسەرگیرییان بشکێتەوە، نەك بە بەهای کاتی جیابوونەوەیان، لەسەر ئەمە هەموو قەرزە دواخراوەکانی پارە پێوانە بکە.

ب. تێکەڵی باو لە نێوان بەش و رەگەزدا و بەکارهێنانی "رەگەز" لە جێگەی "بەش" وەك لە رەگەزنامە و شوناسنامەی باری کەسێتی و ئەو فۆرمانەی کە لە فەرمانگەکاندا دابەش دەکرێن بۆ ناسینی شوناسی فەرمانبەرانی هاتووە، خانەی "رەگەز" لە جێگەی "بەش" دانراوە، لە کاتێکدا نێر و مێ دوو بەشن لە جۆری مرۆڤ.

ج. هەڵەی فەقیهە حەنەفییەکان بە دانانی سوودبەخشەکان(قازانجبەخشەکان) بە لابەلا راوەستاو بە شتەکانەوە، نوێبوونەوەی بە نوێبوونەوەی کات، لەسەر ئەم بنچینەیە بینای بۆچوونەکەیان ئەوەیە کە قازانجبەخشەکان نادەستەبەرن، چونکە بە نوێبوونەوەی کات نوێ دەبنەوە، ئەوە ماڵ و سامان نییە تا تیاچوونی دەستەبەرکردن پێویست بکات[1]، چونکە ماڵ و سامان پێناسە کراوە بەوەی: (ئەوەی سروشتی مرۆڤ لای بەلادا دەکاتەوە و دەتوانرێت هەڵبگیرێت بۆ کاتی پێویستی، گوازراوە بێت یان جێگیر(نەگوازراوە)) [2]

ئەم بۆچوونەی حەنەفییەکان تێکەڵییەکە لە نێوان سوود(قازانج) لەگەڵ سوودلێبینین، سوودلێبینینە بە نوێبوونەوەی کات نوێ دەبێتەوە، بەڵام سوود(قازانج) لەو لابەلانەیە کە بەهێواشی و بە تێپەڕبوونی کات و بەکارهێنان تیادەچێت، ئەوە بریتییە لە وزەیەکی شاراوە لە گەردنی شتە بەسوودەکاندا و بە تێپەڕبوونی کات تیادەچێت.

د. دابەشکردنی زانایانی یاسا و فەقیهەکانی شەریعەت بۆ سوودبەخشەکان (قازانجبەخشەکان) بۆ گشتی و تایبەتی، گەر خودی شتەکە بۆ قازانجی گشتی تایبەتکرا وەك خەستەخانەکانی میری، ئەوا سوود–لە دیدی ئەوانەوە– گشتییە، گەر بۆ سوودی تایبەت تایبەتکرا وەك خانوویەکی بەمولککراو بە مولکییەتی تایبەت

---

[1] بینا لەسەر ئەم ئاراستەی حەنەفییە گەر کەسێك خانووی کەسێکی تری داگیرکرد و تیایدا ماوەیەك نیشتەجێ بوو پاشان لێی چووە دەرەوە کرێی هاوشێوە دەستەبەر ناکرێت بۆ قازانجی خانووەکە لەو ماوەیەدا

[2] مجلة الاحكام العدلية / المادة (١٢٦)

سوودەکە تایبەتە، ئەمەش دیسان هەڵەیەکی باوە، سـوودی شـتێك کـە بریتییـە لـە وزە شارلوەکەی بە گشتی و تایبەتی وەسف ناکرێت، ئەمەش دیسان تێکـەڵ کردنـە لـەنێوان سوود و سوود لێبینین، دووەمیان بە گشتی و تایبەتی وەسف دەکرێت نە "سوود".

**رێژە لە نێوان چەمکەکاندا:**

گەر چەمکی زاراوەیەك بە چەمکی زاراوەیـەکی تـر بـەراورد پـێ بکرێـت ئـەوا خـاڵی نییـە لـە رێژەی مەنتقیانە نێوانیان لە یەکێك لەم چوارەوە:

١. یەکسانی: ئەوەیە هەر یەك لە دوو چەمکەکە هەموو ئەوەی چەمکی تر بەڕاستی دەبینێت بەڕاستی بزانێت، وەك "گرێبەستی راگیراو" و "گرێبەستی جێبەجێنەکراو" چەمکی هەر یـەکێکیان بریتییـە لـە دامـەزرانی گرێبەسـتەکە بـە دروسـتی لەگـەڵ پەیدانـەبوونی ئاسەوار(ماف و پابەندبوونەکان) مەگەر لەدوای مۆڵەتی ئەو کەسەی ماف مۆڵـەتی هەیـە، وەك فرۆشـتنی ناتـەواو لـە شایستەبوون(لێوەشـاوەیی)دا، ئـەو جـۆرە گرێبەسـتە بـۆ سەرهەڵدانی ئاسەوارەکەی پێویستی بە مۆڵەتی سەرپەرشتیار هەیە.

٢. لەیەك جیابوونەوە: ئەوەیە کە چەمکی هەر یەکـەیان چـەمکی ئـەویتریان بەڕاستنازانێت، وەك "تاوانبار" و "بێتاوان" و گرێبەستی دروست و گرێبەستی پووچەڵ.

٣. گشتی و تایبەتی رەها: ئەوەیـە گشـت هەمیشـە دەسـتەبەر ببێـت لـە هـەرکوێ تایبـەت دەسـتەبەر بـوو، بـەبێ پێچـەوانە هەمووەکییەکـەی، وەك تـاوان و کوشـتن بـەناڕەوا، ، هەموو کوشتنێك بەبێ حەق تاوانە، بەڵام هەموو تاوانێك کوشـتن نییـە، چـونکە لەوانەیـە دزی یان دەستدرێژی نامووس، یان شتانی تر بێت جگە لەو دوانە.

٤. گشت و تایبەت لە روویەکەوە: ئەوەیە کە دوو چەمکەکە کۆببنەوە و لەیەکتر جیاببنـەوە، وەك ماڵ و دارایی و مافی تاکەکەس، ئەو دوانە تایبەتن لەڕووی کۆبوونەوەیان پێکەوە لـە یەك شتدا، وەك قـەرزی پەیوەسـت بـە ئەسـتۆی قـەرزدار، ئـەوە مـاڵ و دارایـی و مـافی تاکەکەسیشە، هەروەها گشتن لـە روویەکـەوە ئـەوەش ئەوەیـە کـە هەریـەك لـەو دوانـە لەگەڵ شتانی تر کۆدەبنەوە، بۆیە لە مـافی دیـاریکراودا[1] مـاڵ دەسـتەبەر دەبێـت بـەبێ

[1] مافی بەرجەستە بریتییە لە دەسەڵاتێکی راستەوخۆ بۆ کەسێکی دیـاریکراو لەسـەر شـتێکی دیـاریکراو کـە سەرپشکی دەکات لە مافی تاوتوێ کردن و بەکارهێنان و گرتنەئامێز وەك مافی موڵکداری.

مافی تاکەکەس، هەروەها لە خۆشی وەرگرتنی هەر هاوسەرێك لەویتریان مافی تاکەکەی دەستەبەر دەبێت بەبێ ماڵ و دارایی[1]، بینا لەسەر ئەوەی باسمان کرد بنەمای وێناکردنەکان بریتین لە پێنج هەمووەکییەکە: (رەگەز، و بەش، و جۆر، و لابەلای تایبەت، و لابەلای گشتی) و وابەستەکانیان، لە دیدی پڕ لە تەوازوعی ئێمەوە هەمووەکییەکان پێنج نین وەك زانایانی مەنتق بۆی دەچن، بەڵکو شەشن، هەمووەکی شەشەم بریتییە لە "پۆل" ئەوەش هەمووەکییە و لەژێریدا کۆمەڵە تاکێك جێی دەبێتەوە کە لە راستەقینەکاندا کۆك و تەبان و لەتایبەتمەندی و بەرجەستەکاندا لەیەکتر جیاوازن، وەك پۆلەکانی خورما کە لەژێریدا جۆرەکانی خورما جێگەی دەبێتەوە، لەژێر ئەم پۆلانەدا تاکەکانی خورما ریز دەبن، ئەو پۆلە دەگەڕێتەوە بۆ هەمووەکییە خودییەکان بەبێ لابەلاکان.

**دووەم- مەرامی وێناکردنەکان:**

مەرامی وێناکردنەکان بریتیین لە پێناسەی زاراوەکان یان بە خودی خۆیاندا(چییەتی زاراوەکان) وەك پێناسەی رەگەز و بەش یان بە خودی خۆیان لەگەڵ لابەلاکان یان لەگەڵ تایبەتمەندی لابەلا و دڵتاشینە وێناکراوەکان بۆ ئەم پێناسانە لە رووی بنەمای وێناکردن کە ئەم چوارەی تێدا بەکاردێت:

١. رادەی تەواو: بریتییە لە پێناسەی زاراوەکە بە رەگەزەکەی و بەشەکەی نزیك لەیەکتر، وەك پێناسەی تاوان بەوەی قەدەغەکراوە و سزای لەسەر دەدرێت، بۆیە بەشی یەکەمی ئەم پێناسەیە رەگەزێکە کارە قەدەغەکراوەکان سزایی بن یان مەدەنی لەخۆدەگرێت، بەشی دووەمی پێناسەکە بەشێکە کارە نامەشروعە مەدەنییەکان کە باربووکردنەوە بەبێ سزا دەستەبەر دەکات دەکاتە دەرەوە.

٢. رادەی ناتەواو: بریتییە لە پێناسەی زاراوە بە رەگەزە دوورەکەی و بەشە نزیکەکەی، یان بە تەنها بەشێك، وەك پێناسەی تاوان بەوەی "رووداوێکە سزای لەسەر دەدرێت"، "رووداو" رەگەزێکی دوورە رووداوە رەواکان و نارەواکان دەگرێتەوە، پێناسەکردنی بە تەنها "بەش" وەك پێناسەی تاوان بەوەی "سزای لەسەر دەدرێت" یان پێناسە بە

---

[1] ینظر مؤلفنا المنطق القانوني في تصورات ص٨٨

رەگەز و بەشی لەیەکتر نزیك لەگەڵ خستنەسەرێکی تایبەت لـە تایبەتمەندییەکـەی، وەك پێناسەی تاوان بەوەی: "قەدەغراوێکی سزا لەسەر دراوە دژ بە بەرژەوەندی گشتییە".

٤. وێنەی ناتەواو: بریتییە لە پێناسەی شتێك بە تایبەتمەندییەکەی نەك بە خودییەکانی وەك پێناسەی موڵکداری بەوەی دەسەڵاتێکە مافی تاوتوێکردن و بـەکارهێنان و رەنجخـۆری و لـەخۆگرتن بـە خاوەنەکـەی دەبەخشـێت یـان پێناسـەکردنی بـە تایبەتمەندییـەك لـە تایبەتمەندییـەکانی لەگـەڵ رەگـەزی دووریـدا، وەك پێناسـەی تـاوان بـەوەی رووداوێکـە دەستدرێژی پێ دەکرێتە سەر مافی گشتی.

**مەرجەکانی پێناسە:**

لە هەموو پێناسەیەکدا رادە بێت یان وێنە، تـەواو بێـت یـان ناتـەواو ئـەم مەرجانـە بـە مـەرج دەگیرێن:

١. پێناسەکەر و پێناسەکراو بە خود یەکیان گرتبێـت و بـە پێگـە لەیـەکتر جیـاواز بـن، گـەر یەکگرتوو نەبن بە خود ئەوا پێناسەیەکە بە جیابوونەوە، وەك پێناسەی پابەنـدکردن لـە مـادەی (٦٩) لـە یاسـای مـەدەنی عێراقـی راوەسـتاو، بـەوەی: (پەیوەندییـەکی یاسـاییە لـە نێـوان دوو کەسدا، قەرزدەر و قەرزکەر، بە پێی ئەو پەیوەندییە کەسی قەرزدەر هەڵدەستێت بـە داواکـردن لە قەرزکەر بەوەی مافێکی بەرجەستە بگوێزێتەوە یان بـە کارێـك هەڵبسـتێ یـان کارێـك ئـەنجام نەدات)[1] (رابطة قانونية مابين شخصين دائن ومدين يطالب بمقتضـاها الـدائن المـدين بـأن ينقـل حق عينيا أو يقوم بعمل أو يمتنع عن عمل)

ئەمە پێناسەیە بە جیاکردنەوە لە دوو رووەوە پووچەڵە:

یەکەمیان: وشەی "الإلتزام-پابەندبوون" لـە وتـراوی "الإنفعـال"ە[2](بارهێنـان)، لـە کاتێکـدا پەیوەندییە یاساییەکە لە وتراوی "الإضافة" واتە رێژەیـەکی دوویـارەبووەوە لـە نێـوان دوو شـتدا وێناکردنی یەکێکیان لەسەر وێناکردنی ئەویتریان وەستاوە، بۆیە گرێدراوەکە پەیوەندییەکـە یـان

---

[1] برگەی سێیەمی ئەم مادەیە دەقەکەی(گوزارە بە وشەی پابەنـدبوون دەردەبڕێـت) و بـە وشـەی (قـەرز) هەمان مانا دەردەبڕێت کە (مافی تاکە کەس) دەریدەبڕێت.

[2] هەڵچوون بریتییە لە کاریگەربوونی شتێك بە شتێکی تر، وەك چۆن کردار بریتییە لە کاریگـەری شـتێك لـە شتێکی تردا، بۆیە پابەندکردن کردارە و پابەندبوون هەڵچوونە.

ڕژێمەکە لە نێوان قەرزدەر و قەرزداردا وێناکردنی پەیوەندییەکە بۆ لای یەکێکیان لەسەر وێناکردنی پەیوەندییەکە بۆ سەر ئەویتر وەستاوە.

دووەم: پابەندبوون سیفەتێکی تایبەتە بە قەرزدار، پەیوەندی یاسایی سیفەتێکی هاوبەشە لەنێوان قەرزدەر و قەرزداردا، ئەو دووانە لەڕووی خود و پێگەوە لەیەکتر جودان و یەکێکیان بەوی تریان پێناسەناکرێت.

پێناسەی دروست بۆ پابەندبوون ئەوەیە کە: (شاندانە ژێر راپەڕاندنی ئەرکێك بە خۆشی یان بە زۆر کە لەسەری خەریککردنی ئەستۆ بە مافێکەوە بۆ کەسانی تر تا تەولو دەبێت سەر هەڵدەدات)[1]

٢. مەرجە پێناسەکەر ڕۆشنتر بێت لە پێناسەکراو، دروست نییە پێناسەی "ئەستۆ" بکرێت بەوەی(دەفرێکە بۆ مافەکان و ئەرکەکان) چونکە ئەو دەفرە ڕۆشنتر نییە لە ئەستۆی دارایی.

٣. بە مەرج دەگیرێت هیچ کام لەو دووانە لەسەری ئەویتریان نەوەستێت، گونجاو نییە پێناسەی "پابەندبوون" بکرێت بەوەی: (کۆی ئەوەی بۆ مرۆڤ هەیە لە مافەکان و ئەرکەکان)، چونکە وێنا ناکرێت مافەکان و ئەرکەکان بوونیان هەبێت بەبێ بوونی ئەستۆی دارایی، گەر بوونەکەی لەسەر ئەم کۆیە راوەستایە ئەوا دەست بەسەرداگرتن لەسەر دواکراو پێویست دەبوو، سەرباری ئەوەش پێویست دەبوو بۆ مرۆڤ کە کاتی لەدایکبوونی هیچ و ماف و ئەرکێکی بۆ نییە ئەستۆی دارایی بۆ نەبێت، ئەمەش پێچەوانەی کۆدەنگییە کە دەڵێن ئەستۆی دارایی لەگەڵ لەدایکبوونی مرۆڤدا لەدایك دەبێت و بە مردنی مرۆڤ کۆتایی پێ دێت، گەر مافەکان و ئەرکەکان شرۆڤە کران بە: لەخۆگرتنی ئەوەی بە کردار یان بە هێز بوونی هەیە، واتە لە شانوشکۆیدا ماف هەبێت و ئەرکی لەسەر شان بێت لە داهاتوودا، واتە رادەی دەسەڵاتی بۆ ئەو شتە تێکەڵ کردن لە نێوان ئەستۆی دارایی و لێوەشاوەیی پێویستبوونی کامڵ[2] پێویست دەکات.

---

[1] ينظر مؤلفنا نظرية الالتزام برد غير المستحق ص ١٣٠ ومابليها.

[2] ئەوەش بریتییە لە دەسەڵاتی مرۆڤ بۆ ئەوەی ماف هەبێت و ئەرکی لەسەر شان بێت، ئەمەش دیسان پووچەڵە(باتڵە).

٤. پێناسەكە كۆكەرەوە بێت ولە گشتگیر بێت بۆ هەموو تاك(پێكهێنەر)ی پێناسەكراوی، بۆیە پێناسەی "نەنگی ویست" بە "زۆرلێكردن" گونجاو نییە، چونكە هەموو نەنگییەكانی لەئامێز ناگرێت لە هەڵە و تێكەوتن و فریودان و بەرخۆری.

٥. پێناسەكە رێگر بێت لە نەیار، بەوەی هەر شتێك ناكەوێتە ناو پێناسەكراوەكەیەوە نەچێتە ناو پێناسەكەوە، بۆیە نەگونجاوە پێناسەی "كوشتن" بكرێت بەوەی بریتییە لە تاوانی دەستدرێژی لەسەر كەسانی تر، چونكە ئەم پێناسەیە كوشتن و تاوانی تریش لەخۆ دەگرێت، هەر بەو جۆرە گونجاو نییە پێناسەی گرێبەست بەوە بكرێت كە رەفتارێكی یاساییە، چونكە رێگری ناكات لە هاتنە ژوورەوەی ویستی تاكبووەوە.

٦. لەو جۆرانە نەبێت پێناسەی شتێك بكات بە حوكمەكەی، وەك چۆن یاسادانەری عێراقی[1] پێناسەی تەڵاقی جیابوەوە دەكات بەوەی: دروست نییە هاوسەرەكەی بگێڕێتەوە مەگەر بە گرێبەستێكی تازە، چونكە قازی گەر لە بەرلییەوە نەزانێت تەڵاق یان گەڕاوەیە یان جیابووەوە ناتوانێت بەو دوو حوكمە بڕیار دەربكات، بۆیە پێناسەی شتێك بە حوكمەكەی پووچەڵە.

پێناسەی دروست بۆ تەڵاقی گەڕاوە بریتییە لە: (هەموو تەڵاقێك دوای چوونە لای بەبێ بەرانبەر(تەعوین) بە مەرجێك بۆ جاری سێیەم نەبێت، تەڵاقی جیابووەوەش بریتییە لە: (هەموو تەڵاقێك پێش چوونە لا یان پاش چوونە لا بە بەرانبەرێك یان بۆ جاری سێیەم)

---

[1] في قانون الأحوال الشخصية رقم ١٨٨ لسنة ١٩٦٩ المادة (٣٨)

# باسی دووەم:
# ژێربێژی یاسایی لە بەڕاستزانینەکاندا

بەڕاستزانین–وەك باسمان کرد– بریتییە لە قەناعەت بە دروستیی رستەیەکی ڕاگەیاندنی[1] ئەریێ، وەك (هەموو تاوانێك دەستدرێژییە بۆ سەر مافی کەسانی تر) یان نەریێ بێت، وەك: (مرۆڤ مافی رەفتار کردنی لە ماڵ و داراییی کەسانی تردا نییە بەبێ جێگری).

بۆیە بەڕاستزانینەکان وەك وێناکردنەکان وان و بنەمایان بۆ هەیە، و مەرامیشیان بۆ هەیە وەك لەم رۆشنکردنەوەدا هاتووە:

## یەکەم: بنەماکانی بەڕاستزانین:

بریتییە لە پێشەکییە بەڵگەنەویستەکان لەلای کەسی بەڵگەهێنەرەوە بەو بەڵگەنەویستانە بۆی هەیە راست بێت(پڕاوپڕ بێت لەگەڵ واقیع) یان درۆ بێت(پڕاوپڕ نەبێت لەگەڵ واقیع)

ئەوانەش یان بەڵگەنەویستێکن سەلماندنیان ئاتاج بە بەڵگە نییە، وەك متەواتیرەکان و ئەزموونکراوەکان و هاوشێوەکانیان یان بیردۆزەیین وەك دۆزراوە زانستییە نوێیەکان کە لە رێگەی وردبوونەوە و بەڵگەهێنانەوە وەرگیراون.

زانایانی مەنتق زاراوەی "پرس"یان بۆ ئەو پێشەکیانە بەکار بردووە، "پرس"یشیان بەوە پێناسە کردووە کە: (قسەیەکە ئەگەری راست و درۆی هەیە)[2] وشەی "پێشەکی"م لە وشەی "پرس" لا پەسەندتر بوو، چونکە بە مەبەست گیراوە نەك لە خودی خۆیدا، بەڵکو بۆ ئەوەی

---

[1] دەربڕینی رستەی ڕاگەیاندن لەلای زانایانی مەنتق دەربڕینێکی مەجازییە، چونکە مەنتق مامەڵە لەگەڵ بیردا دەکات نەك لەگەڵ وشەدا، وشەکان بۆ شتانی تر بەمەبەستگیراون نەك بۆ خودی خۆیان، واتە زانستی لۆژیك لە رووی ئاماژەیانەوە لەسەر تێگەیشتنەکان لێیان دەکۆڵێتەوە.

[2] تهذیب المنطق للعلامة سعد الدین التفتازاني بشرح الخبیصي للعلامة الشیخ عبیدالله بن فضل الخبیصي /سنة ١٩٦٥/ص٣٣.

ببێت بە پێشەکییەك لە پێشەکییەکانی بەڵگە ئەقڵییە لۆژیکییەکان، پاشان "پرس" لەم سەردەمەدا چەمکێکی تری هەیە کە ئەو چەمکە لۆژیکییە نییە لە پێشەکیدا دەبینرێتەوە، "پرس" یان بارگەیییە یان مەرجییە، بارگەییش یان تایبەتکراوە یان سروشتییە یان هەمووەکییە یان بەشەکییە یان پشتگوێخراوە.

مەرجیش: یان پەیوەستە یان جیابووەوە، پەیوەست: یان پێویستکەرییە یان رێکەوتنییە(تەباییە)، جیابووەوەش یان راستەقینەیە، یان رێگری کۆیە، یان رێگری خاڵیکردنە، وەك لەم رۆشنکردنەوەدا هاتووە:

**أ. بارگەیی:**

رستەیەکی راگەیاندنە لە دوو بەش پێکدێت، یەکێکیان(بەزۆری بەشی کۆتایی) هەڵدەدرێتە لەسەر ئەویتریان(بەشی یەکەم)، یەکەمیان پێی دەوترێت بابەت یان(دراوەپاڵ) دووەمیان پێی دەوترێت هەڵگیراو(پاڵدراو) چونکە مانای بابەتی پێ دەدرێت جا یان بە ئەرێ وەك (بنەڕەت ئەستۆ پاکییە) یان نەرێ وەك (گرێبەستی بێ شایستەیی دانامەزرێت).

**بەشەکانی بارگەیی:**

پرسی بارگەیی لە رووی بابەت و چەندێتییەوە[1] دابەش دەبێت بۆ پێنج بەش:

١.تایبەتکراو(تاکەکەسی): گەر بابەتەکەی کەسێکی دیاریکراو بوو، وەك وتنی: خالید تۆمەتبارە.

٢.سروشتی: گەر بابەتەکەی چییەتی بوو، تیایدا تەماشای کەس نەدەکرا وەك ئەوەی بوترێت: "بەڵگە بەهێزترە لە نیمچە بەڵگە(بەڵگەی لاوەکی)".

٣.هەمووەکی: گەر تەماشکراو لە بابەتدا بریتی بوو لە تاکەکان بە شێوەکی هەمووەکی، وەك (هەموو مرۆڤێك تیاچووە).

٤.بەشەکی: گەر وەرگیراو لە بابەت هەندێ لە تاکەکان بوو وەك (هەندێ خەڵکی سەرپێچی لە یاسا دەکەن).

---

[1] واتە بە هەمووەکی وەك(هەموو مرۆڤێك قسەکەرە) یان بە بەشەکی وەك (هەندێ مرۆڤ نووسەرن)

٥.پشتگوێخرلو: گەر بابەت تاکەکان بوو، چەندێتیان ڕۆشن نەبوبێتەوە نە هەموو نە بەشێك، وەك (خەڵکانێك ژێری بەکارناهێنن لە مامەڵەکردن لەگەڵ کەسانێکی تر).

ب-مەرجی:

ئەوەش لە دوو ڕستە پێکدێت، یەکەمیان مەرجە بۆ بوونی ئەویتریان، ئەمەش دوو بەشە:

**أ.پەیوەستگەریی**: ئەوەیە کە لە دوو ڕستە پێکدێت، یەکێکیان مەرجە بۆ بوونی ئەویتریان، ئەوەش دوو بەشە:

١. پێویستگەریی: گەر یەکێکیان بۆ ئەویتریان پێویست بوو بەهۆی بوونی پەیوەندییەك لە نێوانیان، بەجۆرێك یەکێکیان ببێت بە هۆی ئەویتریان، وەك بوترێت: (گەر ئاو لەسەر ڕووی هەسارەی مەریخ بوونی هەبولیە ژیان بوونی دەبوو) هەروەها وەك (گەر تۆمەتەکە بەسەلمێت تاولنبارکردنی تۆمەتبار پێویست دەبێت)

٢. هەڵکەوتەیی: ئەوەیە کە کۆبوونەوەیان لەسەر پەیوەندییەك بینا نەکراوە بەجۆرێك یەکێکیان وا لیّ بکات ببێت بە هۆ و ئەویتریان هۆبلر، بەڵکو کۆبوونەوەکەیان بە هەڵکەوت بووە.

وەك کۆبوونەوەی نێوان سیفەتە مرۆییەکان و سیفەتە تاولنییەکانی سەربازە ئیتالییەکە کە لە مەیدانی ڕاهێناندا هەشت لە سەرکردە و هاوەڵە سەربازەکانی خۆی کوشت بە هۆیەکی بێبایەخ.

پزیشکی ئیتالی لۆمبرۆزۆ[1] لە سەرئەنجامەکانیدا لە لێکۆڵینەوەی هەندیّ لە سیفەتی مرۆڤ پەیوەندی خستە نێوان هەندیّ لە سیفەتی ئاشکرا و نێوان ئەوەی کە بە سروشت تاولنبار بێت، وەك بچووکی جمگەکان لە تاولنباری دزدا، هەروەها پەیوەندی نێوان چەمانەوە و پێچخواردن و چاڵ و هاوشێوەکانیان لە جومگەکانی مرۆڤدا لەگەڵ ئەوەی کە بە سروشت تاولنبار بن[2].

لەو سیفەتانەی کە لۆمبرۆزۆ بە دەرکەوتەی مرۆڤی بە سروشت تاولنباری دلناوە: فراوانی شەویلگە، گوێی پان، و فروانی گۆشەی چاو و تەماشاکردنی تیژ و چەمانەوەی ناوچاوان بۆ دولوەی سەر بە جۆرێك بەشی خوارەوەی سەر گونجاو نییە لەگەڵ هەموو سەردا، هەروەها

---

[1] لۆمبرۆزۆ لە شاری بافیا لە ئیتالیا ساڵی ١٨٣٨ لەدلیك بووە.

[2] ينظر نظريات علم الاجرام الاستاذ عبدالجبار عريم المرجع السابق ص ٦٤ ومابليه.

بەرزبوونەوەی ئێسکی گۆنا، لوتی کرلوەی کەمێك شۆڕبووەوە بۆ خوارەوە بەشێوەی چەماوە، فرلوانی دوو کونەلوت و هاوشێوەکانی ئەمانە[1].

رەخنە لەم ئاراستەیە گیراوە بەوەی زانستی نوێ سەلماندوویەتی هیچ سیفەتێك لە سیفەتی جەستەیی یان توێکاری لە خۆیدا هێزی ئەوەی نییە ببێتە بنچینەیەك بۆ ئەنگێزەیەکی تاوانکاریانە.

لە راستیدا بەستنەوەی ئەم سیفەتانە بەوەی خاوەنەکانیان بە سروشت تاوانبارن لە رێگەی هەڵکەوتەوەیە و هیچ جۆرە پێویستبوونێك لە نێوانیاندا نییە، چونکە واقیع سەلماندوویەتی کە زۆرێك لە خەڵکی خاوەنی ئەو سیفەتانەن و هیچ جۆرە رەخنەیەك لەسەر ناکا و نیێتی باش و هەڵسوکەتیان لە بەریەك کەوتنیان لەگەڵ کەسانی تر بوونی نییە.

**ب. مەرجی جیابووەوە:** ئەمەش بریتییە لە پێشەکیگەلێك(پرسگەلێك) کە ئەقڵ تیاندا بڕیار دەدات بە نەرێکردن یان نەرێ نەکردنی نێوانیان، ئەوەش سێ بەشە:

١. جیابووەی راستەقینە: ئەوەیە کە بە نەرێکردنی نێوان دوو پێشەکی بوون و نەبوون بڕیاری لێ دەدرێت، وەك مادەی(٦٧) لە یاسای مەدەنی ئوردەنی رلوەستاو کە دەقەکەی: (ماف یان تاکەکەسییە یان بەرچاوە یان مەعنەوییە) لە ترازووی مەنتقدا ئەم دەقە یاساییە بە پرسێکی سەربەخۆی راستەقینە دادەنرێت، ناتولنرێت ئەم بەشانە لە یەك جێگەدا کۆبکرێنەوە گەر مەبەست بە ماف مانا گشتییە گشتگیرەکەی بێت بۆ لایەنی دارایی و نادارایی، لە هەمان کاتدا خاڵی نییە لە یەکێك لەوانە.

٢. جیابووەوەی رێگر لە کۆکردنەوە: ئەوەش ئەوەیە کە نەرێکردن تیایدا لە کۆکردنەوەدایە پێکەوە لە هەر یەکێکیاندا نەك لە خاڵیبوونی لە پێکەوەبوون، وەك ئەوەی بوترێت ئەم کوشتنە یان نزیکبوەوەیە لە رەوشێکی توندکرلو یان نزیکبووەوە بە رەوشێکی سووککرلو، ئەو دوو رەوشە پێکەوە کۆنابنەوە بەهۆی یەك شتەوە ئەویش بوونی نەرێکردنی نێوانیانە، بەڵام دەگونجێ هەردووکیان پێکەوە دوابکەون، بەوەی کوشتنەکە سادە بێت و نزیك نەبووبێتەوە بە رەوشی توندکرلو و سووککرلو، وەك لە مادەی (٤٠٥) لە

[1] المرجع السابق ص ٦٦

یاسای سزای عێراقی راوەستاو، کە دەقەکەی: (هەر کەس بە ئەنقەست کەسێك بکوژێت بە بەندکردنی هەتاهەتایی یان کاتی سزا دەدرێت).

٣. جیابووەوەی رێگر لە خاڵیبوونەوە: کۆکردنەوەی نێوان دوو پێشەکییەکە دروستە، بەلآم ناکرێت لە هەردووکیان خاڵی بێت، وەك ئەوەی دەوترێت: تۆمەتبار یان تاوانبارە یان سزا نادرێت، بۆیە دەگونجێ تاوانبار بێت و لە هەمان کاتدا سزا نەدرێت بەهۆی بوونی رێگرێك لە رێگرەکانی بەرپرسیارێتی سزایی وەك شێت یان منداڵێك کە جیاکاری پێ ناکرێت، یان رێگری لە سزادان وەك وەستانی پیادە کردنی سزاکە، بەلآم ناگونجێ لە هەردووکیان خاڵی بێت، ئەگەر نە، پێویست دەبوو تاوانبار بێت و سزا بدرێت، ئەمەش هیچ یاسایەك لە جیهاندا دانی پیادا نانێت، وەك لە مادەی (٣٩٥) لە پرۆژە یاسای مەدەنی عێراقی: (دروست نییە بۆ یەکێك لە دوو کەسەکەی گرێبەست لە گرێبەستەکە پەشیمان ببێتەوە یان گۆڕانی تێدا بکات مەگەر بە داخوازی دەقی یاسا یان بە پێکهاتنی دوو لایەنەکە)، ئەم دەقە پرسێکی سەربەخۆی(جیابووەوەی) رێگرە لە خاڵیبوونەوە بۆیە پەشیمان بوونەوە و گۆڕان دروست نییە مەگەر بە رازیبوونی هەردوو لا یان دەقێکی یاسایی، بەلآم کۆکردنەوەی نێوانیان دروستە، بەوەی پێکهاتنی رازیبوون ئامێز لە پاڵ لایەنی دەقی یاساییدا بوونی هەبێت.

**دژیەکی لە نێوان پێشەکییەکاندا(پرسەکاندا):**

زانایانی مەنتق دژیەك پێناسە دەکەن: بەوەی: (جیاوازی نێوان دوو پرس بەجۆرێك خودی[١] جیاوازییەکە پێویست دەکات راستی هەردوو[٢] درۆی ئەویتری لێ بکەوێتەوە و بە پێچەوانەشەوە[٣]) لەسەر ئەم حەقیقەتی دژیەکییە بینا دەکرێت: دوو دژیەکەکە بە یەکەوە کۆ نابنەوە و بەیەکەوە بەرزنابنەوە. بۆ دەستەبەرکردنی دژیەکی یەکێتی دوو دژیەکەکە لە نۆ باردا و جیاوازییان لە سێ باردا بە مەرج دەگیرێت:

---

[١] واتە بۆ خودی جیاوازی

[٢] واتە هەر یەك لە دوو پرسەکە

[٣] واتە لە درۆی هەموو راستگۆیی ئەوی تر پێویست دەکات. ینظر تهذیب المنطق المرجع ص ٥٤

**أ.یەکێتی لە تۆ باریدا، ئەمانەن:**

١. یەکێتی بابەت: واتە حوکم بەسەرداکراو یان دراوەپاڵ، دژیەکی نییە لە نێوان (گرێیەستی هەموو کەسێکی تەواو شایستە دروستە) لەگەڵ (گرێیەستی کەسی ناشایستە پووچەڵە) بەهۆی نەبوونی یەکێتی بابەتەوە.

٢. یەکێتی هەڵگیراو: دژیەکی نییە لە نێوان (کەسی ناشایستە لە رووی مەدەنییەوە پرسیاری لێدەکرێت) لەگەڵ (کەسی ناشایستە لە رووی سزایییەوە پرسیاری لێ نەکرێت) لە حاڵەتی زیان گەیاندن بە کەسانی تر.

٣. یەکێتی کات: دژیەکی نییە لە نێوان (فرۆشراو لە دەستەبەریی فرۆشیاردایە) واتە پێش رادەست کردن، لەگەڵ(فرۆشراو لە دەستەبەریی فرۆشیاردا نییە) واتە دوای فرۆشتن و رادەست کردن.

٤. یەکێتی شوێن: دژیەکی نییە لە نێوان (یاسای سزای عێراقی بەسەر ئەو تاوانانەدا جێبەجێ دەکرێت کە ئەنجام دراون) واتە ولاتی عێراق، لەگەڵ (جێبەجێ ناکرێت بەسەر ئەو تاوانانەی ئەنجام دەدرێن) واتە لە دەرەوەی عێراق.

٥. یەکێتی مەرج: دژیەکی نییە لە نێوان (تۆمەتبار سزا دەدرێت) واتە بە مەرجی سەلماندنی تۆمەتە ئاراستەکراوەکە بۆی، لەگەڵ (تۆمەتبار سزا نادرێت) واتە بە مەرجی ئەستۆپاکی لە تۆمەتەکە، هەروەها وەك(یاسای کۆن جێبەجێ دەکرێت) واتە گەر لە بەرژەوەندی تۆمەتبار بوو، لەگەڵ (یاسای کۆن جێبەجێ ناکرێت) واتە گەر یاسا تازەکە لە بەرژەوەندی تۆمەتبارەکە بوو.

٦. یەکێتی دانەپاڵ: دژیەکی نییە لە نێوان(تۆمەتبار تاوانبار دەکرێت) واتە بۆ ئەو تاوانەی کە ئەنجامی داوە، لەگەڵ (تۆمەتبار تاوانبار ناکرێت) واتە بۆ ئەو تاوانەی کە نە سەلماوە ئەو ئەنجامی دابێت.

٧. یەکێتی گوفتار و کردار: دژیەکی نییە لە نێوان (کۆرپەلە کەسایەتییەکی یاسایی هەیە) واتە بە ئامادەیی و هێز، لەگەڵ (کۆرپەلە کەسایەتییەکی یاسایی نییە) واتە بە کردار پێش لەدایکبوونی.

٨. یەکێتی هەموو و بەش: دژیەکی نییە لە نێوان (تەلاقدراو شایستەی هەموو مارەیی دەبێت) تەلاقبدرێت دوای چوونەلا، لەگەڵ (تەلاقدراو شایستەی بەشێك لە مارەیی نابێت) وەك ئەو کاتەی تەلاق بدرێت پێش چوونەلا.

٩. یەکێتی هێزی پابەندکردن: دژیەکی نییە لە نێوان ئایەتێکی قورئانی و فەرموودەیەکی ئاحاددا لە کاتی بەرهەڵستی کردنی یەکتردا، بەهۆی نەبوونی هاوتاکردنەوە، بۆیە یەکەم بەسەر دووەمدا پێشدەخرێت، هەر بەو جۆرە دژیەکی نییە لە نێوان ڕێسایەکی یاسایی و ڕێسایەکی دەستووریدا لەباری بەرهەڵستی کردنی یەکتردا یەکەم پێش دەخرێت بەسەر دووەمدا، هەر بەو جۆرە دژیەکی نییە لە نێوان ڕێسایەکی یاسایی و بڕیارێکی کارگێڕیدا، چونکە یەکەم پێش دەخرێت لەباری بەرهەڵستیکردندا.

**ب.جیاوازی لە سێ باردا:**

١. جیاوازی لە چۆنێتیدا: "ئەرێ و نەرێ"! لە زانستی مەنتقدا، پێویست(واجب) و شیاو(گونجاو) و حەرام و دروست و پووچەڵ(باتل) و هاوشێوەکانی ئەمانە لە شەرع و یاسادا، دژیەکی نییە لە نێوان واجبنەبوونی وەسێت بۆ میراتگر لەگەڵ شیاوبوونیدا.

٢. جیاوازی لە چەندێتیدا: بەوەی یەکێکیان هەمووەکی بێت و ئەویتریان بەشەکی بێت، دژیەکی نییە لە نێوان دوو هەمووەکیدا بەهۆی شیاوی درۆیوونیان پێکەوە، وەك (هەموو زیندوویەك مرۆڤە، شتێك نییە لە مرۆڤدا زیندوو بێت) هەردوو بەشەکە درۆیە و دژیەکی لە نێوانیاندا نییە.

٣. جیاوازی لە ڕوویەکەوە: دژیەکی نییە لە نێوان (هەموو مرۆڤێك نووسەرە) واتە بە ئامادەیی، لەگەڵ (هەموو مرۆڤێك نووسەر نییە) واتە بە کردار یان بە زەرورەت، شایەنی باسکردنە زانایانی یاسا لە لێکدانەوەکانیاندا لە نێوان "بەرهەڵهەستکاری" و "دژیەکی" تێکەڵیان بۆ دروست بووە، زۆرجار "دژیەکی"یان لە جێگەی "بەرهەڵستکاری" بەکارهێناوە، لەگەڵ ئەوەی ئەو دوولە جیاوازن، دوو بەرهەڵستکار بەیەکتر دەگونجێ کۆبکرێنەوە لە هەندێ باردا، لەولەشە یەکێکیان پارسەنگ بکرێت بەسەر ئەویتریاندا لە هەندێ باری تردا، گەر کۆکردنەوە و پارسەنگ کردن گونجاو نەبوو ئەوا دوانیەکەیان سڕاوەیە بۆ پێشکەوتووەکەیان لە یاسادانانداا، ئەمە ئەوەیە کە پێی دەوترێت: (سڕینەوەی ناوتوێژانە)

## دووەم: مەرامی بەراستزانینەکان:

مەرامی بەراستزانینەکان بریتییە لە: پێوانەی ئەقڵی[1]، زانایانی مەنتق پێوانەی ئەقڵیان پێناسە کردووە بەوەی: (وتەیەکی دانراوە لە کۆمەڵە پرسێك(کۆمەڵە پێشەکییەك) کە لە خودی خۆیاندا وتەیەکی تر پێویست دەکەن)[2]

بەشەکانی پێوانەی ئەقڵی دوانن: هەڵواردەیی و جووتهاتنی.

**یەکەم: پێوانەی هەڵواردەیی ئەقڵی**: ئەوەیە کە ئەنجامەکەی تیادا باسکراوە بە جەوهەر[3] و رووالەتی[4]، ئەمەش دیسان دوو بەشە: پەیوەستی و جودایی.

١. پێوانەی ئەقڵی پەیوەستی: مەرجی پەیوەستکەر لە دوو پێشەکی پێکدێت یەکەمیان پێی دەوترێت "پێشخراو"[5] و ئەوتریان پێی دەوترێت "بەدوادهاتوو".

سەلماندن و جێگیرکردنی پێشخراو سەلماندنی بەدوادهاتووی لێوە پەیدا دەبێت، نەریّ کردنی بەدوادهاتووش نەرێی پێشخراوی بەدوادا دێت، بۆ نموونە گەر وترا: گەر تۆمەت سەلما

---

[1] جیاوازی هەیە لە نێوان پێوانەی شەرعی و پێوانەی ئەقڵی، پێوانەی شەرعی بریتییە لە پێگەیاندنی بەشەکی کە دەربارەی دەقێکی تایبەت نەهاتووە بە بەشەکییەکی تر کە دەقێکی تایبەت دەربارەی هاتووە بەهۆی بەشداربوونیان لە هۆی حوکمەکەدا، وەك بێبەش کردنی وەسێت بۆکراوی بکوژ بۆ وەسێتکەرەکەی بە میراتگری بکوژ بۆ میرات لێگیراوەکەی، هۆی هاوبەش لە نێوانیاندا بریتییە لە پارێزگاری رۆحی کەسی بێگوناه.

[2] واتە ئەنجام

[3] واتە هەردوو بەرەکەی

[4] واتە وێنەکەی

[5] رەهەندە وێناکراوەکان چوارن: نەرێکردنی پێشکەوتوو و نەرێکردنی و نەریّ کردنی ئەوەی دوای ئەو و نەریّ کردنی، بەلام نەرێی پێشکەوتوو نەرێی دوای ئەو پێویست ناکات، و نەرێی دوای ئەو نەرێی پێشکەوتوو بەرهەم ناهێنێت، نهێنی لەوەدا بەدوادهاتوو لە پێوانەی ئەقڵی پەیوەستدا بۆ پێشکەوتوو پێویستە و پێویستیش بۆی هەیە گشتی بێت و لەگەڵ ئەو پێویستکراوەکە و پێویستکراوێکی تردا کۆببێتەوە، بۆیە نەریّ کردنی پێویستکراوی تایبەت نەرێکردنی پێویستکەری گشتی پێویست ناکات بەهۆی دروستی دەستەبەربوونی لەگەڵ پێویستکراوێکی تردا، هەر بەو جۆرە نەریّ کردنی پێویستێکی گشتی نەریّ کردنی پێویستکراوێکی تایبەت پێویست ناکات، بۆ نموونە، وزەی گەرما گشتییە پێویستکراوەکەی لەوانەیە ئاگر بێت لەوانەشە تیشکی خۆر بێت یان کارەبا بێت، یان لەوانەیە شتێکی تر بێت، بۆیە نەرێکردنی بوونی وزە بوونی کارەبا پێویست ناکات، وەك چۆن نەریّ کردنی کارەبا نەرێکردنی وزە پێویست ناکات، بەهۆی دروستی کۆبوونەوەی لەگەڵ پێویستکراوێکی تر.

ئەوا تۆمـەتبار بـە تاوانبـارکردن شایسـتە دەبێـت، بـەڵام سـەلماوە شایسـتەبوونی تۆمـەتبار بـە تاوانبارکردن بەرهەم نێت، گەر وترا بـەڵام شایسـتەی تاوانبـارکردن نـەبوو کـەواتبوو نەسـەلماوی تۆمەتەکە بەرهەم نێت.

٢. هەڵوارەدەی ئەقڵی جودایی: ئەمەش وەك پێشتر روونمان کردەوە سێ بەشە:

أ. جودایی راستەقینە(رێگری کۆکردنەوە و رێگری خاڵیبوونەوە): سەلماندی هەر یەك لـە دوو بەشەکەی نەرێی ئـەویتر بەرهـەم دەهێنێـت، نـەرێی هـەردووکیان جێگیرکردنـی ئـەویتر بەرهەم دەهێنێـت، چـونکە جـودایی راسـتەقینە پێـك دێـت لـە شـتێك و دژەکـەی، یـان یەکسان بە دژەکەی.

دوو دژیەیەکیش نە کۆدەبنەوە و نە بەرزدەبنەوە.

ب.بە تەنها رێگر لە کۆبوونەوە: سەلماندنی هەر یەك لە دوو بەشەکەی نەرێی ئـەویتری لێـوە بەرهەم دێت بەهۆی نەگونجاوی کۆبوونەوەیان.

ج.بەتەنها رێگر لە خاڵیبوون: نەرێ کردنی هەر یەك لـە دوو بەشـەکەی جێگیرکردنـی ئـەویتر بەرهەم دێنێت بەهۆی نەگونجاوی خاڵیبوون لە هەردووکیان پێکەوە.

**دووەم: پێوانەی ئەقڵی جووتهاتنی**: ئەوەیە کە ئەنجام بـە جەوهـەر و وێنـەوە تیایـدا بـاس ناکرێت، ئەوەش دوو بەشە: بارگەیی و مەرجی.

**بەشی یەکەم: جووتهاتنی بارگەیی**: ئەوەیە لە دوو پێشەکی بارگەیی پێك دێـت، وەك: مـرۆڤ ژیرە(پێشەکی بچووك)، هەموو ژیرێك بەرپرسە لـە هەڵسوکەوتەکانی(پێشـەکی گـەورە)، مـرۆڤ بەرپرسە لە هەڵسوکەوتەکانی(ئەنجام).

ئەم پێوانەیە ئەمانە لە ئامێز دەگرێت:

١.داواکراو یـان ئەنجام(هـەموو مرۆڤێك بەرپرسـە لـە هەڵسـوکەوتەکانی) لـەو رووەوە کـە لـە وێناکردندا پێشخراوە پێی دەوترێت داواکراو و ئامانج و مەرام، لەو رووەوە کـە دواخـراوە لـە جێگیرکـردن پێـی دەوترێـت ئـەنجام و سـەرئەنجام و لـەلای فەیلەسـوفانیش پێـی دەوترێت فەلسەفە.

٢.بورهان: بریتییە لە بەڵگەیەکی ئەقڵی کە لە دوو پێشەکی بارگەیی پێکهاتووە.

أ. رادەی بچـووکتر: ئـەوەش بریتییـە لـە بابـەتی داواکراو(مـرۆڤ) بـە بچـووك نـاوبراوە لەبەرئەوەی زۆرجار بچووکترین تاکە.

ب. رادەی گەورەتر: بارگەیی دواکراو(بەرپرس لە هەڵسوکەوتەکانی) بەو ناوە ناونراوە لەبەر ئەوەی زۆرجار زۆرترین تاکە.

ج. رادەی مامناوەند(ژێر): ئەوەی کە دووبارە بووتەوە و میانەگیری کردووە لە نێوان رادەی بچووکتر و رادەی گەورەتردا، بۆیە پێی دەوترێت رادەی مامناوەند(رادەی میانەگیر).

٦.بچووك: بریتییە لە پێشەکی یەکەم، بەو ناوە ناونراوە چونکە رادەی بچووك دەگرێتە خۆ.

٧.گەورە: بریتییە لە پێشەکی دووەم، بەو ناوە ناونراوە چونکە رادەی گەورە لەئامێز دەگرێت، ئەم جۆرە پێوانەیە پێی دەوترێت پێوانەی جووتهاتنی بەهۆی جووتبوونی سێ رادەکەوە تیایدا(رادەی بچووکتر و رادەی گەورەتر و رادەی مامناوەند)

ئەو نموونە ئاماژەبۆکراوە لە جێبەجێ کردنی پێوانەی جووتهاتنی پێی دەوترێت شێوەی یەکەم[1].

## مەرجەکانی بەرهەمهێنانی شێوەی یەکەم:

بۆ بەرهەمهێنانی شێوەی یەکەم ئەنجامێك بە مەرج دەگیرێت کە سێ مەرجی بۆ هەیە، ئەمانەن:

١.پێشەکی یەکەم ئەرێ بێت و نەرێ نەبێت.

٢.بە کردار بوونی هەبێت نەك بە ئامادەیی و هێز.

٣.پێشەکی گەورە هەمووەکی بێت نەك بەشەکی.

**بەشی دووەم: پێوانەی جووتهاتنی مەرجی:** ئەوەیە کە پێکێت لە مەرجئامێزە پەتییەکان یان مەرجئامێزەکان و بارگەکان، لەبەر کەمی بوار لەم باسەدا تەنها نموونەیەك لە جێبەجێ کردنەکانی جۆری یەکەم دەهێنینەوە، کە ئەمەیە:

---

[1] دەرچە بەرلوردکاریەکان چوار شێوەی هەیە: یەکەم ئەوەیە کە رادەی ناوەند لە بچووکەکەدا هەڵگیراوە و لە گەورەکەدا دانراوە، وەك ئەو نموونەی سەرەوە، لە دووەمدا رادەی ناوەند هەڵگیراوە لە هەردووکیاندا، سێیەمیان لە هەردووکیاندا دانراوە، لە چوارەمدا پێچەوانەی یەکەمە واتە لە گەورەکەوە هەڵگیراوە و لە بچووکەکەدا دانراوە. سێ شێوەکەی تر و مەرجەکانیان پشتگوێخراون بەهۆی نەبوونی بوارەوە لە لایەکەوە و هەروەها لەبەر ئەوەی شێوەی یەکەم سەرەکییە لە نێوان ئەم شێوانەدا، چونکە ئەوانی تر بۆ ئەو دەگەڕێنەوە بە مەرامی بەرهەمهێنانی رازیکەر.

گەر مرۆڤ قەرزدار بێت پابەندبوون بوونی هەیە.

هەتا پەبەندبوون بوونی هەبێت پێویستە وەفادار بێت پێی.

لێیەوە بەرهەم دێت: گەر مرۆڤ قەرزدار بێت پێویستە وەفادار بێت پێی.

**پێوانەی بورهانی:** ئەو پێوانەیە کە هەر هەموو پێشەکییەکانی یەقینین، دابەش دەبێت بۆ بورهانی کارتێکەر و بورهانی کارتێکراو.

**بورهانی کارتێکەر:** بریتییە لە بەڵگەهێنانەوە بە هۆ(کارتێکەر) لەسەر ئاسەوار، وەك بەڵگەهێنانەوەی پزیشکانی پیسپۆڕ بە بوونی بەکتریا و مشەخۆرەکان لە خوێنی نەخۆشدا دوای دۆزینەوەی بە شیکردنەوەی لە تاقیگەکاندا لەسەر دیاریکردنی جۆری نەخۆشییەکە کە نەخۆش(خاوەن خوێنەکە) پێیەوە گرفتارە، هەروەها وەك بەڵگەهێنانەوەی پزیشکی دادوەر بە ئامرازی بەکاربراو لە جێبەجێ کردنی تاواندا لەسەر جیاکاریی نێوان بوونی تاوانەکە لە ئەسەری کارێکی تاوانەوە لە کەسانی ترەوە یان ئەسەری کاری خۆکوژی لە خودی قوربانییەکەوە.

**بەڵگەی: کارتێکراو:** ئەوەش بریتییە لە بەڵگەهێنانەوە بە بوونی ئەسەر لەسەر بوونی هۆ(کارتێکەر)، وەك بەڵگەهێنانەوە بە ئەسەری تاوان بە رێگەی زانستی نوێ لەسەر دۆزینەوەی تاوان و دیاریکردنی کەسی تاوانبار، لە پیادە کردنەکانیدا لە لێکۆڵینەوەی تاوانکاریدا بەڵگەهێنانەوەی کەسانی شارەزا بە ئاسەواری جێپەنجە یان ئاسەواری چەکی تەقە یان ئاسەواری سوتانی ئەنقەست یان ئاسەواری جێپێ یان ئامێر یان تایە یان شانەی جەستە یان قژ و موو یان پەڵەی خوێن یان شلەی مەنەوی یان میز یان لیکی دەم، و هاوشێوەکانی ئەمانە. ئەم ئاسەوارانە و هاوشێوەکانیان دەکرێنە بەڵگە بۆ سەلماندنی تاوان یان دیاریکردنی کەسی تاوانبار، شایەنی باسکردنە ئەنجامی پێوانەی ئەقڵی شوێنی کەم بایەخترین پێشەکییەکانی دەکەوێت، گەر یەکێك لە پێشەکییەکانی گومانئامێز بوو ئەنجامی پێوانەکە گومانئامێز دەبێت، گەر نەرێیی(نێگەتیڤ) بوو ئەنجامەکە نەرێیی دەبێت، گەر بەشەکی بوو ئەنجامەکە بەشەکی دەبێت.

# بەشی حەوتەم

# لۆژیکی قەزایی

لۆژیکی قەزایی بریتییە لە رەچاوکردنی قازی بۆ ریساکانی مەنتق لە بەدەستهێنانی نەزانراو(بڕیاری دادپەروەر)دا لەو زانیاریانەوە کە پێشکەشی دەکرێت پێش یان لە کاتی دادبینی قەزاییدا لە بەرزکردنەوەی داواوە بۆ گۆکردن بە بڕیارەکە و بەدەستهێنانی پلەی کۆتاهێنان، هەروەها رەچاوکردنی ریسا مەنتقییەکان کە پێویستن لە پارسەنگ کردنی بەڵگەکان و زانیارییە دژبەیەکەکان، هەروەها لە قەناعەت پێکردنی قازی بەوەی دڵی بەلایدا یەکلا دەبێتەوە و پاشان رووبەڕووبوونەوەی تانە قەزاییەکان و بینا لەسەر ئەمە لێکۆڵینەوەی ئەم بابەتە دابەش دەبێت بۆ سێ باس، یەکەمیان تایبەت دەکرێت بە پێناسە بە پارسەنگدان و پارسەنگگەرەکان و دووەم بەدەستهێنانی قەناعەت لە بەڵگە یەکلاکەرەوەکانەوە، و سێیەمیش بۆ رووبەڕووبوونەوەی تانە قەزاییەکان.

# باسی یەکەم:
# پارسەنگدان و پارسەنگکەرەکان

پارسەنگدان بریتییە لە بەهێزکردنی یەکێك لە دوو بەڵگەی گومانئامێز لە دەق و بەڵگەکان و هاوبەڵگەکان بە پارسەنگکەرێکی یاسایی بەسەر ئەویتریاندا و پشتگوێخستنی ناپارسەنگکراوەکە، پارسەنگکردن کردەیەکی ئیجتیهادییە شان لەسەر پاڵپشتێکی یاسایی دادەدات کە قازییەکە لە پارسەنگاندا بۆی دەگەڕێتەوە و شانی لەسەر دەدات بەهۆی بەدەستهێنانی قەناعەت بە پارسەنگەکەرەکە پاشان بڕیاردان لە رووی ئەوەی پێیگەیشتووە و دڵی لەسەری دامەزراوە و یەکلابووەتەوە.

## مەرجەکانی پارسەنگدان:

لە گرنگترین مەرجەکانی پارسەنگدان:

١.ئەمادەیی بەڵگەکان بۆ پارسەنگدان، قازی ئاتاجی کردەی پارسەنگدان نابێت تەنها لە حاڵەتی راستبوونەوەی بەرهەڵستی کردنی نێوان بەڵگە گومانئامێزەکان نەبێت، ئەو بەڵگانەی پەیوەندییان هەیە بە بابەتی کێبەرکێ لەسەر کراو، قازی ئاتاجی گەڕان نییە بە دوای پارسەنگکەرەکاندا لە باری بەرهەڵستی کردنی دوو بەڵگەی براوەدا، چونکە بەرهەڵستی کردن لەو بارەدا هاو واتای دژیەکییە، راستی یەکێك لە دوودژیەکەکە درۆی ئەویتریان دەسەلمێنێت، هەر بەو جۆرە دروستیی یەکێك لەو دوانە پووچبوونەوەی ئەویتریان نیشان دەدات، ئەو دوانە نە کۆدەبنەوە و نە دژیەکییەکەیان بەرزدەکرێتەوە، لە باری دژیەکی نێوان دوو دەقدا پێویستە لەسەر قازی سەرنج بدات و بزانێت کامیان دواتر یاساڕێژی بۆ کراوە وەك بۆ سڕەرەوەی ئەوەی پێشوو تەماشای بکات، بۆیە بەرهەڵستی لە نێوانیان راست نابێتەوە لەدوای زانست بە بەرواری یاساڕێژییان.

هەر بەو جۆرە بەرهەڵستی راستنابێتەوە لە نێوان بەلگەیەکی یەقینی و بەلگەیەکی گومانئامێزدا، هەروەها بەلگەیەکی یەقینی و بەلگەیەك کە جێگەی شکە و وەهمی تێکەوتووە، لەو بارەدا قازی ئاتاج نییە بەدوای پارسەنگکەردا بگەڕێت، چونکە هەمیشە یەقین لە خودی خۆیدا لەپێشترە بەسەر ئەوانەی هێزیان کەمترە لە دەق و بەلگەکان.

هەر بەو جۆرە بەرهەڵستی لە نێوان دەقی دەستووری و دەقی یاسایی، لەسەر قازی پێویستە کار نەکات بە هیچ دەقێکی نادەستووری و بەدوای پارسەنگدا نەگەڕێت.

هەمان شت بڵێ بۆ بەرهەڵستی نێوان یاسا و رێنموونییە وەزارییەکان.

٢.ئەهلییەتی قازی بۆ پارسەنگدان: چونکە کردەیەکی ئیجتیهادییە و هەموو کەسێك ناتوانێت بەو کارە هەڵبستێت گەر لێوەشاوەیی ئیجتیهاد کردن و ئەقڵییەتی بەراورد پێکردنی لە نێوان بەلگە و رۆشنکردنەوەکاندا تێدا نەبێت، بۆیە لێوەشاوەیی داواکراوە با لە هەندێ پرسیشدا بێت بەبێ هەندێکی تر، بە مەرج ناگیرێت قازییەکە موجتەهیدی رەها بێت لە هەموو بابەتێکدا و لە هەموو مەیدانەکاندا.

٣.بوونی دەسەڵاتی خەملاندن بۆ قازی لە راستکردنەوەی بەلگەی سەلماندنی پێشکەشکراوی نەیارەکان لەناو داواکاندا، بۆیە پێویستە قازی سەرپشك بێت لەرووی یاساوە بۆ هەستان بە کردەی بەراوردپێکردن و هەڵسەنگاندن و پارسەنگدان..

٤.بوونی پارسەنگکەرێك کە پشتی پێ ببەسترێت و بتوانرێت بەکاربهێنرێت لە پارسەنگدانی یەکێك لە دوو بەرهەڵستکارەکە بەسەر ئەویتریاندا.

## پارسەنگدان و ئەو زاراوانەی کە پەیوەندارن:

هەندێ زارلوە هەن کە پەیوەندارن بە پارسەنگدانەوە، بەلآم لە حەقیقەت و واقیعدا پارسەنگکەر نین، لەوانە:

**یەکەم: گریمانەی یاسایی:** لەسەر گریمانەی پێچەوانە بە واقیع راستدەبێتەوە، ئەم گریمانەیە یان قەزاییە یان یاسایی، یەکەمیان بە زۆری لە کارە قەزاییەکاندا شانی لەسەر دانادرێت، بە پێچەوانەی دووەمەوە.

أ.گریمانەی قەزایی: لە جێبەجێ کردنەکانی گریمانەی قەزای فەرەنسی هەڵەی خاوەن کارگە لەدوای شۆڕشی پیشەسازی ئەورووپی بە مەبەستی باریووکردنەوەی کرێکاری تووشبوو بە نەخۆشییەکی بەردەوام لە کاتی بەکارهێنانی بۆ ئامێرە تەکنەلۆژییەکان لە کارگەدا، بڕیاری قەزای فەرەنسی بە باریووکردنەوە بیناکراوە لەسەر بنچینەی بەرپرسیارێتی کەمتەرخەمی کە رەگەزەکانی بریتییە لە هەڵەی خاوەن کارگەی گریمانەیی و ئەو زیانەی تووشی کرێکارەکە بووە و پەیوەندی هۆکەرایی نێوانیان، ئەم گریمانەیە لە زانستی مەنتقدا پێیدەوترێت "سەفسەتە"، ئەوەش بریتییە لە پێوانەی لێکدراو لە وەهم و ئەندێشە، مەبەست لێی بەهەڵەدا بردنی کەسی نەیار و بێدەنگ کردنییەتی[1] لەلای فەیلەسوفان پێی دەوترێت"حیکمەتێکی وەهمئامێز"[2]، کاتێ بەلگەهێنەر بە تێکچوونی ئەم بەلگەیە دەزانێت پێی دەوترێت"بەلگەهێنانەوەی پووچەڵ"

ئەم گریمانەیە لە دەروازەی بەرپرسیارێتی کەمتەرخەمییەوە نییە وەك قازییە فەرەنسییەکان بانگەشەیان بۆ کرد، بەڵکو لە دەروازەی بنەمای (سزای تاوانانە(الغرامة) بەپێی قازانجی بەرانبەرە)، وەك چۆن شەریعەتی ئیسلام دانی پێداناوە، قازانجەکە بریتییە لە قازانجی کارگەکە کە بۆ خاوەنەکەیەتی، بۆیە تاوانانەکەی(دەستەبەرکردنەکەی) لەسەر ئەوە و پێویستە لەسەری باریووی کرێکاری زیانبەرکەوتوو بکاتەوە کە بەشداری کردووە لە دروستکردنی قازانج بۆ کارگەکە، ئەم رێسایە دەقە و ئیجتیهاد نییە، بەڵکو لەسەر زمانی پێغەمبەر(ﷺ) هاتووە و بە گوزارەی جۆراوجۆر گوازراوەتەوە[3].

ب.گریمانەی یاسایی: ئەوەیە کە یاسا گریمانەکەی دەکات، وەك گریمانەی کەسایەتییەکی مەعنەوی کە یاسا دانراوەکان لە دەوڵەتانی جیهاندا دانیان پیادا ناوە، لەوانە یاسای مەدەنی عێراقی رلوەستاو لە مادەی (٤٧)، ئەم گریمانەیە پێویستە بۆ بەردەوامی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان و هەروەها تایبەت بە ماف و پەندبوونە دلرایی و ناوەکی و نێونەتەوەییەکان.

---

[1] البرهان للكلنبوي/ المرجع السابق/ص٣٩٨.

[2] المعجم الفلسفي/د جميل صليبا١/٦٥٨

[3] لەوانە ئەوەی کە لە "مجلة الأحكام العدلية(٨٥)"دا هاتووە(خەراج بە دەستەبەرکردنە) فەقیهەکان گوزارەی تریان بەکارهێناوە لەوانە(نیعمەت بە نیقمەت) و (نیقمەت بە نیعمەت)

ئەوەش کە تایبەتە بە پرسە سزاییەکان بەرپرسیارێتی سزایی نادرێتە پاڵ کەسێکی مەعنەوی، بەڵکو لە کەسێکی سروشتی پرسیار دەکرێت کە نوێنەری کەسێتی مەعنەوی دەکات، چونکە جێگەی ئەم بەرپرسیارێتییە بریتییە لە ئەقڵ، ئەوەش لە کەسی گریمانەییدا نادیارە.

پاشان سزا بڕیار لەسەربڕاوەکان لە یاساکانی تاواندا کە ئەنجام دەدرێن پیادە کردنیان وێنا ناکرێت تایبەت بە کەسی مەعنەوی بە هەڵواردە لە تاوانانە دارابییەکان.

ئەمەش بە پێچەوانەی پارسەنگدانەوە بەهۆی جیاوازییانەوە لە حەقیقەت و ناوەرۆکدا.

**دووەم: پارسەنگدان و هۆهێنانەوەی حوکمەکان:** هۆهێنانەوەی حوکمەکان بریتییە لە خستنەڕووی ئەوەی قازی قەناعەتی پێیەتی لە بنچینە و پاڵپشتی ئەقڵی و پاساوەکان و پاڵنەرەکان، لەوێشەوە بڕیاردانی قازی بە جۆرێك دڵی قازی لەسەر یەکلابێتەوە.

هۆهێنانەوەی حوکمەکان –وەك پارسەنگدان– بە دەستەبەرێکی بنچینەیی بۆ جێبەجێ کردنی حوکمێکی دادپەوەر دادەنرێت، بەڵام لە نێوانیاندا جیاوازی جەوهەری بوونی هەیە، لەوانە:

١.قازی پابەندە بە هۆهێنانەوە بە پێچەوانەی پارسەنگدانەوە، بۆیە پێویستە لەسەری لە رووداوە بنچینەییەکان کە لە بڕیارەکەیدا شانی لەسەر داداوە ئاماژە بە بەڵگە و پاڵپشتەکان بکات، ئەو بەڵگە و پاڵپشتانەی قەناعەتیان پێکردووە بە دروستیی هەڵبژاردنی ئەو حوکمەی لە بابەتەکەدا دەریکردووە.

٢.لە هۆهێنانەوەی حوکمەکاندا قازی ئەوە رۆشن دەکاتەوە کە قەناعەتی پێهێناوە لە بەڵگەی واقیعی، لە کاتێکدا لە پارسەنگداندا قازی پابەند نابێت بە بەیانی سەرچاوەی قەناعەت پێکردنەکانی خۆی.

٣.لە هۆهێنانەوەی حوکمەکاندا دەسەڵاتی خەملاندنی قازی سنووردارە، لەسەری پێویست دەبێت سەرچاوەی قەناعەتی خۆی رۆشن بکاتەوە، لە کاتێکدا دەسەڵاتی خەملاندنی لە پارسەنگدانی بەڵگەکان و رۆشنکردنەوەکاندا رەهایە، بۆیە قازی پابەند نییە بە رۆشنکردنەوەی چالاکیە زەینییەکانی خۆی.

سێیەم: پارسەنگدانی حوکمەکان و پارسەنگدانی بەڵگەکان:

رووی لێکچوون لە نێوان هەردووکیاندا ئەوەیە کە پارسەنگدانی یەکێك لە دوو حوکمەکە بەسەر ئەویترياندا بە ناونیشانێکی حەقیقەتی قەزایی دادەنرێت لەسەر بنچینەی پڕاوپڕبوونی لەگەڵ واقیع، ئەمەش هۆهێنانەوەی بڕیاری قەزایی -دیسان بیناکراو لەسەر پارسەنگدانی بەڵگەکان- پێویست دەکات، بەڵام لە چەندین رووەوە لەگەڵ یەکتر جیاوازن:

١.لە رووی دەسەڵاتی پارسەنگدانەوە: پارسەنگدانی حوکمەکان لە پسپۆڕی دەستەی گشتی دادگای پێداچوونەوەیە[١]، دروست نییە دادگای بابەت داوای ئەو پارسەنگدانە بکات، لە کاتێکدا پارسەنگدان لە نێوان دوو بەڵگەدا لە پسپۆڕییەکانی دادگای بابەتە.

٢.لەو رووەوە کە پارسەنگدان هۆیەك بێت بۆ تانەلێدان: پارسەنگدان لە نێوان بەڵگەکاندا شیاوە بۆ ئەوەی هۆیەك بێت بۆ تانەلێدان تەنها پێداچوونەوە بەبێ راستکردنەوەی بڕیاری پێداچوونەوەکە[٢]. بە پێچەوانەی پارسەنگدانی بەڵگەوە[٣]

٣.بڕیاری پارسەنگدان لەنێوان بەڵگەکاندا پێویستە هۆدار بێت بە پێچەوانەی پارسەنگدانی نێوان حوکمەکان[٤].

٤.پارسەنگدان لە نێوان دوو حوکمدا ئەنجام نادرێت مەگەر مەرجەکانی پاڵنانی هەبێت بە بەڵگەداری حوکمەکان کە بریتییە لە یەکێتی نەیاریی و یەکێتی بابەت و یەکێتی هۆ، بۆیە بڕیاری پێشوو کە پلەی یەکلابوونەوەی بەدەستهێناوە بەسەر حوکمی دواتردا پارسەنگ دەکرێت گەر دوو داوا لەسەر خودی حەقەکە[٥] بەدەق هاتبوو، بە پێچەوانەی پارسەنگدانی نێوان بەڵگەکان بۆیە ئەو مەرجانە ناپێویستن.

---

[١] مادەی (٢١٧) لە یاسای دابینی مەدەنی عێراقی بەرکار (دەستەی گشتی دادگای پێداچوونەوە ئەو داوایە یەکلادەکاتەوە و یەکێك لە دوو حوکمەکە پارسەنگ دەدات و فەمان بە جێبەجێ کردنی دەکات، ئەوەش بە بڕیارێکی هۆئامێز).

[٢] م (١/٢٠٣) قانون المرافعات المذكور.

[٣] م (٤/٢٠٣) قانون المرافعات الانف الذكر.

[٤] م (٨٢) قانون الاثبات العراقي القائم.

[٥] قرار محكمة التمييز المرقم ٣١٤ /موسوعة اولى /٨٨ في ١٩٨٨/٦/٢٩.

## هەڵگرتنی بەرهەڵستکاری نێوان بەڵگەکان:

قازی پێویستی بە بەکارهێنانی ڕێساکانی مەنتقە بۆ هەڵگرتنی بەرهەڵستکاری نێوان دەقە یاساییەکان و لە پارسەنگدانی بەڵگە بەرهەڵستکارەکان و لە بەدەستهێنانی نەزانراودا(حوکمێکی دادپەروەر) لەو زانیاریانەوە کە پێشکەشی دەکرێن پێش و لە کاتی دادبینییە قەزاییەکاندا لە بەرزکردنەوەی داواوە بۆ دەرکردنی حوکمەکە، وەك لەم ڕۆشنکردنەوانەدا:

### یەکەم: هەڵگرتنی بەرهەڵستکاری نێوان دەقەکان:

بەکارهێنانی ڕێسا مەنتقییەکان لە هەڵگرتنی بەرهەڵستکاری نێوان دەقە یاساییە بەیەکتر بەرهەڵستکارەکان.

لە ترازووی مەنتقدا پێویستە لەسەر قازی بۆ هەڵگرتنی بەرهەڵستکاری شوێنی ئەم زنجیرە مەنتقییە بکەوێت:

أ. هەوڵی کۆکردنەوەی دوو دەقی بەیەکتر بەرهەڵستکار لە ڕوواڵەتدا بدات، گەر توانرا کۆبکرێنەوە، وەك کۆکردنەوەی نێوان مادەی حەوتەم لە یاسای باری کەسێتی ڕاوەستاو[1]، کە دەقەکە دەڵێت: (لە تەواویی لێوەشاوەیی هاوسەرگیریدا ئەقڵ و تەواوکردنی هەژدە ساڵ لە تەمەن بە مەرج دەگیرێت) لەگەڵ مادەی (٣٩٨) لە یاسای سزا عێراقییەکان ڕاوەستاو[2] کە دەقەکەی ئەمەیە: (ئەگەر گرێبەستی هاوسەرگیرییەك دروست بوو لە نێوان هەستاو بە یەکێك لەم تاوانە هاتووانەی ئەم بەشەدا[3] ئەوە بە پاساوێکی سووککراو تەماشا دەکرێت بۆ مەرامی جێبەجێ کردنی دوو مادەکە(١٣٠ و ١٣١))[4]، ئەم کۆکردنەوەیە بە حەملکردنی مەرجی هاتوو دەبێت لە مادەی (٧) لە یاسای باری کەسێتی بۆ سەر مەرجی پێویستبوون بەبێ مەرجی دامەزراندن یان دروستی، بۆیە هاوسەرگیری لە تەمەنی خوارتر لە هەژدە

---

[1] رقم ١٨٨ لسنة ١٩٥٩.

[2] رقم ١١١لسنة ١٩٦٩

[3] لەوانە تاوانی زۆرکاری سێکسی گەر تەمەنی دەستدرێژکراوە سەر کەمتر بێت لە هەژدە ساڵ.

[4] ئەو دوو مادەیە پاساوە لێبووردوەکان و پاساوە سووککەرەکان باس لێوە دەکەن.

ساڵ ماف دەدات بە هاوسەری ژن و پیاو دوای گەیشتن بە هەژدە ساڵ گرێبەستەکە هەڵبوەشێننەوە گەر هاوسەرگیرییەکە ئەنجامدرابێت لە کاتێکدا تەمەن کەمتر بوو بێت لەو ماوە دیاریکراوەی ناو ئەم مادەیە و رازیبوون بەدەست نەهاتبێت بۆ بەردەوامبوون لە هاوسەرگیری دوای باڵغبوون و چوونە ناو تەمەنی پێگەیشتنەوە.

ب.هەوڵی پارسەنگدانی کارکردن بە یەکێك لە دوو دەقە بەیەکتر بەرهەڵستکارەکە بەسەر کارکردن بە دەقەکەی تر بەهۆی بوونی پارسەنگکەرێکی قبوولکراوەوە لە یاسا و شەرعدا، بۆ نموونە گەر یەکێك لە دوو دەقەکە لە یاسای گشتی بوو و دەقەکەی تریان لە یاسای تایبەت بوو، ئەوا کارکردن بە تایبەتەکە پارسەنگ دەکرێت بەسەر کارکردن بە گشتییەکە، وەك پارسەنگدانی کارکردن بە مادەی (١٧) لە یاسای بەکرێدانی خانووبەرە کە داوا دەکات گرێبەستی بەکرێدان راستەوخۆ نوێبکرێتەوە بەبێ پێویستبوون بە رازیبوونی بەکرێدەر هەتا کرێگرتە بەردەوام بێت لەسەر دانی کرێی بەکرێگرتنەکەی. دەقی مادەکە: (دروست نییە کەسی بەکرێدەر دلوای چۆڵکردنی خانووبەرەی ژێربار بۆ حوکمەکانی ئەم یاسایە بکات، مەگەر بۆ یەکێك لەم هۆیانە)[1]، کارکردن بەم مادەیە پارسەنگ دەدرێت بەسەر مادەی (٧٧١)دا لە یاسای مەدەنی عێراقی رلوەستاو[2] کە دەقەکەی(گەر گرێبەستی بەکرێدان کاتەکەی بەسەرچوو پێویستە لەسەر کرێگرتە شوێنە بەکرێگیراوەکە چۆڵ بکات بۆ کەسی بەکرێدەر لەو شوێنەی کە لێی وەرگرتووە، گەر رێکەوتن یان عورف شوێنێکی تری دیاری نەکردبێت).

ج.گەر کۆکردنەوە و پارسەنگدان تایبەت بە دوو دەقە بەیەکتر بەرهەڵستکارەکە گونجاو نەبوو بەوەی دژ بەیەکتر بن راستی یان دروستی یەکێکیان درۆ یان پووچەڵی ئەویتریانی لێ دەکەوتەوە، لەو بارەدا لەسەر قازی پێویستە پەنا ببات بۆ هەڵوەشانەوەی ناوتوێژانە(ئامێزگرانە) بۆ دەقەکەی پێشتر یاسارێژیۆکراو بە دەقەکەی دواتر، وەك دانان بە هەڵوەشاندنەوەی مادەی (٦٤) لە یاسای سزا

---

[1] ينظر تتمة المادة من فقرة (ا–م) من قانون ايجار العقار رقم ٨٧ لسنة ١٩٧٩ المعدل.

[2] رقم ٤٠ لسنة ١٩٥١.

عێراقییەکان راوەستاو، کە دەقەکەی: (دلوای سزایی راستنابێتەوە لەسەر کەسێك کاتی ئەنجامدانی تاوانەکە تەمەنی حەوت ساڵی تەولو نەکردبێت) [1] بە مادەی (٤٧/یەکەم لە یاسای چاودێری نەوجەوانان) [2] کە دەقەکەی: (دلوای سزایی راستنابێتەوە لەسەر کەسێك کاتی ئەنجامدانی تاوانەکە تەمەنی نۆ ساڵی تەولو نەکردبێت)، برگەی دووەمی مادەی (٩٧) لە یاسای مەدەنی عێراقی رلوەستاو دەمێنێتەوە کە دەقەکەی: (تەمەنی جیاکردنەوە حەوت ساڵی تەواوە) کورتکراوە لە پرسە مەدەنییەکاندا، تایبەت بەوە بە جیاکەرەوە دادەنرێت گەر حەوت ساڵی تەمەنی تەولو کردبێت، لە پرسە سزاییەکاندا تەمەنی جیاکردنەوە لە یاسادانانی عێراقییدا تەواوکردنی نۆ ساڵی تەولوە لەتەمەن، گەر لە خوار ئەو تەمەنەوە تاوانێکی ئەنجامدا لە رووی سزاییەوە پرسیاری لێ ناکرێت، چونکە منداڵیی(واتە جیانەکردنەوە) رێگری بەرپرسیارێتی سزاییە، وەك شێت و ئەوانەی لە حوکمی ئەودان، بۆیە دلوای لەسەر راست ناکرێتەوە.

**دووەم: هەڵگرتنی بەرهەڵستکاری نێوان بەڵگە رۆشنەکان:**

لە پارسەنگدەرەکان ئەم رێسا یاسایی و فیقهییانەن:

١. گەر رووالەت و ناوەرۆك(دەرەوە و ناوەوە) بەرهەڵستی یەکتریان کرد ئەوا بە دووەمین(ناوەرۆك، ناوەوە) کار دەکرێت، گەر بەڵگەیەك پێچەوانەی ئەوە راست نەبێتەوە، کارکردن بە رێسای: (کاروبارەکان بەپێی مەرامەکانیانن) [3]، واتە ئەوەی لەسەر بار و بریارێك سەرهەڵدەدات لەسەر بنچینەی دلواکاری ئەوەیە کە مەبەستەکە لەو بار و بریارە چی بووە.

٢.پەند لە گرێبەستەکاندا بەپێی مەرام و ماناکانە نەك وشە و دارشتنەکان: بینا لەسەر ئەوە "پێدانەوە فرۆشتن" تایبەت بە کریار چۆناندنی بۆ دەکرێت بەوەی بارمتەی

---

[1] تێگەیشتنی پێچەولنە بۆ ئەم مادەیە ئەوەیە هەر کەس حەوت ساڵ لە تەمەنی تەولو کرد لەرووی سزاییەوە لێی دەپێچرێتەوە گەر تاولنێك ئەنجام بدات و دلوایەکی لەسەر راستبووبێتەوە بەهۆی بەدەستهێنانی لێوەشاوەیی سزایی بەپێی ئەم مادەیە.

[2] رقم ٧٦ لسنة ١٩٨٣ المعدل.

[3] مجلة الاحكام العدلية /م٢و ٣ و٥و٩ و١١ و٣٤ و٣٦ و٤٣و٤٤و٤٥ و ٦٧و٨٥و٩٠و٩١.

ژێردەستەییە سەرەڕای ئەوەی گرێبەست لەژێر ناونیشانی وشەی فرۆشتندا تەواوبووە، رووی ئەمە ئەوەیە کە کڕیار ناتوانێت تاوتوێکردنی فرۆشراوەکە بکات بۆ کەسانی تر.

٣. "یەقین بە شك تیاناچێت" بۆ نموونە، گەر یەکێك لە ماڵێکی چۆڵەوە بە ترس و شڵەژانەوە هاتە دەرەوە و لەدەستیدا چەقۆیەکی خوێناوی هەڵگرتبوو، پاشان لەو ماڵەدا کەسێکی سەربڕاوی بینی، لەو کاتەدا گومانی نییە لەوەی بکوژەکە ئەو کەسە بووە، بۆیە لاناکاتەوە بەلای ئەگەرە وەهمییەکاندا، وەك ئەوەی وێنا بکات کەسی ناوبراو خۆی کوشتووە و خۆی سەربڕیوە، هەر کەس بانگەشەی ئەوەی کرد بەرپەرچی بانگەشەکەی بەوە دەدرێتەوە کە "یەقین بە شك تیاناچێت".

٤. بنەڕەت(ئەسل) مانەوەی ئەوەی بووە لەسەر ئەوەی بووە وەك پێوەندبوون تا پێچەوانەی ئەوە دەسەلمێت:

بۆ نموونە، گەر ئافرەتێك شووی بە کەسێك کرد پاشان لەبەردەم قازیدا بانگەشەی ئەوەی کرد کە مێردەکەی پێشووی تەلاقیداوە، یا مردووە و عیدەی تەواو بووە و داوای لە قازی کرد لە پیاوێکی تر مارەی بکات، ئەوا پێویستە لەسەر قازی هاوسەرگیرییەکەی پێشوو بە بەردەوام و ماوە بزانێت تا کەسی بانگەشەکەر بانگەشەکەی خۆی دەسەلمێنێت لە جیابوونەوەی لە پیاوەکەی بە مردن یان بە تەلاق و پاشان کۆتاهاتنی عیدەکەی.

٥- بنەڕەت لە سیفەتە پێشهاتووەکاندا نەبوونە، بۆ نموونە، گەر ناکۆکی کەوتە نێوان فرۆشیار و کڕیارەوە لە کاتی روودانی نەنگییەکدا و کەسی کڕیار بەرهەڵستی کرد و بانگەشەی ئەوەی کرد کە نەنگییەکە بوونی هەبووە بەر لەوەی فرۆشیار شتەکەی پێبدات، بۆیە فرۆشراو پێش فرۆشتن لە ئەستۆی فرۆشیاردایە، لەم دوو داوا بەیەکتر بەرهەڵستکارەدا لەسەر قازی پێیستە داوای فرۆشیارەکە پارسەنگ بکات، پاڵپشت بە رێسای ناوبراو، هەروەها پاڵپشت بۆ رێسای: بنەڕەت دانەپاڵی رووداوە بۆ لای نزیکترین کاتی.

٦- شان دەدرێتە ژێر زیانی تایبەت لەپێناو زیانی گشتیدا: گەر کەسێکی داوالێکراو بە داوایەکی گشتی هەستا بە روخانی خانووی کەسێك یان حەوشەکەی بە مەبەستی کوژانەوەی ئاگرێك کە نزیکە بەو ماڵە گڕیسەندووە، پاشان کەسی پەیوەندار داوایەکی دژ بەو کەسەی کاری روخاندنەکەی ئەنجامداوە راستکردەوە و داوای لێ کرد لە رووی سزایی و مەدەنییەوە دەستەبەر بکرێت، ئەوا داواکەی رەد دەکرێتەوە بینا لەسەر ئەو رێسایەی (شان دەدرێتە ژێر زیانی تایبەت لەپێناو زیانی گشتیدا) چونکە گەر ئاگرەکە بەردەوام بوایە زیانی بە کەسانی تر دەگەیاند و لەوێشەوە زیان بە بەرژەوەندی گشتی.

٧- گونجاویی شەرعی نەرێی دەستەبەرکردن دەکات: واتە گونجاویی شەرعی بنەڕەتی نەرێی دەستەبەرکردن دەکات، بۆ نموونە، یەکێك بیرێك لە باخەکەیدا لێ دەدات، شتی کەسێك بەسەریدا دەکەوێت و تیادەچێت، ئەوا خاوەن ماڵەکە بۆی نییە داوای باربووکردنەوە بکات لەبەردەم قەزادا، بۆیە لەسەر قازی پێویستە پارسەنگی خاوەن بیرەکە بدات بەسەر لایەنی زیانبەرکەوتوودا پاڵپشت بە رێسای باسکراو، بەڵام گەر گونجاویی هەڵواردەیی بوو پێویستە لەسەر قازی بڕیار لەسەر دەستەبەرکردن بدات، هەر کەس ماڵی کەسێك بخوات لەژێر فشاری پێویستی زۆردا ئەو خواردنە دروستە، بەڵام پێویستە باربووبکرێتەوە گەر زیانبەرکەوتووەکە داوای کردەوە، چونکە ناچاریی مافی کەسانی تر پووچەڵ ناکاتەوە، پێویستی لە رێگرەکانی بەرپرسیارێتی سزاییە، بەڵام رێگر نییە لە بەرپرسیارێتی مەدەنی.

٨- گەر "هۆ راستەوخۆکە" و "بوونەهۆکە" لەگەڵ یەکتر کۆبوونەوە، حوکم دەدرێتە پاڵ لا زاڵەکەی ئەو دوانە، هەر کەس برینێکی کردە کەسێك بەجۆرێك ئەو برینە ترسناك نەبوو لەسەر ژیانی بریندارەکە، بەڵام پزیشکی چارەسەرکەر چارەسەرەکەی پشتگوێخست، ئەو پشتگوێخستنەش سەریکێشا بۆ

سەرهەڵدانی باری خراپ لە کەسەکەدا ئەوە پزیشکەکە بەرپرسیارە، گەر برینەکە بەجۆرێك پێشبینی شفای بریندارەکە و رزگار بوونی لە سەرئەنجامەکەی لێ نەدەکرا، ئەوا بەرپرسیارێتی دەکەوێتە سەرشانی ئەو کەسەی بریندارى کردووە نەك پزیشکی چارەسەرکەری پشتگوێخەر، شایانی باسە بنەڕەتی رێساکە بەم جۆرەیە (گەر هۆ راستەوخۆکە و بوونەهۆکە لەگەڵ یەك کۆبوونەوە حوکم دەدرێتە پاڵ راستەوخۆکە) ئەمەش هەڵەیەکی باوە، چونکە هەمیشە "هۆ راستەوخۆکە" بەرپرسیار نییە، بەتایبەت گەر ئەنجام لە کاری "بوونەهۆکە"ەوە سەریهەڵدابێت وەك لە پشتگوێخستنی پزیشکەکە ئاماژەمان پێدا و بووە هۆی خراپبوونی برینەکە لەسەر ئەو پشتگوێخستنە سەریکێشا بۆ مردنی کەسی بریندار.

٩- قسە نادرێتە پاڵ کەسی بێدەنگ، بەلاَم بێدەنگی لە میانەی پێویستیدا دەربڕینە: گەر کەسی تۆمەتبار بێدەنگ بوو و نەیویست وەلاَمی ئەو پرسیارە بداتەوە کە ئاراستەی کرابوو لەلایەن قازییەوە یان لەلایەن نەیارەوە، ئەو بێدەنگبوونە دانپێدانان نییە بۆ ئەو تۆمەتەی دراوەتە پاڵی، بەلاَم گەر کەسی کڕیار پسوولەی کەلوپەلەکانی وەرگرت کە فرۆشیار بۆی رەوانە کردبوو، بێدەنگ بوو لە بەرهەڵستی کردن، یان کڕیار نەنگی فرۆشراوەکەی دەزانی و بێدەنگ بوو، بێدەنگی لەو بارانەدا رازیبوونە، چونکە بێدەنگ بوون لە میانەی پێویستیدا دەربڕینە، لەدوای ئەوە بۆی نییە داوا بە پێچەوانەی ئەوە راستبکاتەوە، هەروەك چۆن بێدەنگی کچ لە کاتی داوای رازیبووندا بۆ بەشوودانی بە رازیبوون دادەنرێت بەپێی ئەو فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) کە دەفەرموێت: ((بێوەژن لەپێشترە بە خۆی لە سەرپەرشتکارەکەی، کچیش

باوکی دلوای مۆڵەتی لە نەفسی خۆیدا لـێ دەکات، مۆڵـەتی کچـەکە بێـدەنگ بوونیەتی، بێدەنگبوونی دانپیادانانیەتی))[1]

١٠- بنەڕەت بریتییە لە ئەستۆپاکی لە پابەندبوونـە سـزاییەکان و مەدەنییـەکان، بۆیە لەسەر قازی پێویستە داوالەسەرکرلو -قـەرزدار بێـت یـان تۆمـەتبار- بـە چاوی ئەستۆپاکی بنەڕەتی کاتی لەدایکبوونی تەماشای بکات و واببینێـت کـە هێشتا لەسەر ئەو سیفەتە ماوەتەوە، بەم ڕێسایە لایـەنی تۆمـەتبار پارسـەنگ دەدرێت بەسەر لایەنی خاوەن داوادا، لەسەر ئەم بنچینەیە ڕێسایەك دامەزراوە (بەڵگە لەسەر کەسی داواکەرە) چونکە پێچەوانەی بنەڕەتەکە بانگەشە دەکات (سـوێندخواردنیش لەسـەر ئـەوەیان کـە نـەرێی بانگەشـەکە دەکـات) چـونکە بانگەشەی شتێك دەکات لەگەڵ بنەڕەتەکەدا تەبایە.

١١- عورفـ(نەریت) حوکم پێکراوە: واتە عورف گشتی بێت یان تایبەت حوکمێـك بڕیاردەدات بۆ جێگیرکردن و سەلماندنی حوکمێکی شەرعی ناکۆك لەسەر، بـۆ نموونە گەر ناکۆکی کەوتە نێوان دوو هاوسـەرەوە لـە خاوەنـدارێتی شـتێك لـە کەلوپەلی ناومالّ، لەسەر قازی پێویسـتە ناکۆکییەکـە چارەسـەر بکـات لەبـەر ڕۆشنایی عورفی باودا، گەر ئەو شتەی ناکۆکی لەسەرە بۆ ژنەکە دەگەڕایەوە لە عورفی ولاّتدا وەك خشلّ و زێڕ و زیو دلوای ئافرەتە پارسەنگ دەکرێت، گەر بـۆ پیاوەکـە دەگەڕایـەوە وەك چـەك و تفـەنگ ئـەوا لایـەنی پیاوەکـە پارسـەنگ دەدرێت، ئەوەش کە عورف ناتوانێت یەکلای بکاتەوە، بەوەی ئەگەری هەبێت بۆ پیاوەکە یان بۆ ژنەکە بگەڕێتەوە ئەوا پێویستە بە بەڵگە بسەلمێت، عـورف حوکمی خۆی هەیە لـەو شـتانەی دەچـنە نـاو فرۆشـراوەوە بـەبێ باسـکردنی دروست، ئەوەش کە ناچێتە ناویەوە، بۆیە هەموو ئەوەی عورفی ولاّت لەسەری دەڕوات لەسەر ئەوەی لە ئامێزگیراوەکانی فرۆشراوە دەچێتە نـاو فرۆشـتنەوە

[1] صحیح مسلم، ٢/١٠٣٧.

بـەبێ باسـکردن و ناوهێنـان، لـە بـاری نـاکۆکی نێـوان فرۆشـیار و کڕیـاردا دەربارەی ئـەوەی چـی دەچـێتە نـاو فرۆشـراوەکەوە و چـی ناچـێتە ناویـەوە لەسەر قازی پێویستە حوکم بە شتێك بکات کە عورفی بـاو پشـتیوانی دەکـات، لە پیادە کردنەکانی بە حەکـەمکردنی عـورف ئـەم ڕێسـایەیە: (ئـەوەی لـەلای عورف باو و ناسراوە وەك مەرجی بەمەرجگیراو وایە) هەروەها ڕێسـای: (بـاو و زانـراو لـەناو بازرگانەکانـدا وەك بـە مـەرجگیراو وایـە لـە نێوانیانـدا) هـەروەها ڕێسای: (دیاریکردن بە عورف وەك دیاریکردن وایە بە دەق).

١٢– لە پارسەنگدەرەکان هاوبەلگەیە: بۆ هاوبەلگە ڕۆڵێکی دیار و بەرچاو هەیە لە پارسـەنگدانی بەلگـەکان و ڕۆشـنکردنەوەکاندا، بـۆ نموونـە پارسـەنگدان بـە بندەستخسـتن، بەلگـەی بندەسـخەر پارسـەنگ دەدرێـت، گـەر دوو بانگەشـەکارەکە هاوتـابوون دەچـین بـۆ پارسـەنگدانی ئـەو کەسـەیان بندەستخستن لەلای ئەوە، جا بندەستخراوەکە خانوبەرە بێت یـان شـتومەکی گـوازراوە، چـونکە بندەسـتخسـتن هاوبەلگەیـە بـەو هۆیـەی لـە بنەڕەتـدا لـە تایبەتمەندییەکانی موڵکدارییە[1].

---

[1] المدونة الكبرى في الفقه المالكي ١٩١/٥.

# باسی دووەم:
# قەناعەت پێهێنانی قەزایی و بەڵگەی رازیکەر

ئەو زانیاریانەی پێشکەش دەکرێن بە قازی لە راستکردنەوەی دۆلوە هەتا دەرکردنی حوکم هەندێکیان بیستەنیین وە قسەی شاهیدەکان و قسەی لایەنە ناکۆکەکان و دڵنیایدانانی تۆمەتبار و راپۆرتی شارەزایان و هونەرییەکان و پێداچوونەوەی دەستەی دۆلکاری گشتین، هەشیانە خوێنراوەیە وەك راپۆرتەکانی لێکۆڵەری داد(لێکۆڵەری قەزایی) و راپۆرتەکانی پزیشکی دادگوزاری و لێکۆڵینەوەکانی تاوان، هەشیانە بینراوە وەك سەیرکردنی ئاسەواری تاوان کە لە بەڵگەی ئاسەواریدا ئاماژەمان پێکرد، هەموو ئەم زانیاریانە بە هەڵواردەی بینراوەکان هەواڵن، هەموو هەواڵێکیش ئەگەری راست(صدق) و درۆ(کذب) و رەوا(حق) و ناڕەوا(باگل)[1] ی بۆ هەیە، بۆیە بە بەڵگەی گومانئامێز دادەنرێن و قازی مافی ئەوەی هەیە بە گومانی زاڵ و قەناعەتی تاکەکەسی بەدەستهاتوو لەو زانیاریانەوە بریار بدات، زۆرینەی یاسارێژییەکانی سەردەم دەستیان بردووە بۆ سیستمی بەڵگەی رازیکەر، لەوانە:

أ. یاسای بنەماکانی دادوەرییە سزاییەکانی عێراقی[2] کە دەقەکەی لە(م ١/٢١٣) هاتووە: (دادگا بڕیاردەدات لە دۆلیەك بینا لەسەر قەناعەت هێنانی بەوەی کە لایەتی لە بەڵگەی پێشکەشکراو لە هەر قۆناغێك لە قۆناغەکانی لێکۆڵینەوەدا یان دادگاییکردندا، ئەوەش بریتییە لە دڵنیادانان و شایەتی شایەتەکان و کۆنووسەکانی لێکۆڵینەوە و کۆنووسەکان و دەرخستنە فەرمییەکانی تر و راپۆرتی شارەزایان و هونەرییەکان و هاوبەڵگەکان و بەڵگە

---

[1] جیاوازی نێوان صدق لەگەڵ حەق ئەوەیە: کە پراوپڕبوونی هەواڵ بۆ واقیع پێی دەوترێت صدق و پراوپڕبوونی واقیع بۆ هەواڵ پێی دەوترێت حەق، وەك چۆن پراوپڕبوون نەبوونی هەواڵ بە واقیع پێی دەوترێت درۆ و پراوپڕبوون نەبوونی واقیعیش بە هەواڵ پێی دەوترێت باتڵ.
[2] رقم١٣٣ لسنة ١٩٧١

بڕیار لەسەردراوەکانی تر).

ب. یاسای ڕێکارە تاوانکارییەکانی میسری[1] کە دەقەکەی لە(م ٣٠٢)دا هاتووە(قازی بڕیار لە دۆلایەك دەدات بەپێی ئەو باوەڕەی لەلای گەلاڵە بووە لە ئەوپەڕی ئازادی خۆیەوە)

ج. یاسای بنەماکانی دادوەرییە سزاییەکانی ئوردەنی[2] کە دەقەکەی لە (١/١٤٧) هاتووە (بەڵگە راستدەکرێتەوە لە تاوانەکان و کەتن و سەرپێچییەکاندا بە هەموو ڕێوشوێنەکانی سەلماندن و قازی بەپێی قەناعەتی تاکەکەسی خۆی بڕیار دەدات)

د. یاسای ڕێکارە تاوانییەکانی فەرەنسی[3] دەستکاریکراو دەقەکەی لە (م ٤٢٧)دا هاتووە (سەلماندنی تاوان بە هەر ڕێگەیەك لە ڕێگەکانی سەلماندن دروستە و قازی بینا لەسە قەناعەتی تاکەکەسی خۆی بڕیار دەدات گەر یاسا پێچەوانەی ئەوەی بڕیار نەدابێت).

هـ. بڕیاری دادگای پێداچوونەوە لە عێراق[4] کە دەقەکەی (دژیەکی شایەتەکان و ژمارەی گوللە تەقێنراوەکان و دیاری نەکردنی شایەتەکان بۆ کەسی بکوژ یان شایەتیدانیان بۆی، بە تەقەکردنی ئەنقەست هەڵدەستێ یان بەرهەمی هەڵەیەك، لە کۆی بەڵگە بەدەستهاتووەکان ناتوانرێت قەناعەتێك لەدایك بێت بەوەی تۆمەتبار بکەرەکەیە، بۆیە تاوانبارکردنی لەسەر شك و ئەگەرە نەك یەکلابوونەوە و یەقین)

ئەوەی ئاشکرایە شك بە بەرژەوەندی تۆمەتبار شرۆڤە دەکرێت.

## مەنتق و قەناعەت پێهێنانی قەزایی:

زانایانی مەنتق وای بۆ دەچن گەر دوو لای پرسێك بە ڕوودان و ڕوونەدان لەلای ئەقڵ یەکسان بوون بەبێ پارسەنگانی هیچ لایەك لە بنەڕەتدا، ئەوا زانستی پەیوەست بە هەردووکیان(ڕوودان و ڕوونەدان) پێی دەوترێت شك، شکیش بۆ بەرژەوەندی تۆمەتبار شرۆڤە دەکرێت لە پرسە سزاییەکاندا، لەسەر ئەم بنچینەیە ڕێسایەك بینا دەکرێت (تۆمەتبار بێگوناهە تا تاوانبارکردنی

---

[1] رقم ١٥٠ لسنة ١٩٥٠.

[2] رقم ٩ لسنة ١٩٦١

[3] لسنة ١٩٥٨.

[4] رقم٣١٧ /هيئة عامة /في ١٩٨٢/١٠/٤ النشرة القضائية ع١/س٣/ص٢٠٩–٢١٠..

دەسەلمێت) هەروەها لە بەرژەوەندی قەرزداره له پرسه مەدەنییەکاندا[1].

گەر یەکێکیان به جۆرێك له ملکەچبوون و قبوولّ کردن پارسەنگرا زانست بەوه پێی دەوترێت بەرلستزانین یان باوەڕ، ئەم باوەڕه گەر یەکلاکەرەوه بێت بەجۆرێك ئەگەری گونجانی ئەقلّ بۆ لایەکەی تر لەلای قازی بە تەواوی کۆتایی پێهاتبێت با لە واقیع و خودی ئەو بارەدا نەشبڕابێتەوه، باوەڕەکە جێگیر بێت بەجۆرێك بە شکی خاوەن شك کۆتایی پێ نەیەت و پڕاوپڕ بێت لەگەڵ واقیعدا پێی دەوترێت یەقین، قازی ناچارناکرێت بە یەقین کاربکات لە هەموو پرسێکدا کە لێی ورد دەبێتەوە جا پرسەکە مەدەنی بێت یان سزایی، پابەندکردنی بە کارکردن بە یەقین لە هەموو بابەتێکدا سەردەکێشێت بۆ تیاچوونی زۆرێك لە ماف خەڵکی، چونکە بەڵگە و ڕۆشنکردنەوه یەقینییەکان کەمن بەراورد بە بەڵگە و ڕۆشنکردنەوه گومانئامێزەکان.

گەر باوەڕی دڵەزراوی جێگیر پڕاوپڕ نەبوو لەگەڵ واقیعدا پێی دەوترێت نەزانی دووسەره کە لە دوو نەزانی پێکدێت، یەکەمیان نەزانی بە واقیع، و دووەمیان نەزانی بەم نەزانینیە.

لەبەر ئەوەی قازی بە قەناعەت بڕیار دەدات، بۆیە دەتوانێت بە قەناعەتی خۆی بڕیار دەربکات، چونکە بڕیاری قازی واقیع ناگۆڕێت و ڕەوا ناکات بە ناڕەوا و ناڕەوا ناکات بە ڕەوا.

گەر زانستەکە دڵەزراوی ناجێگیر بوو پێی دەوترێت چاولێکەری، وەك چاولێکەری قازی بابەت بۆ دادگای پێداچوونەوه کە پێشتر دڵنی نابێت بەوەی کە بڕیاری پێداوه، ئەوەی ئاشکرایە پێشینە قەزاییەکان و بڕیارە پێشینەکانی دادگای پێداچوونەوه کە بە زۆری قازییەکان و پارێزەرەکان بە بەڵگە دەیهێننەوه هەندێ جار پڕاوپڕ نییە لەگەڵ واقیعدا، بانگەشەی ئەوه دەکەن هەموو ئەوەی دادگای پێداچوونەوه بەڕاستی زانیوه ڕەوایە و پڕاوپڕە لەگەڵ واقیعدا، ئەمەش هەڵەیەکی باوی بەربڵاوە، چونکە قازی بابەت وەك چۆن ڕووبەڕووی هەڵە دەبێتەوه هەر بەو جۆرە دادگای پێداچوونەوه ڕووبەڕووی هەڵە دەبێتەوه، هەمیشە لە هەموو بڕیارەکانیدا نەبێکاوه.

گەر زانستەکە باوەڕێکی دڵەزراو نەبوو پێی دەوترێت گومان و دروستە قازی کار بە گومانی زاڵ بکات گەر ئەو گومانە بیگەیەنێتە ڕادەی قەناعەت هێنان، گەر زانست لایەکی بەرانبەر بوو بە گومان پێی دەوترێت وەهم، وەك چۆن لای بەرانبەر بە یەقین پێی دەوترێت خەیاڵ، دروست نییە قازی بە وەهم و خەیاڵ کاربکات.

---

[1] البرهان للكلنبوي/المرجع السابق/ص٣٧٧ ومايليها.

ئەم دەرچە زانستییە مەنتقیانە پێویستی قازی و هەموو ئەوانەی مامەڵە دەکەن لەگەڵ دەقەکاندا بە ڕێسکانی مەنتق و ڕێگەی بەلگەهێنانەوەی مەنتقیانە دووپات دەکەنەوە، جا بەلگە هێنانەوەی مەنتقیانە پێولە ئەقڵیەکان بێت یان شوێنپێ هەلگرتنەکان، لەسەر لێکۆڵینەوەیەکی مەیدانی بۆ زانیارییەکان ڕاست دەبێتەوە کە لەلای قازی بەدەست دێت و ڕووی هەڵهێنجان بوونی نییە کە گفتوگۆیەکی بەلگەئامێز پێویست دەکات لە نێوان قازی و ڕکەبەرەکاندا بۆ سەلماندنی بەلگەی ڕووخراو بەسەریدا تا کردەی شوێنپێ هەلگرتنی ڕاوەستاو لەسەر سەرنجی واقیعی بەشەکی دەست پێ دەکات کە بەلگە ڕاست بووەتەوە لەسەر بوون و بەدەستهێنانی، پاشان قازی لەو ڕووداوانە ئەنجامێکی دیاریکراو هەڵدەهێنجێنێت، بینا لەسەر ئەوە مەنتقی قەزایی پەیوەست بە واقیع لەسەر سێ جۆر بەلگەهێنانەوە ڕاست دەبێتەوە:

١.بەلگەهێنانەوەی جەدەلیانە بۆ قەناعەت کردن بە بەلگەکان.

٢.بەلگەهێنانەوەی تێڕامانی بۆ سەرنجدان لە واقیعێکی بەشەکی کە بەلگەکانی دواى لەسەر هەڵدەگوزرێت.

شوێنپێ هەلگرتن بریتییە لە هەڵدانەوەی بەشەکییەکان بۆ سەلماندن و جێگیرکردنی حوکمێکی گشتی[1].

٣.بەلگەهێنانەوەی هەڵهێنجراوانە بۆ گەیشتن بە ئەنجامێکی دیاریکراو لەبەر ڕۆشنایی ڕووداوە بەشەکییەکان کە خوێندنەوەیان بۆ کراوە[2] ئەو بەلگانەی کە قازی شانیان لەسەر دادەدات ئامانجییەتی قەناعەتی پێ بکات لە چوارچێوەیەکی نەفسیدا بەجۆرێك قسە لەگەڵ ناخ و ویژدانی خۆیدا بکات و لەوێشەوە بڕیارێکی دادپەروەرانە دەربکات.

---

[1] خوێندنەوەی واقیع یان تەواوە ئەوەش بەوەیە کە شەن و کەوی هەموو بەشەکییەکان بکرێت وەك کاتێك بەشەکی گیانداران دەپشکنین دەگەینە دەرئەنجامێکی هەمووەکی ئەوەش ئەوەیە هەموو گیاندارێك شەویلەگەی خوارەوەی دەجولێنێت جگە لە تیمساح، خوێندنەوەی واقیعی ناتەواویش وەك لێکۆڵینەوەیەکی مەیدانی بۆ زانینی هۆی تاوانی دزی یان تاوانی کوشتن بۆ نموونە، خوێندنەوەی تەواوی واقیع یەقین دەبەخشێت بە پێچەوانەی ناتەواوە کە تەنها گومان دەبەخشێت

[2] د. احمد السرور/ النقض في المواد الجنائي/ص١٦١ ومايليها.

# باسی سێیەم:
# بەرهەڵستی بڕیاری قەزایی بۆ تانەلێدان

دلوا بە واژە(گۆكردن)ی بڕیاردان و دەركردن و راگەیاندن كۆتایی پێنایـەت گـەر قۆناغـە یاساییەكای خۆی كۆتا پێ نەهێنابێت یـان كۆمەكـە یاسـاییەكان بەسـەریدا تێنەپـەڕیبێت و پلـەی یەكلابوونـەوەی وەرنـەگرتبێت، ئـەوەی رۆشـنە ئەوەیـە كـە رێگـەكانی تانەلێـدان ئامرازگەلێكی یاساین یاسادانەر دایهێناون بۆ ئـەوەی هـەلی چاوپێداخشـانەوە لـە حـوكمی واژەپێكراودا بە كەسی حوكم بەسەردا پیادەكرلو ببەخشێت، ئەم رێگانە مـادەی (١٦٨) لـە یاسای دادبینی مـەدەنی عێراقـی[١] دیاریكردوون لـە بەرهەڵسـتكردنی بڕیـاری پاشملـە[٢] و تێهەڵچوونەوە[٣] و دووبارەكردنەوەی دادگـایی و پێداچـوونەوە[٤] و راسـتكردنەوەی بڕیـاری پێداچوونەوە[٥] و بەرهەڵستی كەسانی تر[٦]

---

[١]رقم ٨٣ لسنة ١٩٦٩.

[٢]بڕیاری پاشملە: بریتییە لەو بڕیارەی دەرحەق یەكێك لە ركەبەران دەردەكرێت لە بـاری ئامـادەنەبوونی لـە بەرزكردنەوەی دلولوە بۆ دەركردنی بڕیار سەرەڕای ئاگادلركردنەوەی دروست بۆی.

[٣]تێهەڵچوونەوە: بریتییە لە پێداچوونەوە لە وردبوونەوە لە حوكمێك لە حوكمەكانی دادگایی بەرایی بـەهۆی گومانی نادروستی حوكمەكەوە لە رووی یاساییەوە.

[٤]پێداچـوونەوە: رێگەیـەكی نائاسـاییە لـە رێگـەكانی تانـەدان لـە حـوكمی ئامـادە و نائامـادە، مـەرام لـە پێداچوونەوە بریتییە لە وردبینی حوكمەكان و بڕیارە قەزاییەكان بۆ دڵنیابوونەوە لە تەبایی حوكمـەكان لەگەڵ یاسا یان ناتەبایی حوكمەكان لەگەڵ یاسادا.

[٥]راسـتكردنەوەی بڕیـاری پێداچـوونەوە: بڕیارەكـانی دادگـای پێداچـوونەوە و تێهەڵچـوونەوە دلوای راستكردنەوە قبووڵ دەكەن بەپێی مادەی (٢١٩) لە یاساكانی دادبینی لە كاتی بوونی هۆیەكی یاسـایی كە پاساوی ئەوە بدات و پێچەوانەی دەقێكی یاسایی راشكاو بێت.

[٦]بەرهەڵستی كەسانی تر لەسەر حوكم: بەڕێگەیەكی نائاسایی دەبێت لەلایەن كەسانێكەوە كە لە ركەبـەران و نوێنەرانی دلوا نین، بەڵام بڕیارەكە پەیوەستە بـە مافێـك لـە مافەكانییـەوە بـەپێی مـادەی (٢٢٤) لـە یاسای دادبینییەكان.

رێگـەکانی تانــە لێــدان یــان ئاســایین وەك بەرهەڵســتی لەســەر بڕیــاری پاشملــە و تێهەڵچــوونەوە یــان نائاســاییە وەك داوای دووبارەکردنــەوەی دادگــای و پێداچــوونەوە و راستکردنەوەی بڕیاری پێداچوونەوە و بەرهەڵستی نابنەڕەتی و چاوەڕوان نەکراو[1].

لە جیاوازییە جەوهەرییەکانی نێوان ئەو دوو رێگەیە(تانە لێدانی ئاسایی و نائاسایی):

أ. گرتنەبـەری رێگـە ئاسـاییەکان گـەر کەسـی حـوکم بەسـەرداپیادەکراو بـە بڕیارەکـە قەناعەت نەکات، بەڵام لە شوێنکەوتنی رێگە نائاساییەکاندا لەسەریەتی پابەند ببێت بە هۆکارەکان و بەستنەوەکان کە یاسا دیاری دەکات.

ب. لە شوێنکەوتنی رێگە ئاساییەکاندا تەماشای لایەنی واقیعی و یاسایی دەکرێت، بەڵام لە نائاساییەکاندا سەیری نەنگییەکانی بڕیاری یاسایی دەکرێت بەپێی باوەڕی کەسی تانەدەر.

ت. تانەلێدانـەکان بـە رێگـەی ئاسـایی سەردەکێشـن بـۆ وەسـتاندنی جێبـەجێ کردنـی بڕیارەکـە گـەر بڕیارەکـە پەلـە جێبـەجێ کـردن نەیگرتبێتـەوە و دادگـاش بڕیـاری جێبـەجێ کردنـی بەپەلـەی نەسـڕیبێتەوە بـە پێچـەوانەی تانەلێدانـەوە بـە رێگـەی نائاسایی.

### مەرجەکانی تانەدەر لە پرسە قەزاییەکاندا:

دوو مەرج بۆ تانەدەر لە پرسە سزاییەکاندا بەمەرج دەگیرێن:

یەکـەمیان: لایـەنێك بێـت لـە بڕیـاری تانەلێـدراو و دووەم: بـوونی بەرژەوەندییـەك لـە تانەلێدانەکەدا.

یەکەم سیفەتی تانەدەر: تانەدان لە بڕیار لە هیچ کەس قبووڵ ناکرێـت مەگـەر کەسـەکە لایەنێك بێت لە نەیارییە سزاییە راوەستاوەکەدا جا یان خودی خۆی یان کەسێك لە جێگـەی ئەو.

گەر بڕیار بەسەردادراو لە کاتی وردبوونەوە لە تانەکە مرد ئـەوا میراتگرانـی لـە جێگـەی دانانیشن، بەڵکو بڕیار دەدرێت بە کۆتاهاتنی داوای سزایی بە پێچەوانەی داوای مەدەنییەوە

[1] الاستاذ المحامي جمعة سعدون الربيعي /المرشد الى إقامة الدعاوى المدنية /ص٤٤٩ ومابليها.

كە دروستە میراتگرانی داواكەری مەدەنی لە جێگەی ئەو دابنیشن بەهۆی مافی قەرزدەرەوە بە لێجێماوەوە.

دووەم: بوونی بەرژەوەندییەك لە تانەلێدانەكەدا: بەرژەوەندی سەرچاوەی مافە لە دلوا و مافی تانەلێداندا، بۆیە هیچ داوایەك بەبێ بەرژەوەندی بوونی نییە و هیچ تانەیەكیش بەبێ بەرژەوەندی نابێت.

لە بەرژەوەندیدا دوو خاڵ بەمەرج دەگیرێن:

١.بەرژەوەندییەكە تاكەكەسی بێت پەیوەست بێت بە سیفەتی ئەوەوە كە لەسەری تانەی دلوە.

٢.بەرژەوەندییەكە حاڵەت و راستەقینە بێت یەكسانە مادی بێت یان مەعنەوی.

**جیاوازی نێوان مەنتقی یاسایی و مەنتقی قەزایی:**

گرنگترین جیاوازییە جەوهەرییەكانی نێوان مەنتقی یاسایی و مەنتقی قەزایی ئەمانەن:

١.باسی مەنتقی یاسایی كورتدەبێتەوە لە سەرهەڵدانی رێسا یاساییەكان و شرۆڤەكردنیان و پیادە كردنیان بەسەر رێگەیەكی تیۆرییدا بە پێچەوانەی مەنتقی قەزاییەوە، ئەمەی دووەمیان دەكۆڵێتەوە لە شرۆڤەی رێسا یاساییەكان و پیادە كردنیان لە رێگەی قازییەوە بۆ یەكلاكردنەوەی ئەو دلوایانەی خراونەتە بەردەمی، بۆیە مەنتقی قەزایی ئاراستەیەكی كرداری و قەزایی رووتی هەیە، لە كاتێكدا مەنتقی یاسایی ئەركەكەی دارشتنانە و تیۆرییانەیە.

٢. مەنتقی یاسایی تەنها دەكۆڵێتەوە لەوەی پەیوەستە بە یاساوە، لە كاتێكدا مەنتقی قەزایی پەیوەست دەبێت بە واقیع و بە یاساوە، بۆیە كاری قازی تەنها پیادە كردنی یاسا نییە، بەڵكو كارێكی دوو لایەنەیە لە واقیع و لە یاسا، بۆ نموونە: قازی تاوان تەنها یاسای سزاكان جێبەجێ ناكات، بەڵكو پێویستە كەسایەتی تۆمەتبار و رەوشی ناوەكی و دەرەكی و ئەو هۆیەی پاڵی ناوە بۆ ئەنجامدانی تاوانەكە رەچاو بكات.

٣.مەنتقی قەزایی سروشتێكی رێكاری و كرداری هەیە لە كاتێكدا مەنتقی یاسایی سروشتێكی تیۆرییانە و بێدەنگی[1] هەیە.

[1] د. احمد فتحي سرور /النقض في المواد الجنائية /ص١٥٨ ومايليها.

## ئەنجامگیری:

لەم خستنەرووەوە ئەنجامگیری دەکرێت بەوەی قازی دوو ئەرکی گەورە رادەپەڕێنێت:

یەکەمیان ئەرکێکی بابەتیانەیە پەیوەستە بە سەلماندنی رووداوەکانی داوا بۆ قەناعەت پێکردن بەوەی راست و دروستە لە دیدی ئەوەوە.

دووەمیان: ئەرکێکی یاسایی پەیوەستە بە دیاری کردنی رێسا یاساییەکان پێویست لە پیادە کردنیاندا لەدوای چۆناندنی رووداوەکە و دیاری کردنی سیفەتی یاسایی رووداوەکە.

بەرئەنجامی ئەم دوو ئەرکە بریتییە لە واژە(گۆکردن) بە بڕیارێکی دادپەروەرانە.

# بەشی هەشتەم

## فەلسەفەی یاسا لە رووی یاسادانان و پیادە کردن و جێبەجێ کردنەوە

لێکۆڵینەوەی ئەم بابەتە دابەش دەبێت بەسەر سێ باسدا: یەکەمیان تایبەتە بەفەلسەفەی یاسا لە رووي یاسادانانەوە، و دووەمیان فەلسەفەی یاسا وەك پیادە کردن، و سێیەمیان فەلسەفەی یاسا وەك جێبەجێ کردن.

# باسی یەکەم:
# فەلسەفەی یاسا لەڕووی یاسادانانەوە

وشەی "فەلسەفە" لە یۆنانییەوە داتاشراوە و ریشەکەی بریتییە لە (فیلا-صوفیا) کە ماناکەی "خۆشەویستی حیکمەتە" یان "کەسی حیکمەت خۆشویت"، هەروەها بەکاردەهێنرێت بۆ زانست بە حەقیقەتی شتەکان و کارکردن بەوەی باشتر و چاکترە[1].

فەلسەفەی یاسای گشتی بریتییە لە هۆی ئامانجی هاوڵاتیا بە بەرژەوەندی، هەموو یاسایەک دادەنرێت و گۆڕانی تێدا دەکرێت و هەڵدەوەشێنرێتەوە لەبەر رۆشنایی هۆی ئەمانجیدا واتە بەرژەوەندی ئەو کۆمەڵگەیەی بۆی ملکەچ بووە.

فەیلەسوفی یۆنانی ئەرستۆ[2] دەڵێت: هەموو رووداوێکی ویستراو کە لە مرۆڤێکی باڵغی ئاقڵی ئازادەوە دەردەچێت، چوار هۆی هەیە: (هۆیەکی بکەری، و هۆیەکی مادی، و هۆیەکی وێنەیی، و هۆیەکی ئامانجداری).

بۆ نموونە، دەسەڵاتی یاسادانان لە هەموو شوێن و سەردەمێکدا هۆی بکەرییە بۆ داڕشتنی یاسا و گۆڕان تیایدا و هەڵوەشانەوەی.

وشەکانی هەر یاسایەک بریتییە لە هۆ مادییەکەی، ئەو شێواز و شێوەیەی لە لێکدان و داڕشتنی ئەو وشانەوە سەرهەڵدەدات بە داڕشتنێکی هونەری لە شێوەی کەرەستەکەیدا هۆ وێنەییەکەیەتی، بەرژەوەندی کۆمەڵگەش کە ملکەچی ئەو یاسایە دەبن بریتییە لە هۆی ئامانجدار.

---

[1] المعجم الفلسفي للدكتور جميل صليبا ٢/ ١٦٠

[2] (٣٨٤-٣٢١ پ.ز.) کوڕی پزیشک باستاغیر بوو لە باکووری یۆنان، لە بیردۆزەکانی: دە وتارەکە، و وێنە و هیولی و بوون بە کردار و بوون بە هێز و چوار هۆیەکە و پۆلێنکردنی زانستەکان و زانستی مەنتق و فیزیا و زانستی زیندەوەر و بیردۆزەی نەفس و ئەودیوی سروشت(میتافیزیک) و ئەخلاق و سیاسەت و شتانی تریش. الموسوعة الفلسفية المختصرة ص ٣٢ وما بعدها.

هەموو حوکمە شەرعی و یاساییەکان بەو مەرجانە هۆنراو کراون، بەرژەوەندی کە بریتییە لە هۆی ئامانجدار لەرووی وێناکردنەوە پێش هەموانە، پێش دەست پێکردن بە کار پێی دەوترێت مەرج، ئەو ئەنجامەش کە دەستەبەر دەکرێت دوای تەواوبوونی پێشەکییەکەی پێی دەوترێت ئامانج.

مەرج و ئامانج بە خود یەکگرتوون و بە پێگە و بایەخ جیاوازن، قورئان بە ئاشکرا باس لەوە دەکات کە هۆی ئامانجدار لە پەیامی محمد(ﷺ) بریتییە لە بەرژەوەندی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی، خودای موتەعال قسە لەگەڵ پێغەمبەرەکەی(ﷺ) دەکات و دەفەرموێت: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَالَمِينَ﴾[1]

لە زانستی رەوانبێژیدا نەفی نەفیکراو بۆ کورتهەڵهێنانە، واتە تەنها ئامانج لە پەیامی محمد(ﷺ) بریتییە لە بەرژەوەندی مرۆیی، چونکە لەو کاتەوەی مرۆڤ دروستبوونەوە گەر مرۆڤ لە عیبادەتدا نقرۆ ببێت لە مەزنی خودا بە ئەندازەی گەردیلەیەك زیاد ناکات، مەبەست بە رەحمەت لەو ئایەتەدا بەرژەوەندی مرۆییە، بەرژەوەندیش دوو لای هەیە: لای ئەرێی بریتییە لە قازانجی راکێشراو جا ئەو قازانجە مادی بێت وەك خواردن و خواردنەوە یان مەعنەوی بێت وەك پارێزگاری لە رێز و حورمەت و ژیان و سەلامەتی و نامووس و دڵنیکردنی ئاسایش و ئارامی و دڵنیایی، هاوشێوەکانی ئەمانە.

لای نەرێیش: بریتییە لە زیان و تێکدانی پاڵپێوەنراو جا ئەو زیانە یان ئەو تێکدانە مادی بێت یان مەعنەوی.

هەموو ئەوەی سوود و قازانج بە مرۆڤ دەگەیەنێت لە رووی مادی و مەعنەوییەوە پەیامی موحەمەدی(شەریعەتی ئیسلام) فەرمانی پێکردووە، هەموو ئەو شتانەش زیان بە مرۆڤ دەگەیەنێت لە رووی مادی و مەعنەوییەوە ئیسلام حەرامی کردووە و فەرمانی کردووە بە دوورکەوتنەوە لێی، بۆ قەلاچۆکردنی تاوان و زیان کۆمەڵێك ئامرازی خۆپارێزی دانـاوە وەك عیبادەتەکان و هەروەها ئامرازی چارەسەری وەك سزاکان.

هۆی ئامانجدار بۆ دەستوور و یاساکان کە دانراو و داهێنانی مرۆڤن لە هەموو جیهاندا بریتییە لە دەستەبەرکردنی بەرژەوەندی کۆمەڵگە کە رێزی دەستوور و یاسا دەگرن و بۆی ملکەچ دەبن و بەپێی ئەوانە کار دەکەن.

ئەو بەرژەوەندییانە بریتین لە هۆی ئامانجداری پاڵنەر بۆ رەنگرێژی یاسا و دەستکاری کردن و هەڵوەشاندنەوەی لەبەر رۆشنایی نوێکاری و گۆڕانکاری ژیاندا و بەرژەوەندی مرۆڤ.

---

[1] سورة الأنبياء / ١٠٧

هەرکات بەرژەوەندییەکان دەگۆڕێن پێویستە یاساکانیش بگۆڕدرێن کە لە پێناوی بەرژەوەندیدا دانراون، چونکە گەر بەرژەوەندییەکان گۆڕان و ژیان گەشە و پێشکەوتنی بەخۆوە بینی و شارستانییەت بەرەو پێش رۆیشت، بەرانبەر ئەمە یاساکان بە چەقبەستووی مانەوە و لەگەڵ قافڵەی پێشکەوتنی کۆمەڵگە پێکنەهاتنەوە رۆڵەکانی ئەو کۆمەڵگەیە دوادەکەون و هەڵدەستن بە شۆڕش دژ بەو یاسانە.

لەسەر کورتهەڵهێنانی ئامانج لە یاسادا بەرژەوەندی تاك و کۆمەڵگە بینا دەکرێت، یاسای هەموو کۆمەڵگەیەك بە کۆمەڵگەیەکی تر ناخوات بەهۆی جیاوازی لە بەرژەوەندییەکانیاندا، و بەهۆی ئەوەی یاسا لە واقیعی کۆمەڵگە و پێویستییەکانی ژیانییەوە هەڵدەگوزرێت.

ئەمە ئەو قسەیە کە فەیلەسوف و زانای فەرەنسی مۆنتسکیو[1] دەیڵێت، دەگاتە ئەو دەرئەنجامەی بڵێت: پێویستی جیاوازی یاساکان بەهۆی جیاوازی هەرێمەکان و نەتەوەکان و بیروباوەڕەکان و ئاو و هەوا و ئامرازەکان و شتانێکی تر لە بەرژەوەندییەکان و پێویستییەکانی ژیانی هەر کۆمەڵگەیەك.

بەڵام پێویستە لەم رێسا گشتییەی "مونتسکیۆ"وە هەندێك بنەمای گشتی و رێسای هەمووەکی هاویەش لە نێوان خێزانە مرۆییەکاندا هەڵاوارده بکرێت، وەك مافەکان کە یاساناسان زاراوەی (مافی سروشتی بۆ بەکاردەهێنن) وەك مافی پارێزگاری لە ژیان و ناموس و ماڵ و شوێن و موڵکداری و گواستنەوە و هاوشێوەکانی ئەمانە.

فەیلەسوفی ئینگلیزی "جیرمی بنتام"[2] دەڵێت: (قازانجگەرایی یاسایی فەلسەفەی یاسای دانراوە).

قازانجگەرایی یاسایی مەزهەبێکی دانراوە، لە سەرخەرانی ئەو مەزهەبە "بنتام" و کەسانی ترە لە فەیلەسوفان و بیرمەندان، ئەم مەزهەبە باوەڕیوون بە بەهای یاسای سروشتی و بیری ئایینی و ئەخلاقی رەد دەکاتەوە، تەنها باوەڕی بە پەیوەندی توندوتۆڵ هەیە لە نێوان قازانج و یاسادا، بۆیە قازانج بنچینە و ئامانجی یاسایە.

"بنتام" و ئەوانەی کۆکن لەگەڵی لە سەرخەرانی مەزهەبی وەسفی پێیان وایە پەیوەندی نێوان یاسا و قازانج لەسەر ئەو بنچینەیە کە واقیع دەڵێت: مرۆڤ سیستمی ژیانی ملکەچ دەکات بۆ دوو جەمسەر، ئەوانەش: جەمسەری دەستەبەرکردنی چێژ لەگەڵ جەمسەری پاڵنانی ئازار و زیان.

---

[1] مونتسكيو– روح الشرائع ١/ ١٩ ومايليها.
[2] (١٧٤٨–١٨٣٢)

تەنها بنچینەیەك بۆ سەرهەڵدانی دەوڵەت و ئامانج لێی بریتییە لە بیری قازانج، هەربوو بیرۆکەی یاسای سروشتی و گرێبەستی کۆمەڵایەتی وەهم و ئەندێشە و خەیاڵ چنیونی.

وەك "بنتام" دەڵێت: گەر وادابنێین یاسای سروشتی بوونی هەیە، ناتوانین سیفەت و تایبەتمەندی بکەین بە بەر ئەو یاسایەدا کە سەرخەرانی تیوری یاسای سروشتی بە بەریدا دەکەن، ئەو یاسایە یاسایەکی جێگیر و نەمر و جیهانی نییە وەك بانگەشەی بۆ دەکەن، بەڵکو ئەوە کۆمەڵێك بنەمای داڕێژراوە لە لایەن ژیری هەندێ لە بیرمەندانەوە.

شایانی باسە بیرۆکەی قازانجی یاسایی دەگەڕێتەوە بۆ فەلسەفەی ئەبیقوری کە ئەبیقور دایمەزراندووە[1].

راستکردنەوەی تیوری قازانکەرایی:

أ– ئەم تیورە لەم شوێنانەدا پێکاویەتی:

١. لە کورتهەڵهێنانی فەلسەفەی یاسا لەپێناو بەرژەوەندی مرۆڤدا.

٢. لە نەرێکردنی یاسای سروشتی، چونکە خەیاڵە و بوونی لە واقیعدا نییە.

٣. لە نەرێکردنی بوونی تیوری گرێبەستی کۆمەڵایەتی، ئەوەش دیسان لە بیری وەهمییەوەیە.

ب. لەم بارانەدا بە هەڵەدا چووە:

١. کورتهەڵهێنانی قازانج(فەلسەفەی یاسایی) لە چێژی وەرگیراو و ئازاری پشتێکراو، ئەو قازانجەی بە فەلسەفەی یاسا دادەنرێت هاو واتایە بە بەرژەوەندی، ئەوەش وەك باسمان کرد ئەرێی و نەرێی و مادی و مەعنەوییە، بەڵکو هەموو داوکارییەکانی ژیان دەگرێتەوە و هەموو قازانجەکان کە لە پێویستییەکانی بەختەوەری مرۆییە لەئامێز دەگرێت، هەروەها پاڵنانی هەموو زیان و تێکدەرەکانی ژیان کە مەینەتی و ئازاری تایبەت و گشتی بۆ مرۆڤ بەتاك و بە کۆمەڵ دروست دەکەن.

٢. پێنەدانی بەها بە بەها ئاینییەکان و ئەخلاقییەکان بانگەوازە بۆ داروخانی مرۆیی و دابەزینی بۆ جیهانی ئاژەڵان و بەربەرییەت و بیرنەکردنەوە لە هیچ شتێك جگە لە خودی خۆ و بەرژەوەندییە تاکەکەسییەکان.

[1] أبیقور (٣٤٢ – ٢٧٠ ق. م) لە ئەسینا لەدایك بووە بەناوبانگترین شتێك پێی دەناسرێتەوە بریتییە لە بیردۆزەی رەوشتی و مەزهەبی چێژ.

٣. کورتهەڵهێنانی قازانج لە بەدەستهێنانی چێژ و پاڵنانی ئارازدا جیاوازی ناهێڵێت لە نێوان ئاژەڵ کە بۆ خواردن دەژی و مرۆڤ کە دەخوات بۆ ئەوەی بژی تاکو پەیامەکەی جێبەجێ بکات .

مەزهەبی قازانجگەرایی بـە مانـا "بنتام"ییەکـەی تەماشـای هـۆی تـاوان و قەلاچـۆکردنی ناکـات، هەروەها تەماشای نەخۆشی تاوانبار و چارەسەری ناکات، بەڵکو لەسەر سزای دڵڕەقانە شـان دادەدات تاکو پاڵنەی چێژی داولکراو لێڵ نەکات و نەیگوڕێت بۆ ئارازێکی نەویستراو.

لە راستیدا قازانجی یاسایی فەلسەفەیەك نییە بۆ یاسادانان و گـۆڕینی و هەڵوەشـاندنەوەی تـا هـاو ولاتاکەی بریتی نەبێت لە بەرژەوەندی ئەرێی و نـەرێی و مـادی و مەعنـەوی، بـە مانـا گشـتگیرەکەیان، شایانی باسە ئەو بەرژەوەندییانەی کە فەلسەفەی یاسـان هەنـدێ جـار بەرهەڵسـتی یـەکتر دەکـەن و بەیەکتردا دەکێشن لە نێوان تاکەکانی کۆمەڵگەدا، بۆیە پێویستە یاسادانەر ئەم بنەما گشـتییانە بەهەنـد وەربگرێت:

١. شان دەدرێتە ژێر زیانی تایبەت لە پێناو زیانی گشتیدا لە کاتی بەرهەڵستیکردندا بۆ یەکتری.
٢. زیانی توندتر بە زیانی سوکتر کۆتا پێ دەهێنرێت.
٣. گەر بەرژەوەندی گشتی لەگەڵ بەرژەوەندی تایبەت بەرهەڵستی یەکتریان کرد، هەوڵ دەدرێـت چەند بتوانن لەگەڵ یەکتر کۆیان بکەنەوە، ئەگەر نە، بەرژەوەندییە گشتییەکە پێشدەخرێت.
٤. گەر بەرژەوەندییەکی راستەقینە لەگەڵ بەرژەوەندییەکی ئەگـەریی بەرهەڵسـتی یـەکتریان کـرد بەرژەوەندییە راستەقینەکە پێش دەخرێت.
٥. پێویستە رەچاوی بەرژەوەندی نەوەکانی داهاتوو بکرێـت، کانزاکـان مـوڵکی هـەموو نـەوەکانن رابردوو و ئێستا و داهاتوو، وەك خودا –سبحانە وتعالى– دەفەرموێت: ﴿هُوَ الَّذِي خَلَقَ لَكُم مَّا فِي الأَرْضِ جَمِيعاً﴾[1]، رووی گوتار لەم ئایەتـە بـۆ هـەموو خەڵکییـە لـە هـەموو نەوەکانیـدا، لـەو هەلانەی کە جێگەی لێخۆشبوون نین زیادەڕەوی هەندێ لە دەوڵەتانە لە دەرهێنـانی نـەوت و فرۆشتنی زیاد لە پێویست، بەبێ ئەوەی پێویستییەکی پێداگر لـە پشـتی ئـەم زیـادەڕەویی و دەستبلاوییەوە بوونی هەبێت لەسەر زیانی نەوەکانی داهاتوو.

---

[1] سورة البقرة ٢٩

# باسی دووەم:
# فەلسەفەی یاسا لە ڕووی پیادەکردنەوە

فەلسەفەی پیادە کردنی یاسا لە رێگەی قەزاوە بریتییە لە دەستەبەر کردنی یەکسانی و دادپەروەری.

## یەکەم: دەستەبەرکردنی یەکسانی:

یەکسان بوون لە زمانەوانیدا بریتییە لە رێکەوتنی دوو شت لە چەندێتیدا، وەك چۆن لێکچوون بریتییە لە رێکەوتنی دوو شت لە چۆنێتیدا، رێکەوتن لە چەندێتیدا ئەوەیە کە دەتوانرێت یەکێك لە دوو شتەکە بەویتریان ئاڵوگۆڕ بکرێت بەبێ زیادە و ناتەواوی[1].

یەکسانی لە زانستی مەنتقدا بریتییە لەراستی هەر یەك لە چەمکی دوو زاراوەکە بەسەر تەواوی ئەوەی ئەویتریان بەڕاستی دەزانێت[2] وەك گرێبەستی وەستێنراو و گرێبەستی جێبەجێ نەکراو[3]، لە لانانی زاراوەیی یاسادا دوو جۆرە: یەکسانی لە یاسادا و یەکسانی لەبەردەم قەزادا:

---

[1] المعجم الفلسفي د. جميل صليبا ٢ / ٣٦٧

[2] البرهان للعلامة الشيخ اسماعيل بن مصطفى المعروف بشيخ زادة الكلنبوي (ت-١٢٠٥ هـ) مطبعة السعادة / مصر / ص ٥٢

[3] بۆیە تێگەیشتنی هەریەك لەو دوانە تەواوی ئەوەی ئەویتر بەڕاستی دەزانێت ئەمیش بەڕاستی دەزانێت، ئەوەش بریتییە لە دامەزراندنی گرێبەستی دروست لەگەڵ سەرهەڵنەدانی ئاسەوار لەسەریان(مافەکان و ئەرکەکان) مەگەر لە دوای مۆڵەتدانی ئەو کەسەی مافی مۆڵەتدانی هەیە، وەك گرێبەستی قەرەبووکاری کە یەکێك لە دوو لایەنەکەی لێوەشاوەیی ناتەواوە بۆیە ئاسەواری لەسەر پەیدا نابێت مەگەر دوای مۆڵەتی سەرپەرشتیار، گەر مۆڵەتی دا ئاسەواری پێشەکاریگەری لەسەر دروست دەبێت، بۆیە وەك ئەوەی هەر لە بنەڕەتدا نەبوویێت.

أ-یەکسانی لە یاسادا:

بریتییە لە هاوسەنگی نێوان ماف و ئەرکەکانی هەموو ئەولانەی بۆی ملکەچ دەبن، هەر کەس زیاتر لە ئەرکەکانی ماف وەربگرێت بە دەرچوو لە سنووری یاسای خۆی ئەدەنرێت و بە دلگیرکەری مافی کەسانی تر تەماشا دەکرێت، ئەو کات بەرپرسیارێتییەکەی سزایی و مەدەنییە گەر بەئاگا بێت لەو زیادە مافە، سزاکەی مەدەنی دەبیت گەر بەوەی نەدەزانی، بەرپرسیارێتی تەنها خۆی ناگرێتەوە بەلکو ئەو دەسەلاتەش دەگرێتەوە کە مافی زیاتر لە ئەرکەکان پێداوە، بە پێچەوانەی ئەوەوە هەر کەس داوای ئەرکی زۆرتر لە ئەرکەکانی لێکرا بە دەستدرێژکراوە سەر(ستەملێکراو) ئەدەنرێت و بەرپرسیارێتی دەکەوێتە سەر کەسی دەستدرێژکار یەکسانە دەستدرێژکار کەسێکی سروشتی بێت یان کەسێکی مەعنەوی، گەر کەسی پابەندبوو بە ئەرکەکەوە لە جێبەجێ کردنی ئەو زیادەدا خۆبەخش نەبێت و کەسێکی ژێری باڵغی ئازاد بێت، بۆیە لەسەر لایەنی بەرپرس بە پابەندکردنی ئەو بەو ئەرکە زیادەوە پێویستە باربووی بکاتەوە لە هەر زیانێك ئەو ئەرکە زیادە بەوی گەیاندووە، لەسەر یەکسانی یاسایی بەو جۆرەی باسکرا پێویستبوونی دابەش کردنی فەرمانبەری و پلە و پایە و بەرپرسیارێتی لەسەر هاولاتیان بینا دەکرێت، ئەمەش بەپێی لێوەشاوەیی و توانای زانستی و ئەقلی و جەستەیی و کارگێڕی و سیاسییان، ، چونکە کار و پلە و پایە ئەرکە نەك ماف، بەرپرسیارێتی بێتوانایی و ناشایستەبوون دەکەوێتە سەر دەسەلاتی کاتی جێبەجێکار کە کەسەکان لە شوێنێك ئادەمەزرێنێت شایستەی نین، هەروەها دەکەوێتە سەر شانی ئەو کەسەی کە ئەم دامەزراندنە قبوول دەکات لەگەڵ بوونی زانست بە ناشایستەبوونی ، پاشان دامەزراندنی کەسی بێتوانا لە کارێکدا یان قبوول کردنی لە پلەیەکی زانستی بەرزتردا کە ئەو شایستەی نەبێت (تاوانێکە بە پێشخستنی بەرژەوەندی تایبەت بەسەر بەرژەوەندی گشتیدا)[1] پێویستە دامەزراندن یان قبوول کردن لە خوێندنی باڵا و پلە زانستییەکاندا لەسەر بنچینەی حزبی و خزمانەپاڵ و واسیتەگەری و هەر هۆیەکی تری نادروست و نارەوا بەدوور بگیرێت، لە ساڵی ۱۹۸۳ز داوام لێکرا موحازەرەیەك لە نەدوەیەکی

[1] کەسێکم نەبینیوە-ئەوەندەی بۆ من دەرکەوتووە- پێشخستنی بەرژەوەندی تایبەت بەسەر بەرژەوەندی گشتیدا بە گوزارەی تاوان دەربیڕێت، بۆ زانیاریت ئەم بەکارهێنانە راستەقینەیەکی رۆشنە وەك رۆشنی خۆر لە نیوەڕۆدا، چونکە لە دەروازەی ناپاکی کردنە لە ئەمانەت، بۆیە پێشنیار دەکەین ئەم تاوانە لە ئامێزی تاوانەکانی تردا دابنرێت و سزایەکی بۆ دیاری بکرێت کە لەگەڵ بڕ و قەبارەیدا گونجاو بێت.

زانستی سیاسی لە زانکۆی بەکر لە بەغدا بڵێمەوە، بە توندی رەخنەم گرت لـە قبـووڵ کردنـی قوتـابی بۆ تەواوکردنی خوێندن لە دەرەوەی عێراق و لە کۆلێژی پەروەردە لەسەر بنچینەی حیزبـی و بەعسـی بـوون، یـەکێك لـە بەرپرسـان بەرهەڵسـتی کـردم و وتـی: ئێمـە کـاتی خـۆی خـەباتمان کـرد ئـەمڕۆ دەمانەوێت بەری خەباتمان بخۆین، پێم وت وا دەردەکـەوێت تـاکو ئـەمڕۆ بـەرێزت لـە مانـای خـەبات تێنەگەیشتووی، خەباتکەر ئەو کەسەیە دەبێت بە مۆمێك تـاکو رێگـە لەبـەردەم کەسـانی تـردا رۆشـن بکاتەوە.

## ئافرەت و یەکسانی لەگەڵ پیاو:

ئافرەت هەموو ئەو مافانەی هەیە کە پیـاو هەیـەتی، گـەر ئـەو مافانـە ژێردەسـتە بـن بـۆ ویسـتی یاسـادانەر و ئامـادەیی رێکخسـتنی یاسـاییان هـەبێت وەك کـار و پلـە و پایـەکان و چـوونە ژێـر بەرپرسیارێتییەکان لە دەوڵەتدا، چونکە ئەو خودایـەی کـە دروسـتی کـردوون ئـەو یەکسـانبوونەی لـە ماف و ئەرکە یاسایی و رێکخستنییەکاندا بۆ هەردوو لا راگەیاندووە بەبێ جیاکاری و جیـاوازی، خـودا — سبحانه وتعالى — دەفەرموێت: ﴿وَالْمُؤْمِنُونَ وَالْمُؤْمِنَاتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاء بَعْضٍ يَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ﴾[1].

گومانی تێدا نییە ئەرکی هەر بەرپرسێکی سیاسی یان ئیداری بریتییە لە فەرمان کردن بـە چـاکە و رێگری کردن لە خراپە، واتە بەوەی خێر و چاك بێت بۆ کۆمەڵگـە و تـاکی ئـەو وڵاتـە، هـەروەها لـە رێگریکردن لە خراپە واتە لە هەر زیان و شەڕ و تێکدانێك لە وڵاتدا.

قورئان لەو سەرۆکارییەدا جیاوازی نەکردووە لە نێـوان نێـر و مێـدا، بـەڵکو بەرپرسـیارێتی دابـەش دەکرێـت بـە سـەر هـەردوو پۆلەکـەدا لەسـەر بنچـینەی لێوەشـاوەیی و شایسـتەبوون، نـەك لەسـەر بنچینەی نێر و مێبوون، هەندێ جار مێ لێوەشاوەیی و شایستەبوونی لە پیاو زۆرترە لـە شـاندانە ژێـر بەرپرسیارێتی و جێبەجێ کردنـی ئەرکەکەیـدا، بـۆ نموونـە، وەسـتانی زانـای موجتەهیـد خوالێخـۆش بوو "أبو الأعلى المودودي" لەپاڵ "فاطمة جنـاح"دا بـۆ هەڵبژاردنـەکانی سـەرۆکایەتی پاکسـتان دژ بـە

[1] سورة التوبة/٧١

ئەیوب خان [1]، بەڵگەی بەوە هێنایەوە کە "فاطمة" شایستەبوون و لێوەشاوەیی زۆرترە بۆ ئەو پلە و پایە ترسناکە.

ئەوەی زانراوە پێغەمبەر(ﷺ) نەهی کردووە لەوەی ئافرەت ئەم سەرۆکایەتییە بگرێتە دەست، وەك تایبەتکردنی گشتی ئەوەی لە قورئاندا هاتووە، بەڵام ئەم نەهییە بۆ بارێکە ئافرەت لێوەشاوەیی زۆرتر نەبێت لە پیاو، ئەگینا بەسەرپیاودا پێش دەخرێت، چونکە ئامانجی بنەرەتی لە پەیامی محمەدی بریتییە لە بەرژەوەندی تاك و کۆمەڵ، وەك قورئان دەفەرموێت: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَالَمِينَ﴾، ئەمە لە مافە ئیداری و رێکخستنییەکاندا، مافی سروشتی و مرۆییش هیچ کەس توانای ئەوەی نییە دڵوای یەکسانی تێدا بکات.

**یەکسانی لەبەردەم قەزادا:**

یەکسانی لەبەردەم قەزادا ئەم بنەمایە پێویستی دەکات بە یەك جۆر لە مامەڵە مامەڵەی هەموو تاکەکان بکرێت، ئەوانەی پەنا دەبەن بۆ قەزا بۆ چارەسەری ناکۆکییەکان و نەیارییەکان لە رووی مافەکان و ئەرکەکانەوە، بە رێگەیەك هیچ لایەکیان بەسەر لاکەی تردا فەزڵ نەدرێت لە گەیاندنی راستییەکان بە هەر هۆیەکەوە بێت.

پێشتر باسی ئەوەمان کرد کە پێویستە قازی پاك و بێگەرد بێت، بۆ بەدەستهێنانێکی تاکەکەسی یان مادی یان مەعنەوی بەلای لایەکیاندا لانەدات، و لە بڕیارەکەیدا سەربەخۆ بێت و هیچ کارتێکەرێکی دەرەکی کاری تێنەکات لەسەر بنچینەی پەیوەندییە تاکەکەسییەکان و ناوەنجگیری یان لەسەر بنچینەی ملکەچبوون بۆ دەسەڵاتی باڵا، بە هەمیشەیی رێگە و رەوگەی دەستەبەرکردنی دادپەروەری و پێدانی هەموو خاوەن مافێك ئەوەی شایستەیەتی لە پاداشت و سزا، چونکە گەر قەزا چاك بوو هەموو کۆمەڵگە چاك دەبێت و گەر خراپ بوو هەموو کۆمەڵگە خراپ دەکات، دەڵێن:

---

[1] ینظر العلامة الاستاذ الدكتور يوسف القرضاوي: أولويات الحركة الاسلامية في مرحلة القادمة /ص٢٩ دەڵێت: (زانای مەزن "أبو الأعلى المودودي" و کۆمەڵەکەی ئازارێکی زۆریان چەشت، کاتێك لەرووی فیقهی هەڵسەنگاندنەوە بۆی دەرکەوت هەڵبژاردنی "فاطمة جناح" زیانەکەی کەمترە لە هەڵبژاردنی "أیوب خان" بڕیاریدا دەنگ بە "فاطمة جناح" بدرێت، بۆیە "أیوب خان" هێرشێکی توندی کردە سەریان بەو فەرموودەیە (قەومێك سەرکەوتن بەدەست ناهێنێت کاروباریان ئافرەتێك بیگرێتە دەست)، بەڵام ئایا قەومێك سەرکەوتن بەدەست دەهێنێت کەسێکی ستەمکار کاروباریان بگرێتە دەست یان سەرکەوتن بەدەست ناهێنێت؟)

سەرۆك وەزیرانی بەریتانیای پێشووتر چەرچل، دوای ئەوەی جەنگی جیهانی دووەم کۆتایی پـێ هـات پرسیاری کاریگەری ئەو جەنگەی کرد لەسەر ئاکاری گەلی ئینگلیز، وەڵامیان دایەوە بـەوەی وەڵامیـان دایەوە، پاشان پرسیاری قەزای کرد ئـەوانیش وتیـان بـە جـەنگ و بـارە خراپـەکانی جـەنگ کاریگـەر نەبووە، وتی: کەوابوو هێشتا بەریتانیا لە خێردایـە، بۆیـە یەکسـانی لـە هـەموو کۆمەڵگەیـەکی خـاوەن سەروەری سەربەخۆدا بنەمایەکی بنچینەییە و پێویستە ڕەچاو بکرێت لـە هـەموو بوارەکانـدا بەتایبـەت لەبەردەم قەزادا.

## دووەم: دەستەبەرکردنی دادپەروەری:

دادپەروەری لە زمانەوانیدا مانای ڕاستوەستانی[1] هەیە، لە شەریعەتیشدا بریتییە لـە ڕاستوەسـتان لەسەر ڕێگەی ڕەوا و دوورکەوتنەوە لەوەی قەدەغەیە و پارسەنگ کردنـی ئـەقڵ بەسـەر ئـارەزوو و دژ بە ستەم.

لە زاراوەسازی فەقیهەکاندا: بریتییە لە دوورکەوتنەوە لە گوناهـە گـەورەکان و بـەردەوام نـەبوون و سوورنەبوون لەسەر گوناهە بچووکەکان و پابەنـدبوون بـە ڕاسـتگۆیی و خۆکـەناردان لـە درۆ و لەگـەڵ خۆپارێزیدابوون و دوورکەوتنەوە لە کرداری نزم و بێبایـەخ[2]، "دادپـەروەری" هـاو واتـای "داد"ە لـەو سۆنگەیەوە کە وشەی "عدل-داد" چاوگە، بۆیـە دەبێتـە میانـەگیری و ڕاستوەسـتان و مـەیل بـەلای ڕاستی و ڕەوادا، پوختەی قسان داد بریتییە لە بارێکی مام ناوەند لە نێوان هەردوو بەری زیـادەڕەوی و کەمڕەوی(کەچڕەوی)دا[3]، دادپەروەری لە زاراوەسازی فەیلەسوفاندا: بریتییە لە بنەمایـەکی نموونـەیی یان سروشـتی یـان دانـراوی کـە مانـای "حـەق" دیاریـدەکات، و ڕێزگرتن و پیـادە کردنـی پێویسـت دەکات، گـەر دادپـەروەری پەیوەسـت بـوو بـە شـتێکی پڕاوپـڕ بـە حەقـەوە ئامـاژە بـە یەکسـانی و ڕاستوەستان دەکات، گەر پەیوەست بوو بە بکـەرەوە ئامـاژە دەکاتـە سـەر یـەکێك لـە سـیفەتە بـاڵا بنەڕەتییەکان: دڵنایی، ئازایەتی، پاکێتی.

---

[1] مختار الصحاح: مادة عدل

[2] دوو پێناسەکە بۆ جورجانی دەگەڕێتەوە.

[3] "الإفراط" بریتییە لە تێپەڕاندنی سنوور لە لای زیادەوە، "التفریط"یش بریتییـە لـە تێپەڕانـدنی سـنووری ماقووڵی داواکراو لە لای ناتەواوییەوە.

دڵنیاییەرووەری بەشێك نییە لە سیفەتە بەرز و بڵندەکان، بەڵکو بریتییە لە هەموو سیفەتە بەرز و بڵندەکان، دڵنیاییەرووەری کۆمەڵایەتی بریتییە لە رێزگرتن لە مافی کۆمەڵگە[1].

**دادپەروەری رەها و دادپەروەری رێژەیی:**

زانایانی یاسا دڵنیاییەرووەرییان دابەش کردووە بەپێی چەمکەکە بۆ دڵنیاییەرووەری رەها و دڵنیاییەرووەری رێژەیی:

مەبەست بە دڵنیاییەرووەری رەها بریتییە لە دڵنیاییەرووەری راستەقینە و بابەتییانە کە بە جیاوازی کات و شوێن و کەس و رەوشە دەرەکییەکان(ژینگەییەکان) و رەوشە خودییەکان (تاکەکەسییەکان) گۆڕانی بەسەردا نایەت.

بۆیە وتویانە: دڵنیاییەرووەری تایبەت بە هەندێ کەس تێگەیشتنێکی رەهای جێگیری هەیە و بە گۆڕانی کات و شوێن ناگۆڕێت، بەڵکو بەهایەکی بالآیە و هەموو بەهاکانی تر لەئامێز دەگرێت، تایبەت بە هەندێکی تر تێگەیشتنەکەی رێژەییە لە کۆمەڵگەیەکەوە بۆ کۆمەڵگەیەکی تر دەگۆڕێت، بەڵکو لە دەستەیەکەوە بۆ دەستەیەکی تر لە یەك کۆمەڵگەدا، تایبەت بە دەستەی یەکەم دڵنیاییەرووەری لەسەر هەندێك بەڵگەنەویستی جێگیر کە شایەنی ئاڵوگۆڕ و یان گۆڕان نین بیناکراوە، بەچاوپۆشین لەوەی وەرچەرخانە کۆمەڵایەتییەکان دروستی دەکەن لە گۆڕانکاری تێگەیشتن لە زەمینی خەڵکیدا.

تایبەت بە دەستەی دووەم کارەکە پەیوەستە بە دڵنیاییەرووەرییەوە کە دەوڵەت کار دەکات بۆ دەستەبەرکردنی، ئەو دڵنیاییەرووەرییە دڵنیاییەرووەرییەکە لە کۆمەڵگەیەکی دیاریکراو و سەردەمێکی تایبەتەوە و هەتا دوایی[2] سەرنج دەدرێت، تێبینی ئەوە دەکرێت ئەم دابەش کردنە سەرباری ئەوەی لەسەر بنچینەیەکی زانستی وردی رۆشن بینا نەکراوە تاکو دەستەی یەکەم لە دەستەی دووەم جیابکاتەوە لە نێوان دڵنیاییەرووەری لەڕووی چییەتییەوە و دڵنیاییەرووەری لەڕووی پیادە کردنەوە تێکەڵییەکی دروست کردووە، چییەتی دڵنیاییەرووەری راستەقینە و بابەتیانەیە بە گۆڕانی کات و شوێن و کەس کاریگەر نابێت، بۆیە بریتییە لە بڕیاری پێدانی هەموو کەسێکی مەعنەوی یان سروشتی ئەوەندەی شایستەیەتی لە خەڵات کردن یان سزادان[3]، بەڵام لە رووی پیادە کردنەوە هەندێ جار

---

[1] المعجم الفلسفي / المرجع السابق / ٢ / ٥٨ ومايليها

[2] لمزيد من التفصيل يراجع د. ابراهيم حسن / غاية القانون – دراسة فلسفة القانون / ص١٣٣

[3] واتە بەبێ زیاد و کەم

بابەتیبوونی ئەم چییەتییە لەبەر کۆمەڵێك هۆی مرۆیی و شتانی تر رەچاو ناکرێت، بۆیە هەندێ جار کەسی شایستە بە بڕێکی دیاریکراو لە خەڵات زیاد لە شایستەبوونی خۆی وەردەگرێت، هەروەها کەسی شایستە بە سزایەکی دیاریکراو بە یاسا بەپێی دادپەروەری رەها هەندێ جار سزا دەدرێت بە کەمتر لەوەی شایستەیەتی بە لەبەرچاوگرتنە خودی و دەرەکییەکان، بۆیە لەم بارانەی پیادە کردنی دادپەروەریدا وەك چۆن دادپەروەری هەندێ کات راستەقینەیە هەندێ کاتی تر رێژەییە.

دادپەروەری دابەشکردنی و دادپەروەری ئاڵوگۆڕی:

زانایانی یاسا لە رووی سەرچاوەوە دادپەروەری بۆ دوو بەش جیا دەکەنەوە: دابەشکردنی و ئاڵوگۆڕی:

١.دادپەروەری دابەشکردنی: بریتییە لەو دادپەروەرییەی کە سەرچاوەکەی دەسەڵاتی گشتییە کاتێك بەپێی دەستور یان یاسا ئەرکەکان و مافەکان دابەش دەکات بینا لەسەر پەیوەندییە راوەستاوەکانی نێوان ئەو دەسەڵاتە گشتییە و رۆڵەکانی ئەو کۆمەڵگەیە(تاکەکان)، نەك لەسەر بنچینەی یەکسانی رەها، بەڵکو لەسەر بنچینەی یەکسانی تەبایی، ئەوەش بەوەی لە کاتی دابەش کردنی ئەرکەکان و مافەکان بەسەر تاکەکاندا ئەو جیاوازییە سەپاوەی لە نێوان تاکەکاندا بوونی هەیە رەچاو بکات، لە رووی پێویستییەکان و توانینەکان و لێوەشاوەییەکان و سروشتی کار کە پێی هەڵدەستن.

٢.دادپەروەری ئاڵوگۆڕی: ئەو دادپەروەرییەیە لەسەر پەیوەندییە داراییەکان و ناداراییەکان دامەزراوە لە نێوان تاکەکاندا هەندێکیان لەگەڵ هەندێکی تریان[1]، وەك هاوسەنگی نێوان دوو لایەنی قەرەبووکاری لە قەرەبووکردنەوەکاندا، هەروەها لە نێوان ماف و ئەرکدا لەسەر بنچینەی پەیوەندی هاوسەرێتی و هاوشێوەکانی.

راستکردنەوەی دابەشکردن:

---

[1] ينظر د. حسن كيره / المدخل الى القانون / دار النهضة / بيروت / ١٩٦٧ / ص ١٦١ وما يلها. د. عبدالحي حجازي / المدخل لدراسة العلوم القانونية / الكويت / ١٩٧٢ / ص ٢١٤. د. ابراهيم حسن / غاية القانون المرجع السابق ص ١٤٧ وما يليها.

ئەم دابەشکردنە وەك دابەش کردنەکەی پێشتر بە تەرازووی ئەقڵی تەندروست و لۆژیك نەنگ و ناتەواوە، چونکە چییەتی یەکسانییان بە چییەتی دادپەروەری تێکەڵ کردووە، ئەو دوو چییەتییەش لە رووی تێگەیشتنەوە لەیەکتر جیاوازن، وەك پێشتر باسکراوە.

دابەشکردنی مافەکان و ئەرکەکان کە سەرچاوەکەی دەسەڵاتی گشتییە لە دەروازەی یەکسانییە نەك لە بەشی دادپەروەری، هەر بەو جۆرە دادپەروەری ئاڵوگۆڕی بریتییە لە یەکسانی نێوان دوو قەرەبووکار و مافەکان و ئەرکە ئاڵوگۆڕەکانی نێوان تاکەکان، ئەم تێکەڵییە کە یاساناسانی تێکەوتووە بەرهەمی پەی نەبردنە بە رێژەی لۆژیکی لەرووی دەستەبەرکردنەوە، چونکە هەرکات یەکسانی دەستەبەر بوو دادپەروەری دەستەبەر دەبێت، نەك بە پێچەوانەی هەمووەکییەوە، بەڵام دادپەروەری وەکو چەمك و چییەتی شتێکە و یەکسانی شتێکی ترە، باشتر بوو بۆیان یەکسانیان دابەش بکردبایە بۆ دابەشکردنی و ئاڵوگۆڕی لەگەڵ رەچاوکردنی دادپەروەریدا.

پاشان دادپەروەری لە بەها و سیفەتی باڵا و جێگیرکردنی حەق و پێدانی مافە بە هەموو خاوەن مافێك چەندەی شایستەیە، لە کاتێکدا یەکسانی لە دەروازەی بەراورد پێکردنی نێوان مافەکان و ئەرکەکانە لە دەسەڵاتی گشتییەوە لەگەڵ مافەکان و ئەرکە ئاڵوگۆڕەکان لە تاکەکانەوە هەندێکیان لەگەڵ هەندێکی تریان.

### جیاکردنەوەی داد لە دادپەروەری:

زانایانی یاسا "داد"یان لە "دادپەروەری" جیاکردۆتەوە، و دەڵێن: داد بریتییە لە پێدانی هەموو کەسێکی شایستە ئەوەندەی کە شایستەیەتی بەبێ زیاد و کەم.

بەڵام دادپەروەری بریتییە لە بڕیاردان بە پێدانی کەسێك زۆرتر یان کەمتر لەوەی شایستەیەتی بە لەبەرچاوگرتنی مرۆیی یان شتانی تر، بۆیە کاتێك قازی بڕیاری سزایەك بەسەر تاوانباردا دەردەکات کەمتر لە قەبارەی تاوانەکە ئەوە بریتییە لە دادپەروەری، نەك داد، بە هەمان شێوە گەر سەرۆکی دەزگایەك رێزی نا لە یەکێك لە فەرمانبەرانی بە هەر لەبەرچاوگرتنێك بێت زۆرتر لەوەی شایستەی بوو ئەوە بریتییە لە دادپەروەری نەك داد، ئیتر بەم شێوەیە[1]. ئەم جیاکارییەی نێوان داد و دادپەروەری هەڵەیەکی بەربڵاوە لای یاساناسان، ئەوان تێکەڵییان بۆ دروست بووە لە نێوان داد و دادپەروەری و لەگەڵ ئیحساندا، زۆری یان کەمی بە هەر لەبەرچاوگرتنێك بێت ئەوە لە دەروازەی ئیحسانە نەك لە

---

[1] د. عبدالحي حجازي / المرجع السابق / ص ٢١٩

دەرواەی داد و دادپەروەری، قورئان جیاوازی کردووە لە نێوان داد و دادپەروەری لەم ئایەتەدا: ﴿إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُ بِالْعَدْلِ وَالإِحْسَانِ﴾[1]، ئیحسانی عەتف کردۆتەوە سەر "عدل" بۆ جێگۆرکێ، گەر مرۆڤ چەندەی شایستەی بوو لە ماف وەریگرت بەبێ زیاد و کەم ئەوە لە دەروازەی داد و دادپەروەرییە، گەر بە رێژەیەك وەریگرت زیاتر یان کەمتر بە لەبەرچاوگرتنی مرۆیی یان ئەخلاقی یان هاوشێوەکانی ئەمانە ئەوە پێی دەوترێت ئیحسان، پاشان دادپەرەری لە "داد"ەوە داتاشراوە، ئەوەی وشەکانی تری لێوە دادەتاشرێت پارێزگاری لە مانای خۆی دەکات لەناو هەموو داتاشراوەکانیدا گەر مادە بنەڕەتییەکە(پیتە بنەڕەتییەکان) نەگۆڕابێت، بۆ نموونەوشەی "القتل-کوشتن" کە سەرچاوەیە بۆ تەواوی داتاشراوەکانی، مانای یاسایی و شەرعییەکەی بریتییە لە مراندنی رۆحی مرۆڤ کە لە کاتی دەستدرێژی کردنە سەریدا لە ژیاندا بووە، ئەم مانایە ناگۆڕێت لە فرمانە رابردووەکەیدا "قتل-کوشتی" و فەرمانە رانەبردووەکەیدا "یقتل-دەیکوژێت"، ناوی بکەرەکەیدا "القاتل-بکوژ" و ناوی بەرکارەکەیدا "المقتول-کوژراو".

# باسی سێیەم:
# فەلسەفەی یاسا لەرووی جێبەجێ کردنەوە

جێبەجێ کردنی سزا بەسەر تاوانباردا بەوەی ئازادی لێ داگیربکرێت یان جەستەی ئازار بدرێت، هەر بەو جۆرە جێبەجێ کردنی قەرەبووکردنەوە بەسەر قەرزداردا و هاوشێوەکانی ئەمانە، پێویستە مەبەست پێیان چاککردنی کەسی تاوانبار بێت و قەرەبووکردنەوەی ئەو کەمی و ناتەواوییەی بەهۆی کارێکی ناڕەواوە روویداوە.

فەلسەفەی سزا لە یاسای سزاییدا بریتییە لە چاککردن، لە یاسای مەدەنیدا بریتییە لە قەرەبووکردنەوەی ئەو زیانەی کە رووبەڕووی قەرزدەر بووەتەوە بەهۆی هەستانی قەرزدار بە کارێکی زیانبەخشی ناڕەوا.

[1] سورة النحل / ٩٠

دلاپەروەری دلوا لە هەموو دەوڵەتانی جیهان دەکات کە سیاسەتی سزایی خۆیان بگۆڕن و بیرۆکەی تۆڵەسەندنەوە و ئازاربەخشین بە چاکسازی ئاڵوگۆڕ بکەن، دوای ئەوەی مرۆڤ قۆناغێکی دووری لە پێشکەوتن و گۆڕانکاری و شارستانییەت بڕیوە.

کاتی ئەوە هاتووە بەندیخانەکان بە قوتابخانەی چاکسازی ئاڵوگۆڕ بکرێن، تاکو بەندکراو تیایدا فێری کار و پیشە ببێت وەك بەرگدروو و دارتاشی و دروستکردنی شتی جوان و بەکەڵك و قەلاچۆکردنی نەخوێندەواری و بەکارهێنانی ئامێرە نوێیەکان وەك کۆمپیوتەر و ئینتەرنێت بۆ ئاگاداربوون بەسەر داهێنانە نوێیەکان و دۆزینەوە زانستییە تازەکان، و هاوشێوەکانی ئەمانە.

پێویستە بابەت و وانە و وتاری ئایینی و یاسایی و کۆمەڵایەتی و ئەخلاقی و دەروونی و هاوشێوەکانی ئەمانە بۆ بەندکراوان بوترێتەوە، بە رێژەی دوو بابەت لە مانگێکدا بەلانی کەمەوە.

هەروەها پێویستە هەفتەیە یەك جار دەرگای سەردانی کەسوکار بۆ لایان بەڕوویاندا بکرێتەوە، تاوانەکە هەرچەندە و هەرچییەك بێت کە کەسی بەندی ئەنجامیداوە.

پێویستە نەرێتی بەندکردنی تاکەکەسی واز لێ بهێنرێت بۆ ئەو کەسانەی کە تاوانەکەیان ترس و هەڕەشەیە بۆ سەر کۆمەڵگە، چونکە ئەو جۆرە شێوازە لە بەندکردن رق و کینەی زۆرتر لە دڵی بەندییەکەدا دژ بە کۆمەڵگەکەی دروست دەکات.

پێویستە بینای بەندیخانەکان بگۆڕێن بە بیناگەلێك کە هەموو پێویستییە تەندروستی و وەرزشییەکانی تێدا بێت، پێویستە لە هەر بەندیخانەیەکدا کتێبخانەیەك هەبێت کە کتێبی بەسوودی لە هەموو جۆرەکانی زانست تێدا دابنرێت، هەروەها پێویستە مۆڵەتی مانگانە بەوانە بدرێت کە تاوانەکەیان بە ترسی گەورە سەرژمێر ناکرێت، ئەوەش بە کەفالەتێکی دارایی یان تاکە کەسی، تاکو بەشێك لە ئاسوودەیی و ئارامی خۆی وەربگرێت و ویژدانی بەئاگا بێتەوە و هەست بە گوناه و کەمتەرخەمی بکات و روو لە چاکبوونی نەفسی خۆی و راستکردنەوەی رەوشت و ئاکاری خۆی بکات.

پێویستە سوکایەتی نەکرێت بە رێز و حورمەتی کەسی تۆمەتبار لە کاتی لێکۆڵینەوە لەگەڵی و کاتی دادگایی کردنی و کاتی جێبەجێ کردنی سزاکە بەسەریدا لەدوای بڕیار، چونکە مرۆڤ دروستکەرەکەی(خودا) رێزی لێناوە بەبێ جیاکاری، بۆیە نابێت لەلایەن بەندەیەکەوە بەندەکەی خودا سوکایەتی پێ بکرێت، خودا –سبحانە وتعالى– لە قورئاندا دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي آدَمَ

وَحَمَلْنَاهُمْ فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ وَرَزَقْنَاهُم مِّنَ الطَّيِّبَاتِ وَفَضَّلْنَاهُمْ عَلَى كَثِيرٍ مِّمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلاً﴾[1]

شایانی باسە جێبەجێ کردنی سزا بەسەر تاوانباردا بە چەندین قۆناغدا گوزەری کردووە بەپێی پێشکەوتن و دواکەوتنی کۆمەڵگەکان لە مێژووی مرۆڤایەتیدا، گرنگترین ئەو قۆناغانە ئەمانەن:

١.قۆناغی تۆڵەسەندنەوە لە خودی تاوانکار یان هەر کەسێکی ئازادی تر سەر بە عەشرەتی تاوانکارەکە، یان سەر بە هۆزەکەی، ئەم شێوازە بەریەرییە دواکەوتووە سەریدەکێشا بۆ چەندین جەنگی وێرانکەر بە درێژایی چەندین ساڵ لە نێوان دوو عەشرەت یان دوو هۆزی کەسی تاوانکار و کەسی ستەملێکراو، تا ئێستا ئەم نەریتە خراپە لە نێوان عەشرەت و هۆز و تیرە جیاوازەکان ماوەتەوە سەرەڕای پێشکەوتنی مرۆڤایەتی.

٢. قۆناغی رادەست کردنی کەسی تاوانبار بە هۆزی کەسی ستەملێکراو بۆ ئەوەی بکەوێتە ژێر بەزەیی ئەوانەوە گەر بویستبایە دەیکوشت و ئەگەر نە، دەیکرد بە کۆیلە و بۆ مەرامی خۆی بەکاری دەهێنا، ئەم قۆناغە دوای ئەوە دێت کە مرۆڤایەتی هەنگاوێك هەڵدەگرێت بەرەو رۆشنایی و پێشکەوتن.

٣ .قۆناغی خوێندان(باریووکردنەوەی دڵرایانە) دوای شتێك لە پێشکەوتن و گەشە و گۆڕان هەردوو عەشرەتەکە یان هەردوو هۆزەکەی کەسی تاوانکار و کەسی تاوانلێکراو لەسەر باریووکردنەوەی دڵرایانە کە بدرێت بە کەسوکاری کوژراوەکە رێکدەکەوتن، ئیسلام ئەم شێوازەی لەپێکهێنانی نێوان لایەنەکان لا پەسەندە، ئەو باریووکردنەوەش بە سەد حوشتر یان ئەوەی بەرانبەری نرخی سەد حوشتر دەوەستێتەوە، بەلام ئیسلام سێ هەڵبژاردنی خستۆتە بەردەم خاوەن خوێن، تۆڵەسەندنەوە لە تاوانبار، یان وەرگرتنی خوێن، یان دلبەزین لەو دوو مافە ئاماژە بۆ کراوانە، خودا-سبحانە وتعالی- دەفەرموێت:﴿وَمَن قُتِلَ مَظْلُوماً فَقَدْ جَعَلْنَا لِوَلِيِّهِ سُلْطَاناً﴾[2]، وشەی "سلطان" لەم ئایەتەدا بریتییە لە دەسەلاتی هەڵبژاردنی یەکێك لەو سێ هەڵبژاردنە باسکراوانە، بینا لەسەر ئەم دەسەلاتە بڕی خوێنەکە دیاری ناکرێت، بەڵکو رێککەوتنی دوو لایەنەکە لەسەر هەر بڕێك دروستە بە مەرجێ بڕەکەی لە بەهای سەد حوشتر زیاتر نەبێت لە هەموو کات و شوێنێکدا.

---

[1] سورة الاسراء/٧٠

[2] سورة الاسراء/٣٣

٤.قۆناغی خۆپاککردنەوە لە گوناهەکە بەجۆرێك سزاکە گونجاو بێت لەگەڵ رادەی تاوانەکەدا لە رووی چەندێتی و چۆنێتییەوە، بۆیە رێگەی جێبەجێ کردن لەم قۆناغانەدا سیمای دڵڕەقی و درندەیی پێوە دیارە.

٥ .قۆناغی بیرۆکەی قازانجگەرایی، واتە سزا لە جێبەجێ کردنیدا روو بە رابردوو نییە بۆ پاکبوونەوە لە تاوانێك روویداوە و کۆتایی پێهاتووە، بەڵکو روو لە داهاتوو دەکات ئەگەری دووبارەبوونەوە و رووداڵنەوەی بۆ هەیە، بۆیە ئەم پێشبینیکراوە بە رێگرتنێکی تایبەت رێگە دەگرێت لە کەسی تاوانبار و بەرێگرتنێکی گشتیش رێگە دەگرێت لە چاولێکردنی خەڵکانی تر بۆی لە رێگەی دەمکوت کردنەوە.

٦.قۆناغی لە یەکدانی نێوان فەلسەفەی قازانجگەرایی (پارێزگاری کۆمەڵگە لە تاوانکاری داهاتوو) و فەلسەفەی ئەخلاقی (دەستەبەرکردنی دادپەروەری)

٧. قۆناغی ئاراستە وەرگرتنی نوێ لە یاساداڵنانی سزایی نوێدا، ئەوەش بریتییە لە نەهێڵانی سزای لە سێدارەدان و بیرۆکەی کاری قورس لە جێبەجێ کردنی سزاکەدا، هەروها ئاڵوگۆڕکردنی هەندێ تاوانی تایبەت بە ئازادی مرۆڤ و جەستەی بە سزای دارایی، هەروەها وەستانی جێبەجێ کردن لەگەڵ داڵنانی چاودێری بەسەر ئەو کەسەوە کە سزاکەی راگیراوە گەر مەرجەکانی هاتنە جێ.

هەروەها بە نەفی کردن(سەرونکردن) لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر، یاخود جێنشینی ناچاری یان وەرگرتنی رێوشوێنی خۆپارێزی، و هاوشێوەکانی ئەمانە، ئەوەی ئاشکرایە شەریعەتی ئیسلام پێدڵگری لە هۆکار و ئامرازە خۆپارێزییەکان دەکات و لە قەلاچۆکردنی تاواندا شانی لەسەر دادەوە زیاتر لە هۆکارە چارەسەرییەکان(سزاکان)، هەموو عیبادەتە جەستەییەکان وەك نوێژ و رۆژوو، یان داراییەکان وەك زەکات و بەخشین لە پێناو بەرژەوەندی گشتیدایە، یان تێکەڵە لە دارایی و جەستەیی وەك حەجکردن، هەموو ئەمانە هۆکارە خۆپارێزییەکانن بۆ چاککردنی مرۆڤ و لەوێشەوە قەلاچۆکردنی تاوان.

# بەشی نۆیەم

## بنەماکانی دادپەروەری و ئادابی قازییان لە ئیسلامدا

لێکۆڵینەوەی ئەم بابەتە لە دوو باسدا دەست بۆ دەبەین:

باسی یەکەم بنەماکانی دادپەروەری.

باسی دووەم ئادابی قازییان.

# باسی یەکەم:
# بنەماکانی دادپەروەری لە ئیسلامدا

دادپەروەری بریتییە لە پێدانی ماف بە هەموو خاوەن مافێک، ئەم مافە لە هەموو سەردەم و شوێن و رەوشێکی جیاوازدا جێگیرە، بە پێچەوانەی ئەوانەوە کە بانگەشە دەکەن گوایە دادپـەروەری کـارێکی رێژەییە، هەر وەک چۆن یەکسانی بریتییە لە هاوسەنگی نێوان مافـەکان و ئەرکـەکان تایـبەت بـە هـەر کەسێکی سروشتی یان مەعنەوی.

قورئان لە هەموو بوارەکـانی ژیـان و پەیوەندییـە مرۆییەکانـدا فـەرمانی بـە دادپـەروەری کـردووە، ئەمەش لە زۆرێک لە ئایەتەکانیدا: ﴿إِنَّ اللّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تُؤدُّواْ الأَمَانَاتِ إِلَى أَهْلِهَا وَإِذَا حَكَمْتُم بَيْنَ النَّاسِ أَن تَحْكُمُواْ بِالْعَدْلِ﴾[1]. هەروەها: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ كُونُواْ قَوَّامِينَ لِلّهِ شُهَدَاء بِالْقِسْطِ وَلاَ يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَآنُ قَوْمٍ عَلَى أَلاَّ تَعْدِلُواْ اعْدِلُواْ هُوَ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَى وَاتَّقُواْ اللّهَ إِنَّ اللّهَ خَبِيرٌ بِمَا تَعْمَلُونَ﴾[2]، هـەروەها: ﴿إِنَّ اللّهَ يَأْمُرُ بِالْعَدْلِ وَالإِحْسَانِ﴾[3].

هەرکەس سەرنجی قەزاوەتەکانی پێغەمبەر(ﷺ) و خولەفای راشیدین و هاوەڵـە فەقیهـەکان بـدات بەئاشکرا بۆی دەردەکەوێت رێگە و رەوگـەیان بـریتی بـووە لـە دەسـتەبەر کردنـی دادپـەروەری، لـەو باوەڕەوە کە دەقەکان ئامرازێکن بۆ دەستەبەر کردنی دادپەروەری.

لە دوای پێغەمبەر(ﷺ) دەستەبژێرێك لە فەقیهانی هاوەڵان و شوێنکەوتووان کە شارەزایی و ئاگاهی تەواویان لە زمانی قورئان هەبوو و ئاگاداربوون لە هۆی دابەزاندن و نهێنی شەرعرێژی کاری قەزایان گرتە دەست، هەموو ئەمانە لەپاڵ پاکی زەین و خێرایی تێگەیشتن و سەلامەتی فیترەت و وزیرەکی مێشك و مەلەکـەی فیقهیانـدا، ئـەوان کۆمـەڵێك دەسـتپاك بـوون لەسـەر شـەرعی خـودا و جێنشـین بـوون لـە

[1] سورة النساء /الاية: ٥٨
[2] سورة المائدة/الاية ٨.
[3] سورة النحل/اية٩٠.

پێشەوایەتی ئوممەتدا، بۆیە لەسەر رەوگەی پێغەمبەر(ﷺ) رۆیشتن و ئەو رێگەیان گرتە بەر کە پێغەمبەر(ﷺ) لەسەری بوو، لە هۆگرایی بۆ حوکمەکانی خودا بە ئامانج و بەرژەوەندی بەمەبەستگیراو لە شەریعەترێژی و پیادە کردنی و جێبەجێ کردنی، بۆیە ئەم مەیدانەیان بەرین کرد بەبێ سەرپێچی و یاخیبون وەك گەرنکەچییەك لەوانەوە بەوەی شەریعەتی خودا لەسەر دەق چەقینەبەستووە، تا خەڵکی رووبەرووی حەرەج بکاتەوە، چونکە حەرەج لە دەستووری خودا قبوول نەکراوە، خودا–سبحانه وتعالی– دەفەرموێت: ﴿وَمَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِي الدِّينِ مِنْ حَرَجٍ﴾[1].

لەو پێناوەدا دەقەکانیان بە دروستی پیادە کرد وەك دەستەبەرکردنی دادپەروەری، لەبەردەم حوکمی "دەق لەسەر هاتوو"دا دەوەستان و هۆیان بۆ دەبینییەوە، تاکو بازنەی جێبەجێ کردنی بەرین بکەن، حوکمگەلێکیان دەردەکرد وا خەیاڵ دەکرا ئەوانە سەرپێچیان لە حوکمی خودا کردبێت، بەڵام بەبیر و تێڕامانی تیژیان لەوە تێگەیشتبوون ئەو حوکمە هۆدارە بە هۆیەك و هۆیەکە نەماوە، بۆیە پێویستە کارکردن پێی رابوەستێنرێت، بەوەش بنەمایەکی گشتییان بۆ ئێمە داهێنا، ئەوەش: (گەر دوو بەرژەوەندی بەرهەڵستی یەکتریان کرد گرنگەکەیان وەردەگیرێت)، زۆرجار دەقە گشتییەکانیان تایبەت کردووە و دەقە رەهاکانیان سنووردار کردووە بە بەرژەوەندی گشتی، چونکە لەوە گەیشتبوون کە شەریعەتی ئیسلام بۆیە هاتووە بەرژەوەندی خێزانی مرۆڤایەتی دەستەبەر بکات، خودا–سبحانه وتعالی– دەفەرموێت: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَالَمِينَ﴾[2]، رەحمەت بریتییە لە بەرژەوەندی ئایینی یان دونیایی مادی بێت یان مەعنەوی ئەرێی(قازانجێکی دەستەبەرکراو)، یان نەرێی (زەرەرێکی لادراو) و شتانی تریش لە پیادەکردنە قەزاییەکانیاندا کە رێگەیان تەخت کردووە لەبەرم قازییەکاندا لە نەوەکان و سەردەمەکانی داهاتوودا و کۆمەڵێك بنەمای گشتییان بەجێهێڵاوە کە قازییەکان دەتوانن رێنموونییان لێوە بەدەست بهێنن لە هەموو کات و شوێنێکدا لەپێناو دەستەبەر کردنی دادپەروەری و پێدانی مافی رەوا بە هەموو خاوەن مافێك، لەو بنەمانە:

---

[1] سورة الحج/اية ٧٨.
[2] سورة الانبياء/آية ١٠٧

**یەکەم: بنەمای سنووردارنەکردن(نەبەستنەوە)ی قازی بە رووالەتی دەق:**

قازییەکان لە هاوەلان و شوێنکەوتوانی هاوەلان خۆیان بە روواڵەتی دەق و وەستان لە پـای مانـای روواڵەتیدا کۆتوبەند نەکردبوو گەر دەقەکە ئامادەیی ئیجتیهادی تێدا بووبێت، ئەوەی روونە قازی لە دوو باردا ئیجتیهاد دەکات:

یەکەمیان: باری نەبوونی دەق: گەر قازی دەقێکی تایبەتی نەبینییەوە بۆ حوکمی ئەو پرسە تایبەتە لەسەری پێویستە ئیجتیهاد بکات بـۆ گەیشـتن بـە حـوکمێکی دادپـەروەر، لەوەشـدا پـەنا دەبـات بـۆ سەرچاوە تایبەتەکان.

دووەم: باری بوونی دەقێك کە ئاماژەی بە حوکمەکە یەکلاوە نییە: لەسەر ئـەم بنچینەیە ئـەوەی لـە یاسای مەدەنی عێراقی دارێژراودا هاتووە(لە میانەی بوونی دەق ئیجتیهاد دروست نییـە) ئـەو دەقانـە دەگەیەنێت کە ئاماژەکانیان برِاوەیە، بەجۆرێك حوکمێکی تریان لیَ وەرناگیرێـت، بـەلام گـەر دەقەکـە ئاماژەکەی گومانئامێز بوو پێویستە لەسەر قازی ئیجتیهادی تێدا بکات بۆ دیاریکردنی حوکمێك گونجـاو بێت و نزیك بێت بە دادپەروەری و زۆرترین بەرژەوەندی لێوە بەردەست بکەوێت.

هەروەها لە پیادەکردنە قەزاییەکانی ئەم بنەمایە قەزاوەتی عومەری کوڕی خـەتاب و عـەلی کـوڕی ئەبی تالبە–خوایان لیَ رازی بێت– بە پیادەکردنی تۆڵەلێکردنەوە(سزای لەدادان) بەسەر زیاتر لە یـەك کەسدا گەر لە کوشتنی کەسێکدا بەشدار بوون، بەبیَ خۆ بەند کرد بە روواڵەتی دەقی ئایەتی: ﴿وَكَتَبْنَا عَلَيْهِمْ فِيهَا أَنَّ النَّفْسَ بِالنَّفْسِ﴾[1]، چونکە روواڵەتی ئەم دەقە دوای یەکسانی هاویەرانبـەری دەکـات لـە نێوان بڕ و رادەی تاوانەکە و بڕ و رادەی سزادانەکە، بە جۆرێك گـەر کـوژراو یـەك کـەس بێـت لـە تـەنها بکوژێك تۆڵە بسەنرێت، هەروەك چۆن وشەی "قصاص" لەم هاویەرانبەریەدا روون و ئاشکرایە.

خالی سەرەتا لە کۆمەککردن بە یاسای تاوان ئەو رووداوە تاوانکارییە بوو لـە سـەردەمی عومـەری کوڕی خەتابدا لە یەمەن روویدا، کە پوختەکەی:

ئافرەتێك لەگەلَ پیاوێکدا هاوبەشی کردبـوو لـە پـەیوەندییـەکی نامەشـروعدا بـۆ کوشـتنی کـوڕی مێردەکەی لـە ژنـی پیشـووتری، لـە ترسـی ئـەوەی هـەواڵی ئـەو پەیوەندییـە نـاڕەوا بگوێزرێتـەوە بـۆ مێردەکەی، پاشان دوای جێبەجیَ کردنی تاوانەکە پەردەی لەسەر لادرا، کێشەکە بەرزکرایـەوە بـۆ لای قازی(یعلی بن أمیە) لە سەنعای یەمەن، بەو ناوەی کە قازی بوو سەرپاری بوونی دەسـەلاتی جێبـەجیَ

[1] سورة المائدة/الاية: ٤٥.

كردن، بەڵام لەبەردەم رووڵەتی دەقی ﴿أَنَّ النَّفْسَ بِالنَّفْسِ﴾ وەستا و رووبەرووی دڵەراوكێ بوویەوە چۆن بڕیار بدات لە سزای دوو كەس كە بەشدارن لە كوشتنی یەك كەسدا، بۆیە ناوەندی خەلافەتی لە بابەتەكە ئاگادار كردەوە، عومەر و عەلی پێكەوە راوێژیان لەسەر بابەتەكە كرد، پاشان ئیجتیهادەكەیان گەیشتە ئەو شوێنەی كە بەندبوون لە رووڵەتی ئەم دەقەدا و دەستگرتن بە رووڵەتییەوە ژیانی بێگوناهان روبەرووی ترس و هەڕەشە دەكاتەوە، چونكە هەر كەس بیەوێت كەسێك بكوژێت كەسێكی تر دەهێنێت بۆ هەستان بە تاوانەكە تاكو سزای كوشتنی بەسەردا نەدرێت، هەروەها بۆ رەچاوكردنی دەدپەروەری و پارێزگاری لە رۆحی بێگوناهان هەردوو(عومەر و عەلی) بڕیاریان دا لە پێویستبوونی حوكمی تۆڵەسەندنەوە بەسەر زیاتر لە یەك كەسدا گەر بەشداربوون لە دەستدرێژی كردنە سەر ژیان و سەلامەتی یەك كەس، بۆیە خەلیفە عومەر وەڵامی دایەوە بە وتنی قسە بەناوبانگەكەی: (گەر هەموو ئەهلی سەنعا كۆبووبوونەوە لەسەر كوشتنی یەك كەس دەیانكوژێت) لە ریوایەتێكی تردا(بیانكوژە)

دووەم: بنەمای دەسەڵاتەكانی قازی تایبەت كردنی گشتگیری دەق و سنووردار كردنی رەهایی بە بەرژەوەندییەك هەركات دادپەروەری ئەوە داوا بكات:

هاوەڵانی قازی و ئەوانەی بەدوای ئەواندا هاتن ئەوەیان زانی هەموو شەریعەتە خوداییەكان كە بۆ سەر پێغەمبەران دابەزیون ئامانجەكەیان بەرژەوەندی مرۆڤ بووە، چونكە ئەو دروستكەرەی گەردوونی دروست كردووە و تاكو ئێستا ژیری زانایانی گەردوون لێی سەرسامن، لە كوێوە دەست پێ بكەن و لە كوێوە كۆتایی پێ بهێنن، ئەو خودایە بۆ خۆی بێنیاز و بێ بەرژەوەندییە لەوەی ئەو شەریعەتانە و پیادەكردنیان دەستەبەری دەكەن.

لەم پێگەیەوە ئامانجی تەریب بە دەقەكان بریتییە لە دادپەروەری و بەرژەوەندی مرۆڤ لە راكێشانی قازانج و وەلاتان و پاڵنانی زیان، لەسەر بنچینەی ئەم بنەمایە بۆ قازی هەیە دەقێكی گشتی تایبەت بكات و دەقێكی رەها سنووردار بكات هەر كات بەرژەوەندی داوای ئەوە بكات.

لە پیادەكردنە قەزاییەكانی ئەم بنەمایە هەستانی گەورەمان عەلی كوڕی ئەبی تالب -خوا لێی رازی بێت- بە تایبەت كردنی گشتگیری فەرموودەكەی پێغەمبەر(ﷺ): (دەستەبەركردن لەسەر كەسی ئەمانەتپێدراو نییە) واتە دەستەبەركردن نییە لەسەر كەسێك كە دەستی بریتییە لە دەستی ئەمانەتداری لەسەر ماڵ و دارایی خەڵك گەر دەستدرێژكار و كەمتەرخەم نەبێت، بۆیە دوو وشەی(دەستەبەركردن، ئەمانەتپێدراو) ناسراون و لە میانەی نەرێدا هاتوون و مانای گشتی دەگەیەنن بەپێی رێسا

ئوسولییەکان، سەرباری ئەوەش عەلی کوڕی ئەبی تالب–خوا لێی ڕازی بێت– ئەم گشتییەی تایبەت کرد بەهۆی بەرژەوەندییەکەوە و بڕیاری دەستەبەرکردنی بەکرێگرتەی هاوبەشی دا[1]، بۆیە بڕیاری دەستەبەرکردنی دڵرابیانەی دا گەر شتەکە لە ژێر دەستی بەکرێگرا تیابچێت، با کەمتەخەمیش نەبێت، ئەمەش وەك پارێزگاری بۆ ماڵ و سامانی خەڵکی و پابەندکردنی کەسەکە بەوەی هەوڵ بدات بۆ پارێزگاری ماڵ و سامانی تایبەت یان ماڵ و سامانی ئەو کەسەی شتەکەی لێ خوازراوە.

کاتێك پێی وترا چۆن بڕیاری دەستەبەرکردنی دەدەیت لە کاتێکدا دەستی ئەو کەسە دەستی ئەمانەتە کە پێغەمبەر(ﷺ) دەفەموێت: (دەستەبەرکردن لەسەر کەسی ئەمانەتپێدراو نییە)، بە قسە بەناوبانگەکەی وەڵامی دایەوە و فەرمووی: (تەنها ئەوە خەڵکی چاك دەکات)[2]

**سێیەم: بنەمای سوڕانەوەی حوکم لەگەڵ هۆیەکەیدا بە بوون و بە نەبوون:**

بۆ هەموو یاسادانانێك هاندەر و پاڵنەرێك بوونی هەیە، ئەگەر نە، کارێکی پووچ و بێ مانایە، هاندەر و پاڵنەری هەموو دەقێك لە وێناکردندا پێش یاسادانانەکەی دەکەوێت و لە پیادەکردن و جێبەجێ کردنی دەستەبەرکردندا دوای یاسادانانەکە دەکەوێت، چونکە ئامانجی هەموو شتێك دەرئەنجامەکەیەتی، ئەو دەرئەنجامەش یان ئەو ئامانجە کۆتاییە ناوگەلێکی تری هەیە، لەوانە: حیکمەت و بەرژەوەندی و هۆ، گەر ئامانجی کۆتایی هاوتەریب بە یاسادانانی دەق لە دەقەکە دولکەوت لەسەر قازی پێویستە کارکردن بەو دەقە لەو رووداوەدا ڕابوەستێنێت، چونکە ئامانجی کۆتایی و دلپەروەری هاوتەریب پێی لە پیادەکردنی دەقەکە دەستەبەر ناکرێت، بەڵکو پیادەکردنی دەقەکە لەو کاتەدا دەرچوونە لە مەرامی خاوەن شەرع.

هەروەها لە پیادەکردنە قەزاییەکانی ئەم بنەمایە قەزاوەتی عومەری کوڕی خەتاب بوو لەسەردەمی ئەبوبەکری سدیقدا–خوا لێی ڕازی بێت– بە ڕاگرتنی کارکردن بە دەقی قورئان: ﴿وَالْمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمْ﴾[1]، لە

---

[1] ئەو کەسەیە بۆ زیاتر لە یەك کەس کار دەکات وەك بەرگدروو و بازرگان و ئاسنگەر و بەڵێندەر.

[2] السنن الكبرى للبيهقي: ٢٨٩/٦، في التحرير والتيسير (١٢٣/٢): "أبو يوسف و محمد" بەکرێگرتەی هاوبەشیان دەستەبەر کردووە لەو شتانەی دەتوانرێت خۆپارێزی لێ بکرێت وەك دزی، بە پێچەوانەی ئەوەی گەر تیابچێت بەهۆیەکی زاڵ کە ناتوانرێت خۆپارێزی لێ بکرێت وەك سوتان و نوقمبوون لە ئاودا و ژێرکەوتنی گشتی ئەوە دەستەبەری تێدا نییە، بەڵکو بە فەرموودەی ئیمامی عەلی–خوا لێی ڕازی بێت– دەستەبەرکراوە.

ئایەتی دیاریکردنی ئەو پۆلانەی کە شایستەن بە پێدانی زەکات، "المؤلفة قلوبهم-دڵ بەدەستهاتووان" سێ بەشن:

بەشێکیان لە هاوەڵدانەران بوون کە بەرژەوەندییان زیانی بەرکەوتبوو بە هۆی پەیامی پێغەمبەرەوە(ﷺ) کە بانگ دەکات بۆ یەکسانی و کۆتاپێهێنانی ستەم و بە کۆیلەکردنی مرۆڤ بۆ برا مرۆڤەکەی و هەڵکێشانی رەگ و ریشەی هاوەڵدانان و سیستمی چینایەتی بێزراو، ئەو دەستەیە هەوڵی دانانی کۆسپ و لەمپەریان دا لەبەردەم بڵاوبوونەوەی پەیامی ئیسلامدا، بۆیە رێژەیەك لە سەرچاوەی زەکاتیان بۆ دابینکرا بۆ وەستانی چالاکییە تێکدەرانەکەیان و دانانی سنوورێك بۆ جموجوڵە شەڕنگێزەکانیان دژ بە ئیسلام.

بەشی دووەم ئیسان لە نا موسڵمانەکان بوون، بەڵام لە ئیسلام بوونیاندا بەرژەوەندییەك هەبوو، بۆیە بەشێك لە سەرچاوەی زەکاتیان بۆ دابینکرا بۆ راکێشانی دڵیان بەلای ئیسلامدا.

بەشی سێیەم تازە موسڵمان بوون، هێشتا باوەڕ لە دڵیاندا بنجی دانەکوتیبوو، بۆیە بەشێك لە زەکاتیان بۆ دابین کرا تاکو رێگەی خێر و چاکەیان لە رێگەی شەڕ و گومڕایی لا جیاببێتەوە.

دوای ئەوەی دەسەڵاتی ئیسلام بەهێز بوو و ترس لەسەری رەوایەوە، عومەری کوڕی خەتاب وای بۆچوو کە بێنیازبوون لە راکێشانی دڵان لە رێگەی زەکاتەوە، بۆیە -وەك قازییەك- بڕیاری دا زەکات نەدرێت بە "المؤلفە قلوبهم-دڵ بەدەستهاتووان" بە هەر سێ بەشەکەیەوە، چونکە زەکات بۆ قەلاچۆکردنی هەژاری و بەرتەسك کردنەوەی سیستمی چینایەتی نێوان دەوڵەمەند و هەژار دانراوە، هاوەڵە فەقیهەکان لەسەر ئەو بۆچوونە کۆدەنگیان هەبوو لەسەردەمی خەلیفەی یەکەم ئەبوبەکری سدیقدا، بەوەش بوو بە حوکمێکی کۆدەنگی، عومەری کوڕی خەتاب بەو کارەی بوو بە یەکەمین کەسێك رێسای (حوکم لەگەڵ هۆیەکەی بە بوون و نەبوون دەسوڕێتەوە) داهێنا.

## چوارەم: بنەمای لەدەستنەدانی پیادە کردنی حوکمی دەق بۆ بەرژەوەندییەکی گرنگتر:

بەرژەوەندی لە بەرچاوگیراو لە یاسادانانی دەقەکاندا و پیادەکردنیان و جێبەجێ کردنی حوکمەکانیان هەیانە "زۆر پێویست"ە و نەبوونی سەردەکێشێت بۆ تێکچوونی رێکخستنی کۆمەڵ و

---

(١) في قوله تعالى: ﴿إِنَّمَا الصَّدَقَاتُ لِلْفُقَرَاءِ وَالْمَسَاكِينِ وَالْعَامِلِينَ عَلَيْهَا وَالْمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمْ وَفِي الرِّقَابِ وَالْغَارِمِينَ وَفِي سَبِيلِ اللَّهِ وَابْنِ السَّبِيلِ فَرِيضَةً مِنَ اللَّهِ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾ سورة التوبة: ٦٠.

ژیان، هەیانە "پێویست"ە و دەستەبەرنەکردنی سەردەکێشێت بۆ نارەحەتی و تەنگەلانی ژیان، هەشیانە لە "جوانکارییەکانی ژیان"ە و تەواوکاری دوو جۆرەکەی پێشووە، بینا لەسەر جیاوازی لە گرنگی بەرژەوەندییەکاندا گەر بەرهەڵستکاری لە نێوانیان سەری هەڵدا ئەوا بەرژەوەندی "زۆر پێویست" دەخرێتە پێش بەرژەوەندی "پێویست"ەوە هەروەك چۆن هەردووکیان پێش بەرژەوەندییە "جوانکارییەکان" دەکەون.

بەرژەوەندی "زۆر پێویست" پێنجن کە بریتین لە: بەرژەوەندی پارێزگاری لە ئاین و ژیان و نامووس و ماڵ و ئەقڵ، ئەمانە لە زۆر پێویستییەکانی زیندەگی هەموو کۆمەڵگەیەکن لە جیهاندا، بەجۆرێك گەر یەکێك لەوانە پشێوی رووی لێکرد کۆمەڵگەکە ژیانی تێکدەچێت، گەر بەرهەڵستکاری کەوتە نێوان ئەم پێنج بەرژەوەندییە زۆر پێویستانەوە پارێزگاری لە ئاین و نامووس پێش دەخرێت بەسەر پارێزگاری لە ژیان، پارێزگاری لە ژیانیش پێش دەخرێت بەسەر پارێزگاری لە ماڵ و سامان، لە پیادەکردنە قەزاییەکانی ئەم بنەمایە عومەری کوڕی خەتاب لە ساڵی گرانی و برسێتیدا بڕیاری دا سزای دزی راگیرێت لەسەر ئەو کەسانەی تاوانی دزیان کردووە بۆ پڕکردنەوەی پێویستییە ناچارییەکانیان لە زیندەگی، ئەو سزایەی لەم دەقەدا هاتووە: ﴿وَٱلسَّارِقُ وَٱلسَّارِقَةُ فَٱقْطَعُوٓاْ أَيْدِيَهُمَا جَزَآءًۢ بِمَا كَسَبَا نَكَٰلًا مِّنَ ٱللَّهِ﴾[1]، لە شیکردنەوە و هۆهێنانەوەی ئەو بڕیارەدا قسە بەناوبانگەکەی خۆی کرد کە دەڵێت: (لە پیادەکردنی سزادا پارێزگاری لە ماڵ و سامان دەکرێت، لە راگرتنی سزادا تایبەت بە کەسی ناچار پارێزگاری لە رۆح و گیان دەکرێت، پارێزگاری لە رۆح و گیان لە پارێزگاری ماڵ و سامان لەپێشترە)

**پێنجەم: بنەمای نەگۆڕینی واقیع بە حوکمی قازی:**

لە ئیسلامدا حوکمی قازی سەرچاوەی ماف نییە، بەڵکو پەردە لەسەر لادەر و بڕیاردەرە لەوەی کە لە واقیعدا بوونی هەیە، چونکە لە هەر هەڵسوکەوتێکی مرۆڤ و لە هەر رووداوێك رووبەرووی دەبێتەوە خودا حوکمێکی تایبەتی بۆ هەیە، گەر کەسی موجتەهید یان قازی ئەو حوکمەی پێکا ئەوە راستیکردووە و گەر نەیپێکا بە هەڵەدا چووە.

بینا لەسەر ئەمە گەر حوکمی رووداوەکە یان رەفتارەکە بریتی بوو لە قەدەغەکردن لە واقیعدا و حوکمی قازی بریتی بوو لە رێگەپێدان، یان بە پێچەوانەوە، ئەوە پەند بە حوکمی واقیعە نەك بەوەی قازی بڕیاری لێداوە، بۆیە حوکمی قازی ناتوانێت حەرام حەلاڵ بکات و حەلاڵ حەرام بکات، جا

---

[1] سورة المائدة– الآية: ٣٨.

نەپێكانی قازی بۆ حوكمی واقیع بەهۆی هەڵەیەكەوە بێت لـە ئیجتیهادەكەیـدا یـان بـەهۆی ئـەو بەڵگـە درۆینانە و قەوڵە تەزویركراوانەوە بێت كە پێشكەشی دەكرێت.

بنچینەی ئەم بنەمایە فەرموودەكەی پێغەمبەرە(ﷺ) لە قەزاوەتكردنی ئەو داوایانەی كە بۆ بەردەمی بەرز دەكرانەوە: (ئێوە ناكۆكییەكانتان دەهێنن بۆ لای من، لەوانەیە یەكێكتان لە بەڵگەكەیدا زمان پاراوتر بێت لەویتر، بۆیە لە بەرژەوەندی ئەو بڕیار دەدەم بەو جۆرەی كە لێی دەبیستم[1]، هەر كەس شتێك لە مافی براكەیم بۆ بڕیبێت با وەرینەگرێت، چونكە من بەو بڕیارەم پارچەیەك لە ئاگرم بۆ بڕیوەتەوە)[2]

ئەم فەرموودەیە بە ڕۆشنی بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە بڕیاری قـازی شـتێك بـۆ بڕیـاربۆدراو حـەڵاڵ ناكات لەوەی بڕیاری بۆ دراوە بەسەر كەسانی تردا گەر ئەوەی بانگەشەی بۆ دەكات لە واقیعـدا پـووچ و بێبنەما بێت، و ڕاستكردنەوەی بەڵگەكانی درۆ بن.

بۆ قازی دروستە بەو جۆرە بڕیـار دەربكات كـە بـۆی دەردەكـەوێت و كەسـی بڕیـار بەسـەردراو ناچاربكات بە قبووڵ كردنی بڕیارەكە و جێبەجێ كردنی، ئیسلام قازی پابەند ناكـات هەمیشـە لەسـەر یەقین بڕیارەكانی دەربكات، چونكە گەر لە هەموو شتێكدا داوای یەقینی لێ بكرێت ئەوا زۆرێك كار و بار پەكیان دەكەوێت و مافی خەڵكی تیادەچێت، چونكە داوا و بەڵگـەكان هـەوڵن، هـەموو هـەوڵێكیش لـە خودی خۆیدا ئەگەری ڕاست و درۆی بۆ هەیە، ، بۆیە تەنها گومان دەبەخشن، ئەوەش بریتییە لە پـەی پێبردنێكـی پارسـەنگ لـەلای مـرۆڤ لەگـەڵ ئەگـەرێكی تـری پارسـەنگ نـەكراو كـە پێـی دەوترێـت ئەندێشە(وەهم)، هەروەك چۆن پەی بردن بـە هـەردوو بـەری پرسـەكە لـە سـەلماندن و نەسـەلماندن بەشێوەیەكی یەكسان پێی دەوترێت شك، وەك چۆن قازی پابەند ناكرێت بە یەقین بـە هـەمان شـێوە دروست نییە بە شك بڕیار بدات چونكە شك تەنها بۆ بەرژەوەندی تۆمەتبار شرۆڤە دەكرێت.

### شەشەم: بنەمای مامەڵە بە هەڵوەشاندنەوەی مەرامی خراپ:

ئیسلام فەرمانی بە مرۆڤ كردووە نییەتی باش و چاك بێت لە هەموو هەڵسوكەوت و مامەڵەی لەگەڵ كەسانی تر، هەروەها زیان پێگەیاندنی بە كەسانی تر و مامەڵە كردنی "زیان بە زیان"ی لە كار و قسەدا

---

[1] هەندێ داوا و وەڵامدانەوە و ڕۆشنكردنەوە و بەڵگە و سوێنخواردن هەیە لەوانەیـە پـووچ و بێبنـەما بـن لـە خودی خۆیاندا، بۆیە لە ماڵی براكەی پارچەیەك لە ئاگر دەبڕێت و ڕووی لێ دەكات.

[2] بەڵام گەر بڕیار بۆدراو نییەتی باش بوو و نەزان بوو بە تەزویری بەڵگە یان بە هەڵەی قـازی نـەدەزانی ئـەوە بە گوناه دانانرێت.

حەرام کردووە، ئەمەش لەسەر زمانی پێغەمبەر(ﷺ) (نە زیان و نە زیانگەیاندن[1])، پێغەمبەر(ﷺ) کارکردنی بە نیێتەوە بەستوە و کردوویەتی بە شوێنکەوتەی نیێت لە رووی دروستی و نادروستییەوە، بۆیە دەفەرموێت: (کارەکان بە نیێتن، هەموو مرۆڤێکیش ئەوەی بۆ هەیە کە نیێتی بۆ دێنێت) بینا لەسەر ئەم دوو رێسایە فەقیهەکانی شەریعەتی ئیسلام کۆدەنگیان هەیە لەسەر ئەوەی گەر کەسێك ژنەکەی تەلاق بدات لە کاتی سەرەمەرگدا بەبێ دڵوایەك لە ئافرەتەکەوە یان بەبێ کەمتەرخەمییەك لە ئەوەوە تەلاقەکە دەکەوێت گەر بەهۆش بێت، بەلام ژنەکە میراتی لێ دەبات بەهۆی ئەو مامەڵەی لە ئەوەوە بە نیێتی خراپ ئەنجام درا، تەلاقەکەی لەو کاتەدا لێکدانەوەی ئەوەی بۆ دەکرێت کە ویستوویەتی لە میرات بێبەشی بکات.

لە پیادەکردنە قەزاییەکانی ئەم بنەمایە قەزاوەتی گەورەمان عوسمانی کوڕی عەففان-خوا لێی رازی بێت- لە سەردەمی خەلافەتی خۆیدا بە میراتگرتنی ژنەکەی عبدالرحمن بن عوف[2] (تماضر) کاتێك لە نەخۆشی مردنەکەیدا بە تەلاقی جیابوونەوە تەلاقی دا، ئەم پێشینە قەزاییە بوو بە سەرچاوەیەك بۆ بڕیاری هەموو فەقیهەکان بە کەوتنی تەلاقی نەخۆش لە نەخۆشی مردندا و میراتبردنی ژنەکەی هەرچەند تەلاقی داوە بە تەلاقی جیابوونەوەی کۆتایی، وەك مامەڵەیەك بە هەڵوەشاندنەوەی نیێتی خراپی کەسەکە، ئەمەش جگە لە کەسانێکی زۆر کەم هیچ کەس ناکۆکی لەسەری نییە، بەلام جیاوازییان هەیە لە دیاری کردنی ماوەکە کە تیایدا مافی ژنەکە پاش خۆی لە میرات نامێنێت، بەم جۆرە:

أ. حەنەفییەکان[3] دەڵێن ژن میرات دەبات کە مێردەکەی دەمرێت و ئەو هێشتا لە عیدەدایە، بەلام گەر لە دوای عیدە پیاوەکە بمرێت میرات نابات بەهۆی پچڕانی پەیوەندی ژن و مێردایەتییەوە.

ب. جەعفەرییەکان[4] دەڵێن میرات دەبات گەر ساڵێك بەسەر تەلاقەکەدا تێنەپەڕی بێت و هاوسەرەکەی هێشتا زیندوو بێت، و شووی بە پیاوێکی تر نەکردبێت لە ژیانی پیاوەکەی یەکەمیدا، گەر دوای ساڵێك بەسەر تەلاقەکەدا پیاوەکە مرد یان ژنەکە

---

[1] سبل السلام: ٣/١١٠.
[2] المنتقى شرح الموطأ: ٤/٨٥ ومابعدها.
[3] المبسوط للسرخسي: ٦/١٥٤ز الدر المختار وشرح تنوير الابصار مع رد المحتار: ٣/٣٨٣.
[4] الكافي للكليني: ٦/١٢٢.

مێردێکی تری کرد لە ژیانی پیاوەکەی یەکەمیدا ئەوا میرات نابات، فەقیهە حەنبەلییەکان[1] لەگەڵ جەعفەرییەکان کۆکن لەوەی هاوسەرگیری ژنەکە مافی لە میرات بردن دەسڕێتەوە، چونکە واك دابەزین وایە لە مافی میرات بردن.

ت. مالکییەکان[2] و ئیبازییەکان[3] دەڵێن بە ڕەهایی میرات دەبات چونکە هۆی میراتگری پەیوەندی هاوسەرێتی نییە بەڵکو ئەوەی لە جێگەی ئەوە دادەنیشێت، ئەوەش بریتییە لە مامەڵەکردن بە دژی مەرامی خراپ، وەك ڕێگەگرتن لە خراپە، ئەم هۆیە بە تێپەڕینی کات ناسڕێتەوە، ئەم ڕایەی دوایی شایستەی وەرگرتنە، هەتا هۆی حوکمەکە بەردەوام بێت حوکمەکە دەمێنێتەوە، چونکە لەگەڵی ناسوڕێتەوە بە بوون و نەبوون.

بینا لەسەر ئەم بنەمایە کە یەکێك لە خەلیفەی راشیدین بڕیاری لەسەر داوە و لە سەردەمی ئەودا کۆدەنگی لەسەر بووە، زۆر پێویستە پێداچوونەوە لە برگەی دووەم لە مادەی (٣٥)ی یاسای باری کەسێتی عێراقی داوەستاو بکرێت، کە ئەمە دەقەکەیەتی: (تەلاقی نەخۆش بە نەخۆشی مردن یان لە بارێکدا تیاچوونی نەخۆشەکە ئەگەرێکی زاڵە ناکەوێت گەر لەو نەخۆشییەدا یان لەو ئەگەری تیاچوونەدا بمرێت) پێشنیاری لابردنی برگەی دووەمی ئەو مادەیە دەکەم لەبەر ئەم هۆیانە:

١. پێچەوانەی یاسای هەموو وڵاتانی عەرەبی و ئیسلامییە کە بڕیاری تەلاقکەوتنی داوە لەگەڵ میراتبردن لە مێردەکەی.

٢. نەکەوتنی تەلاقی نەخۆش بە نەخۆشی مردن لە کاتی هۆشیاری تەواو و هەستی تەواودا پێچەوانەی کۆدەنگی فەقیهە موسڵمانەکانە.

---

[1] المغني لابن قدامة: ٦/٣٢٠..

[2] المنتقى شرح موطأ الامام مالك: ٤/٨٥-٨٦.

[3] شرح النيل وشفاء العليل لمزيد من التفصيل راجع مؤلفنا سلطان الارادة في الطلاق في الشريعة الاسلامية والقانون خلال ٤٠٠٠ سنة: ٢/٥٩-٧٠.

٣.گەر نەکەوتنەکەی بۆ نەبوونی هۆش و هەستی تەواو دەگەڕێتەوە لەلای هاوسەرە پیاوەکە ئەوا لەگەڵ بڕگەی یەکەم ئەو مادەیە دووبارەیە کە دەقەکەی لەسەر نەکەوتنی تەلاقی ئەو کەسە جیاکاری پێ ناکرێت بەهۆی پیرییەوە یان بە هۆی نەخۆشییەوە.

٤.گەر تەلاق ناکەوێت گوزارەی (ژنەکەی میرات دەگرێت) بێ مانایە، ئەوەی پێویستە ئەوەیە یاسا بێمانایی تێدا نەبێت.

٥.گەر مەرامی یاسادانەر پارێزگارییە لە ماف ژن فەقیهەکان کۆدەنگیان هەیە لەسەر پارێزگاری لەو مافە.

٦.چۆن قازی پێشوەخت دەزانێت ئەو هاوسەرە نەخۆشە بەو نەخۆشییەی کە دەمرێت، ئایا خودا ناتوانێت شیفای بۆ بنێرێت؟ چەندین کەس لیژنەی پزیشکی دڵنیان بە مردنیدا ناوە بۆ ماوەیەکی کەم و پاشان چەندین ساڵ ژیاوە، بینا لەسەر ئەم بڕگەیە هاوسەرە ژنەکە لەو ماوە دیاریکراوەی نێوان حوکمی قازی و مردنی هاوسەرە پیاوەکە لە حاڵەتی هاوسەری و ناهاوسەریدا دەمێنێتەوە، گەر لەو نەخۆشییەدا پیاوەکە مرد ئەوا حوکمەکەی قازی دروستە، ئەگەر نە، ئەوا پێچەوانەی واقیعە، چونکە تەلاق لە نەخۆشی مردنەکەدا نەبووە تا بڕیاری نەکەوتنی بدات.

### حەوتەم: بنەمای گۆڕینی حوکمەکان بە گۆڕینی سەردەم:

پێویستە قازی زانا بێت بە رەوشەکان کە ئابلۆقەی یاسارێژی دەقیان داوە، تا بەراوردی پێ بکرێت بە رەوشی پیادەکردنیان بە جۆرێك گەر بینییەوە لە کاتی پیادە کردندا گۆڕانێك بەسەریاندا هاتووە دەقەکە تایبەت بکات گەر گشتی بێت، و سنووردار بکات گەر رەها بێت، هەروەها تەئویلی بۆ بکات گەر ئامادەیی تەئویلی تێدا بێت، چونکە لە باری نەبوونی ئەم هەڵسەنگاندنەدا لەوانەیە قازی پێچەوانەی دادپەروەری بڕیار دەربکات، ئەو کات تەنگەلانی و نارەحەتی روو لە کۆمەڵ بکەن، ئەوانەش لە قورئان رەدکراوە و قبووڵ نەکراون: ﴿وَمَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِي الدِّينِ مِنْ حَرَجٍ﴾[1]. هەروەها: ﴿يُرِيدُ اللَّهُ بِكُمُ الْيُسْرَ وَلاَ يُرِيدُ بِكُمُ الْعُسْرَ﴾[2]. لە پیادەکردنە قەزاییەکانی ئەم بنەمایە: نرخی شتومەك و پێویستییەکان لە مەدینەی منەوەرە بەرزەوە بوو و شتەکان گران بوون، وەفدێك چوو بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) وتیان: ئەی

[1] سورة الحج/اية ٧٨.
[2] سورة البقرة /١٨٥.

پێغەمبەری خودا لە مەدینە نرخ زۆر بەرز بۆتەوە، نرخمان بۆ دابنێ، پێغەمبەر نرخی دانەنا و بە ستەم و پێچەوانەی دادپەروەری زانی، چونكە هۆی بەرزبوونەوەی نرخ و گرانبوونی شتومەك كەمی بەرهەم بوو و ئەوەش بۆ یاسای داوا و خستنەروو دەگەڕێتەوە، داواكردن زۆر تر بوو لە خستنەروو، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ((خودا نرخ دابڕێژ و گرژكەر و واڵەكەر و رۆزیدەرە، من هیوام وایە بگەم بە خزمەتی خودا و هیچ یەكێك لە ئێوە بە ستەمێك لە خوێن و ماڵ داوام لێ نەكات))[1] بۆیە نرخڕێژی لە چوارچێوەی ئەو رەوشەدا ستەم و زیان گەیاندن بوو بە بازرگانان و فرۆشیاران.

كاتێك ئەو رەوشە لە سەردەمی فەقیهەكانی شوێنكەوتووان گۆڕانی بەسەردا هات، دەروونەكان گۆڕان و بەلای چاوچنۆكی و رەنجخۆری و قۆرخكاری و بەدەستهێنانی قازانجدا لەسەر حسابی بەكاربەر خواربوونەوە قازییەكان و فەقیهەكانی شوێنكەوتووان بڕیاری نرخدانانیان دەركرد، بۆ لابردنی ئەو گرانی و تەنگەلانییەی سەریهەڵدابوو، لەوانە "سعید بن المسیب و ربیعە بن عبدالرحمن و یحیی الأنصاري" و كەسانی تریش، لەگەڵ ئەوەی گوزارەی ئاشكرای دەقی فەرموودە ئاماژەبۆكراوەكە ئەوەیە كە نرخدانان ستەمكارییە دەرحەق بازرگانان و فرۆشیاران، لەگەڵ ئەوەش هیچ دژیەتییەك نییە لە نێوان حوكمەكەی پێغەمبەر(ﷺ) بە دانەنانی نرخ و بڕیاری قازییەكان لە شوێنكەوتوان، چونكە بۆ هەر یەكێك لەو دوو حوكمە رەوشێكی تایبەت و بار و دۆخێكی جیاواز بوونی هەیە.

### هەشتەم: بنەمای نەبوونی دەسەڵاتی قازی لە داهێنانی تاوان و سزادا:

بە هۆی ترسناكی پایەی قەزاوە لە سەرەتای ئیسلامەوە تا كۆتایی چاخی عەباسییەكان كەسێك ئەم پلە و پایەیەی نەگرتۆتە دەست موجتەهید نەبووبێت یان ئەهلی ئیجتیهاد نەبێت، سەرباری گرنگی ئەم پێگە زانستییە دەسەڵاتی تاوانباركردن و داهێنانی سزای وەك سیفەتی قازی نەدراوەتە دەست، بەڵكو ئەو دەسەڵاتە دراوەتە دەست ئەو كەسەی ویلایەتی كردای بەسەر موسڵمانەوە هەیە بە هاوكاری لەگەڵ ئەهلی شورا، ئەمەش لەبەر ئەوەی شەریعەتی ئیسلام یەكەمین شەریعەتە بانگی بۆ بنەمای شەرعیەت كردووە: (بنەمای تاوان و سزا تەنها لە رێگەی دەقەوەیە)، قورئان دەقی ئەم بنەمایەی خستۆتە روو، دەفەرموێت: ﴿وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّى نَبْعَثَ رَسُولاً﴾[2]

---

[1] نيل الاوطار للشوكاني: ٢٣/٥.

[2] سورة الاسراء/الاية: ١٥.

سـزا و تۆڵـە تـەنها لـەدوای نـاردنی پێغەمبـەران و گەیانـدنی پـەیامی خودایـە بـە خـەڵکی بـە ئاگاداركردنەوەیان لەوەی دروستە و لەوەی نادروست و قەدەغەیە.

نەبوونی سزا و تۆڵە نەبوونی بەرپرسیارێتی سزایی دەگەیەنێت، هەروەها ئایەتی: ﴿وَمَا كَانَ رَبُّكَ مُهْلِكَ الْقُرَى حَتَّى يَبْعَثَ فِي أُمِّهَا رَسُولاً يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِنَا﴾[1]، ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسـەر ئـەوەی نـەزانی بیانوو و پاساوە، بە بەڵگەی ئەو بەشەی ئایەتەکە کە دەفەرموێت: ﴿يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِنَا﴾، واتـە تـەنها ناردنی پێغەمبەران و دابەزاندنی شەرع بەس نییە بۆ راگەیاندنی بەرپرسیارێتی سزایی بۆ کەسانێك كارێك ئەنجام دەدەن کە شەرع حەرامی کردووە و هێشتا پەیامی خـودای پێنەگەیشـتووە گـەر کەمتەرخـەم نەبێت لە نەبوونی زانست و نەبوونی ئاگاهی بە پەیامی خودا.

لە بنەمای شەرعی باوەڕ بە خودا هەڵاوێردە دەكرێت، چونكە باوەڕ بە خـودا لەسـەر مـرۆڤ لـەڕووی ئەقڵەوە پێویستە بەر لەوەی پێویستێكی شەرعی بێت، بۆیە لەسەر هـەموو مرۆڤێکی پێگـەیووی ژێـر پێویستە بۆ باوەڕ بە خودا بەڵگە بهێنێتەوە بە بەڵگەی كاتی، واتە بەڵگە هێنانـەوە بـە ئاسـەوار لەسـەر بوونی خاوەن ئاسەوار، چونکە گەر باوەڕ بە خودا لەسەر باوەڕ بە شـەرع راوەسـتایە گـیردان بەسـەر داواكراودا پێویست دەبوو(نەگونجانی لۆژیکیانە) چونکە باوەڕ بە شەرع دوای باوەڕ بە خودا دێت، گـەر باوەڕ بە خودا لەسەر شەرع راوەستایە ئەوا راوەستانی شتەکە لەسـەر ئـەوەی لەسـەری دەوەسـتێت پێویست دەبوو، ئەوەش وەستانی شتێکی لەسەر خۆی پێویست دەكرد، پێویستكار بۆ پێشـكەوتنی شتێك لەسەر خۆی، ئەم پێویستکردنە پووچە و هەر بەو جۆرەش پێویستکراو.

### دۆیەم: بنەمای بێگوناهی بنەڕەتی:

زانایانی ئیسلام كۆدەنگیان هەیە لەسەر ئەوەی بنەڕەت لە مرۆڤـدا ئەسـتۆ پاكییـە، چـونكە مـرۆڤ لەدایك دەبێت و ئەسـتۆی پاكـە لـە هـەر پابەنـدبوونێکی مـەدەنی و سـزایی و پـێش لەدایكبوونیشـی شایستەیی پێویستی ناتەواوی هەیە، ئەوەش بریتییە لە ئامادەیی بۆ ئەوەی هەندێك مافی هەبێت، دوای لەدایكبوونیش شایستەیی تەواوی بۆ هەیە(هەندێ مافی بۆ هەیە و هەندێ ئەركی لەسـەر شـانە) لەگـەڵ ئەوەش بنەڕەت بریتییە لە ئەستۆ پاكی لە هەموو پابەندبوونە مەدەنی و سزاییەکان، تا پێچەوانەی ئەوە دەسەلمێت، بۆیە لەسەر قازی پێویستە مامەڵەی داوا لەسەرکراو بکات لەسەر بنچینەی ئەم بنەمایـە، وا

[1] سورة القصص/الاية ٥٩.

تەماشای بكات وەك ئەوەی لە هەموو تۆمەتێك بێگوناهە كە ئاراستەی كراوە تا پێچەوانەی ئەوە دەسەلمێت و تاوانباركردنی یەكلادەبێتەوە.

سەرچاوەی ئەم بنەمایە بریتییە لە قورئان و سوننەتی پێغەمبەر(ﷺ) و ڕێسا فیقهییە هەمووەكییەكان و ئەقڵی تەندروست.

**١. قورئان:**

قورئان لە زۆر شوێندا باسی ئەستۆپاكی مرۆڤی كردووە لە پابەندبوونە سزاییەكان و بەرپرسیار نەبوون تا دوای ئەنجامدانی تاوانیش گەر دەقی تاوانكاری و سزای پێنەگەیشتبێت، چونكە قورئان یەكەم شەریعەتە بنەمای شەرعییەتی ڕاگەیاندووە، واتە (تاوان و سزا تەنها بە دەقە) لەو ئایەتانەی ئاماژە بەم بنەمایە دەكەن: ﴿وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّى نَبْعَثَ رَسُولاً﴾ هەروەها: ﴿وَمَا كَانَ رَبُّكَ مُهْلِكَ الْقُرَى حَتَّى يَبْعَثَ فِي أُمِّهَا رَسُولاً يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِنَا﴾.

**٢. سوننەتی پێغەمبەر(ﷺ):**

هەر كەس بگەڕێتەوە بۆ سەرچاوە باوەڕپێكراوەكان لە فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) زۆرێك لە گوفتار و كرداری پێغەمبەر(ﷺ) دەبینێتەوە كە بەئاشكرا ئاماژە بە ئەستۆپاكی مرۆڤ دەكەن، لەوانە: (بە شك پاڵ بە سزاكانەوە بنێن)[1]، هەروەها: (گەر ڕەجمی كەسێك بكەم بەبێ بەڵگە ئەوا تەنها فلان ئافرەتم ڕەجم دەكرد، شكی لێوە پەیدابووە لە قسە و شێوە و ئەوانەی سەریانی دەكەن)[2]، هەروەها: (بەڵگە لەسەر ئەو كەسەیە داوایەك(بانگەشەیەك) دەكات و سوێندخواردنیش لەسەر ئەو كەسەی نەرێی دەكات) ، هەروەها: (گەر بە داواكانیان بە خەڵكی بدرێت، ئەوا خەڵكی داوای خوێن و ماڵی پیاوانێك دەكەن، بەڵام سوێن لەسەر داوا لەسەركراوە)[3]

**٣. ڕێسا فیقهییە گشتییەكان:**

أ.بنەڕەت هێڵانەوەی ئەوەی هەیە لەسەر ئەوەی هەیە[4].

ب.كۆن لەسەر كۆنی خۆی واز لێدەهێنرێت[1].

---

[1] وفي رواية: (إدفعوا الحدود ما وجدتم لها مدفعا) رواه إبن ماجه / نيل الأوطار: ٧ /١١٧

[2] رواه إبن ماجه –نيل الأوطار: ١١٧/٧

[3] صحيح مسلم: ٣/ ١٣٣٦.

[4] مجلة الأحكام العدلية م/٥

ج.بنەڕەت لە سیفەتە لابەلاکاندا نەبوونە[2].

د.ئەوەی لە کاتێکدا سەلماوە بڕیار لە مانەوەی دەدرێت گەر بەڵگەیەك پێچەوانەی ئەوە بوونی نەبێت[3].

## ٤. ئەقڵی تەندروست:

ئەقڵی تەندروست بڕیار لەسەر ئەوە دەدات کە هەموو رووداوێك نەبوون پێشی کەوتووە، چونکە رووداو واتە بوون لەدوای نەبوون، ئەوەی ئاشکرایە ئەو تۆمەتانەی ئاراستەی مرۆڤ دەکرێن و ئەو داوایانەی دوای پابەندبوونی مەدەنی و سزایی و هۆیەکانی و سەرچاوەکانی لێ دەکەن هەر هەموو ئەمانە داهێنراون، هاتوونەتە بوون دوای ئەوەی کە بوونیان نەبووە، بۆیە ئەستۆی مرۆڤ پاکە تا پێچەوانەی ئەوە دەسەلمێت، هەر کەسێکیش پێچەوانەی ئەم بنەمایە بێت دەبێت بەڵگە بخاتە روو و ئەو کەسەش نەرێی ئەوە بکات سوێندخواردنی لەسەرە، چونکە لەگەڵ بنەڕەتدایە.

لەوەی باسمان کرد دەگەینە ئەو دەرئەنجامەی ئەو بنەمایەی پێویستە قازی رەچاوی بکات بریتییە لە: بنەڕەت ئەستۆپاکییە لە هەموو تۆمەتێکی مەدەنی و سزایی کە دەدرێتە پاڵ مرۆڤ.

بەم برە لە بنەما گشتییە زۆرەکان رازی دەبین کە لە دەقە شەرعییەکان و پیادەکردنە قەزاییەکانی فەقیهە موسڵمانەکان لە سەرەتای ئیسلامەوە بەدەستهێنراون و دەبنە تەواوترین دەستەبەرکردن بۆ دابینکردنی دادپەروەری لە قەزادا و لەوێشەوە هەموو خاوەن مافێك مافی خۆی وەربگرێتەوە.

---

(1) مجلة الأحكام العدلية م/٦

(2) مجلة الأحكام العدلية م/٩

(3) مجلة الأحكام العدلية م/ ١٠

# باسی دووەم:
# ئادابی قەزا لە نامەکەی عومەری کوڕی خەتابدا

ئەم نامەیە کە عومەری کوڕی خەتاب-خوا لێی ڕازی بێت- بۆ "أبي موسى الأشعري"-خوا لێی ڕازی بێت- ڕەوانە کردووە، بە گوزارەی لەیەکتر جیاواز و پێشکەوتن و پاشکەوتنی هەندێ ڕستە لە هەندێکی تری لە سەرچاوەکانەوە کە تەماشام کردوون[1] هاتووە، لەسەر کتێبەکەی "ابن القیم" شانم داداوە بەهۆی دواکەوتنی لەڕووی کاتەوە و ئاگاداری ئەو(ابن القیم) بە سەرچاوەکانی پێشوو، ئەمەش دەقی نامەکەیە:

(پاشان: قەزا فەرزێکی جێگیرە و نەگۆڕە و سوننەتێکی شوێنپێ هەلگیراوە، گەر ڕووی تێکردی تێبگە، قسەکردن بە حەق سوودێکی نییە گەر جێبەجێ کردنی بۆ نەکرێت، لەگەڵ ئەهلی مەجلیس و ڕووپێدان و قەزاوەتت یەکسان مامەڵە بکە (یان بیانکە بە نموونەی یەکتر) تا خاوەن دەسەلات تەماع نەکاتە ستەمی تۆ و لاوازیش لە دادپەروەریت بێهیوا نەبێت، بەڵگە لەسەر ئەو کەسەیە دلوایەکی هەیە و سوێندیش لەسەر ئەو کەسەی نەرێی دەکات، سوڵح دروستە لەنێوان موسڵمانانددا، مەگەر سوڵحێك حەرامێك حەلاڵ بکات یان حەلاڵێك حەرام بکات، هەر کەس بانگەشەی مافێکی نائامادە یان بەڵگەیەکی نائامادەی کرد کاتێکی بۆ دیاری بکە تیایدا کۆتایی پێ بهێنێت، گەر بە بەڵگە سەلماندی مافی خۆی پێ بدە، گەر دەستەوسان بوو لە هێنانی بەڵگە پرسەکە بەڕوویدا بشکێنەوە، ئەوە باشترین پاساوە بۆ شتی ناڕوون، ئەو قەزاوەتەی ئەمڕۆ کردووتە و پاشان لێی پاشگەز بوویتەوە و بڕیاری دروستت دۆزیەوە ڕێگریت لێ نەکات پێداچوونەوەی ئەو حەقە بکەیت، حەق کۆنە و هیچ

---

[1] منها بدائع الصنائع في ترتيب الشرائع للكاساني (العلامة الفقيه علاءالدين ابي بكر مسعود الكاساني الحنفي ت ٥٨٧ هـ) مطبعة الأمام القاهرة٩/٤٠٩٣ ومنها اعلام الموقعين عن رب العالمين لأبن قيم الجوزية (شمس الدين ابي عبدالله محمد بن ابي بكر ت ٧٥١ هـ) مكتبة الكليات الأزهرية ١ /٨٥ -٨٦

شتێك پووچی ناکاتەوە، گەڕانەوە بۆ حەق باشترە لە پێڕاکێشان لە باتڵدا، موسڵمانان هەندێکیان لەسەر هەندێکیان خاوەن دادن، مەگەر کەسێك شایەتی درۆی لێ ئەزموون کرابێت یان جەڵدکرابێت بە تاوانێك یان جێگەی گومان بێت لە پێدانی مەیل و خۆشەویستی و خزمایەتی، خودا نهێنی بەندەکانی گرتۆتە دەست و گوناهەکانی بۆ پۆشیون مەگەر بە بەڵگەی رۆشن و سوێندخواردن، پاشان تێگەیشتن، تێگەیشتن بۆ ئەو شتەی رووت لێ دەکات لەوەی لە قورئان و سوننەتدا نییە، ئەوجا کارەکان بەوە پێوانە بکە، نموونەکان بزانە و پاشان کامەیان لەلای خودا خۆشەویستترە و لە حەقەوە نزیکترە پارسەنگی بکە، ئاگادارت دەکەمەوە لە تووڕەبوون و نیگەرانی و دڵەڕاوکێ و وەڕسی و ئازارخواردن بە خەڵکی و خۆگۆڕین و دانپیادانەنانی خەڵکی لەکاتی نەیاری و رکەبەری یەکدیدا چونکە قەزا لە شوێنی حەقی خۆیدا و لەو شتانەی خودا پێویستی کردووە پاداشتی لەسەرە و ناوی باشی پێ بەدەست دێت، هەر کەس لە حەقدا نیێتی پاڵفتە بکات با لەسەر نەفسی خودی خۆشی بێت خودا ئەوەی لە نێوان ئەو و خەڵکیدایە دەگرێتە ئەستۆی خۆی، هەر کەس خۆی برازێنێتەوە بە شتێك کە لە ناخیدا بوونی نییە خودا ناشیرینی دەکات، خودا تەنها کار و کردەوەی پاڵفتە لە خەڵکی قبووڵ دەکات، دەبێ گومانت چی بێت بە پاداشتێك لەلای خودا لە رۆزییەکی خێرا و گەنجینەی رەحمەتی، والسلام علیك ورحمه الله)

گرنگترین ئاداب کە لەم نامەیەوە هەڵدەگوزرێت، ئەمانەن:

دوای ئەوەی گەورەمان عومەری کوڕی خەتاب گرنگی قەزای رۆشن کردەوە و بەیەکێك لە پێویستییەکانی ژیان و فەرزێك لە فەرزەکانی دانا کە سڕانەوە و هەڵوەشانەوە لە هەموو کات و شوێنێکدا قبووڵ ناکات، سوننەتێکە لە سوننەتەکانی ژیان و پێغەمبەر(ﷺ) لە کردار و گوفتار و قەزاوەتیدا جەختی لەسەر کردۆتەوە و ئاماژەی بە هەندێ لە ئادابی قازییان کردووە کە پێویستە لە قەزاوەتیاندا پێیانەوە پابەند بن تاکو حوکمێکی دادپەروەرانە دەربکەن.

لە گرنگترین ئەو ئادابانە:

١. لەسەر قازی پێویستە ناوەرۆکی زانیارییەکان کە دەخرێنە بەردەمی بە باشی تێبگات و سەروبنیان بنێت و لێیان ورد ببێتەوە لەوەی پەیوەستە بە بابەتی داواوە، لە

بیستراو و خوێنراو و بینراو تاکو لەوانەوە هێزی جیاکاری نێوان حەق و باتڵ بەدەست بهێنێت.

٢. پێویستە بڕیاری قازی رازابێتەوە بە هێز و پێزی ناچارکەر و پابەندکەر، لایەنەکانی رکەبەر پابەند بکات بەوەی بڕیاری لەسەر داوە و ملکەچیان بکات بۆی و قازی سووربێت لەسەر جێبەجێ کردنی، چونکە سوود و قازانج لە راگەیاندنی حوکمێکدا نییە جێبەجێ کردنی بۆ نەبێت، بەم جیاکارییە حوکمی قەزایی لە ئیجتیهادی کەسی موجتەهید و فتوای کەسی فتوادەر جیادەبێتەوە، لەم دەرچەیەوە زانایانی ئوسولی فیقه دەڵێن: حوکمی قازی لە بابەتی ناکۆکییەکاندا نەیاری کۆتایی پێ دەهێنێت و پێویستە بەو بۆچوونە کاربکرێت کە لەبەر رۆشناییەکەیدا حوکمی قازی ئەنجام دەدرێت.

٣. پێویستە لەسەر قازی یەکسانی دابین بکات لە نێوان هەموو لایەنەکانی ناکۆك و نەیاردا و نە بە رووالەت و نە بە ناوەوە لە بڕیارەکەی و مامەڵە کردنیدا لایەنگری هیچ لایەك نەکات لەسەر لاکەی تر لە بەرزکردنەوەی دلاوە هەتا راگەیاندنی حوکمەکە، چونکە لایەنگری بۆ یەکێك لە لاکان خیانەتە لە ئەمانەتی ئەمری خودا کە جێبەجێ کردنی پێویستە و پابەندکردنی تێدایە، خودا-سبحانه وتعالى- دەفەرموێت: ﴿إِنَّ اللّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تُؤدُّواْ الأَمَانَاتِ إِلَى أَهْلِهَا﴾.[1]

٤. لەسەر قازی پێویستە دلوا لە دلواکەر بکات بە بەڵگەی قبوولکراوی شەرعی و یاسایی ئەوەی بانگەشەی بۆ دەکات بیسەلمێنێت، چونکە بانگەشە بۆ شتێك دەکات پێچەوانەی بنەڕەتە، بنەڕەت ئەستۆپاکییە لە هەموو پابەندبوونێکی سزایی و مەدەنی، چونکە کەسەکە لەدایك دەبێت و ئەستۆی لە هەموو ئەو پابەندبوونانە پاکە، بۆیە لەسەر قازی پێویستە وا دابنێت کەسی دلوا لەسەرکراو هێشتا بێگوناهە تا پێچەوانەی ئەوە دەسەلمێت، لەم دەرچەیەوە رێسای (تۆمەتبار بێگوناهە تا تاوانبارکردنی دەسەلمێت) هاتووە، هەروەها رێسای(شك لە بەرژەوەندی تۆمەتبار لێکدەدرێتەوە)

[1] سورة النساء/٥٨

تایبەت بە دلوا لەسەرکرلو تەنها سوێندخواردن بەسە بۆی گەر کەسی دلواکەر نەیتوانی بە بەڵگە دلواکەی بسەلمێنێت، چونکە لەگەڵ بنەڕەتدایە(ئەستۆپاکی)، بەڵگە شایەتیدانیش دەگرێتە خۆ و هەر ڕێگەیەکی تریش بتوانێت ماف بۆ دلواکەر بسەلمێنێت، بەتایبەت ڕێگەی زانستی نوێ کە تاوانی پێ دەدۆزرێتەوە لە ڕێگەی ئاسەوارەوە وەك پێشتر لە بەڵگەی ئاسەواردا باسمان کرد.

ژمارەی شایەتەکانی زیناکردن دەبێت چوار شایەت بن لە پیاوانی جێ متمانە و راستڕەو(دادپەروەر)، نهێنی لەوەدا داپۆشینی نامووسی خەڵك و پارێزگاری لە ناوبانگیانە لە تاوانە ئەخلاقییەکاندا تا لە توانادایە، تاوانەکانی تر وەك دزی و کوشتن و هاوشێوەکانی، تەنها شایەتی دوو پیاو یان پیاوێك و دوو ئافرەتی بەسە، ئەم یەکسان بوونەی یەك پیاو بە دوو ئافرەت بۆ ناتەواوی ئافرەت ناگەڕێتەوە، بەڵکو لەبەر ئەوەیە زیاتر لە پیاو ڕووبەڕووی لەبیرچوونەوە دەبنەوە بەهۆی سەرقاڵییانەوە لە ماڵدا و ئەرکە خانەوادەیی و پەروەردەییەکان و لە دەرەوەش ئەرکە کۆمەڵایەتییەکان، خودا-سبحانە وتعالی- دەفەرموێت: ﴿فَإِن لَّمْ يَكُونَا رَجُلَيْنِ فَرَجُلٌ وَامْرَأَتَانِ مِمَّن تَرْضَوْنَ مِنَ الشُّهَدَاء أَن تَضِلَّ إْحْدَاهُمَا فَتُذَكِّرَ إِحْدَاهُمَا الأُخْرَى﴾[1]

شایانی باسە هەندێ شایەتی هەیە تەنها بە شایەتی ئافرەتێك ساغ دەبێتەوە، لە کاتێکدا بە پیاوێك ساغ نابێتەوە، وەك پرسەکانی ئافرەتان.

لە پرسە داراییەکاندا تەنها شایەتێك و سوێندی دلواکەر بەسە بۆ سەلماندنی.

٥. لەسەر قازی پێویستە سوڵح بۆ دوو رکەبەرەکە بخاتە ڕوو، ئەوەش بریتییە لە رازیبوون لەسەر برێك کە هەردوو لا لەسەری ڕێدەکەون لە دوای دابەزینی هەر لایەك لە بەشێك لەوەی دلوای دەکات بەسەر ئەویتردا، خودا دەفەرموێت: ﴿وَالصُّلْحُ خَيْرٌ﴾، بەڵام دەبێ ئەو شتەی سوڵحی لەسەر دەکرێت مافێکی تایبەت بێت یان مافێکی هاوبەش بێت و مافی تایبەت تیایدا زاڵ بێت وەك مافی تۆڵەکردنەوە.

بەڵام گەر شتە سوڵح لەسەرکراوەکە مافێکی گشتی بوو یان مافێکی هاوبەش بوو لە نێوان تایبەت و گشتیدا و گشتییەکە تیایدا زاڵ بوو وەك سزاکان ئەوا سوڵح تیایدا

---

[1] سورة البقرة/٢٨٢.

دروست نییە وەك چۆن دروست نییە قازی حەرامێك حەلاڵ بكات یان حەلاڵێك حەرام بكات.

٦. دەسەڵاتی قازی لە دواخستنی بڕیاردا: هەر كەس بانگەشەی مافێكی نادیاری كرد یان بانگەشەی بەڵگەیەكی كرد كە لەبەردەستدا نەبوو كاتی وردبوونەوە لە دواكە و دوای لە قازی كرد وردبوونەوە لە دواكە دوابخات تا كاتی ئامادەكردنی پێویستییەكانی حوكمەكە، پێویستە قازی وەڵامی ئەو دوایە بداتەوە، چونكە گەر پەلەی لێ بكات لە حوكمەكەدا مافەكەی بەتاڵ دەكاتەوە، ئەمەش پێچەوانەی دادپەروەرییە.

دیاریكردنی ماوەی دواخستنەكە دەكەوێتە ژێر دەسەڵاتی قازییەوە و بەپێی سروشتی بابەتەكە.

٧. لەسەر قازی پێویستە لە ئیجتیهادەكەی پێشووی بگەڕێتەوە گەر بۆی دەركەوت دادپەروەری لە ئیجتیهادێكی نوێ و بڕیارێكی نوێدایە، ئەمەش ئەوەیە عومەری كوڕی خەتاب –خوا لێی ڕازی بێت– بەسەر خۆیدا جێبەجێی كرد لە بابەتێكی میراتدا، كاتێك ئافرەتێك مرد و میراتەكەی بۆ مێرد و دایك و برا لە دایكەوە و برا و خوشك لە باوك و دایكەوە بەجێهێڵا.

نیوەی میراتەكەی دا بە هاوسەرەكەی بەهۆی نەبوونی لقی میراتبەرەوە، دایكیشی شەش یەك بەهۆی فرەیی برا و خوشكەكانەوە، برا لە دایكەوە سێ یەكی بۆ دانرا چونكە زیاتر لە یەك دانەن، خودا –سبحانە وتعالی–: ﴿وَإِن كَانَ رَجُلٌ يُورَثُ كَلَالَةً[1] أَو امْرَأَةٌ وَلَهُ أَخٌ أَوْ أُخْتٌ[2] فَلِكُلِّ وَاحِدٍ مِّنْهُمَا السُّدُسُ فَإِن كَانُوا أَكْثَرَ مِن ذَلِكَ فَهُمْ شُرَكَاءُ فِي الثُّلُثِ﴾[3]

---

[1] واتە ئەو كەسەی كە میرات دەگرێت نە لە ڕووی باوكایەتییەوە نە لە ڕووی كوڕیەتییەوە.

[2] واتە لە دایكەوە چونكە برا و خوشكەكان لە باوكن یان لە باوكێكن میراتەكەیان لە ئایەتەكەی پێشتردا ڕۆشن بووەتەوە.

[3] سورة النساء/١٢

خاوەن میراتی فەرز هەموو میراتەکەیان برد و خوشك و برایان لە دایك و باوکەوە بێبەش کرد، چونکە باوانی(العصبە)ن[1]، "باوانی"ش -بۆ خۆی بێت یان بۆ کەسانی تر- دوای دەرکردنی بەشی فەرزەکان ئەوەی ماوەتەوە لە میرات دەیبات، ئەم بابەتە لە ساڵی دواتردا دووبارە بوویەوە لە خەلافەتی عومەری کوڕی خەتابدا، ویستی بە بڕیارەکەی پێشوو بڕیار بداتەوە، یەکێك لە کەسەکانی باوانی وتی: وادابنێ باوکمان حجر دەکات، ئەی ئێمە لەگەڵ براکانمان لە دایکەوە بەشدار نین[2]، یەکێکی تریان وتی من ئەو باوکە دەخەمە ناو دەریاوە گەر هۆیەك بێت بۆ مەحروم کردنم لە میرات[3]، عومەری کوڕی خەتاب وای بینی بەشداری پێ کردنیان لەگەڵ برا و خوشکەکانی تر لە دایکەوە لە بەشەکەیاندا و سێ یەك، بۆیە بڕیاری بەشداری پێکردنی بۆ دان، بۆیە ئەو پرسە قەزاییە ناونرا بە "بەشداری پێکردن".

٨. لێوەشاوەیی شایەتیدان: لەسەر قازی پێویستە رەفزی قبووڵی شایەتی هەر کەسێك بکات کە ئەهلی ئەو شایەتیدانە نییە، وەك ئەوەی ناسراو بێت بە شایەتی درۆ، یان سزا درابێت لەسەر تاوانێك پێشتر ئەنجامیدابێت یا جێی گومان بێت واتە تۆمەتبار بێت بە لایەنگیری، کاتێك کەسەکە کوڕی بێت یان باوکی بێت یان برای بێت یان ژن و پیاوی یەکتر بن، و هاوشێوەکانی ئەمانە کە تۆمەتبار بکرێت بە لایەنگیری لە شایەتیدانەکەیدا.

شایانی باسە نموونەی ئەو جۆرە شایەتییە کە جێگەی تۆمەتی لایەنگیرییە لای پێشینی چاکان قبووڵکراو بووە، کاتێك دەروونەکان گۆڕان و ئەنگێزەی مادی زاڵ

---

[1] باوانی "العصبة" بریتییە لە هەر نێرێك کە دراوەتە پاڵ میراتگر راستەوخۆ، وەك کوڕ یان لە رێگەی نێرێکی ترەوە وەك کوڕی کوڕ ئەم جۆرە پێی دەوترێت باوانی "العصبة" بەڵام باوانی بۆ کەسانی تر وەك کچ گەر کۆببێتەوە لەگەڵ کوڕ، هەروەها وەك برای دایك و باوکی گەر لەگەڵ خوشکی دایك و باوکی کۆببێتەوە، هەروەها برا لە باوکەوە.

[2] بۆیە ئەم بابەتە ناونرا بێبەشکردن(الحجرية)

[3] بۆیە ئەم بابەتە ناونرا "اليمية" واتە دەریایی، چونکە "اليم" بریتییە لە دەریا.

بوو بەسەر ئەنگێزەی ڕۆحیدا فەقیهەکان فتوایان دا کە لەسەر قازی پێویستە هەر شایەتییەك خەڵتەی تۆمەتی لایەنگری تێدا بێت ڕەد بکاتەوە[1].

٩. لەسەر قازی پێویستە پەنا ببات بۆ ئیجتیهاد لەباری نەبوونی دەقدا یان دەقەکە نادادپەروەر بوو بۆ بابەتەکە لە پرسە مەدەنییەکاندا، بەڵام لە پرسە سزاییەکاندا پێویستە پابەند بێت بە بنەمای شەرعەوە(تاوان و سزا تەنها بە دەقە)

١٠. لەسەر قازی پێویستە پێوانە(قیاس) بەکاربهێنێت لە پرسە سزاییەکان لەباری نەبوونی دەق یان نادادپەروەری دەقەکەدا بۆ ئەو پرسە.

زانایانی موسڵمان و ئوسولییەکان و فەقیهەکان جیاوازی لە نێوانیاندا هەیە لە بوون بە بەڵگەی پێوانە لە نێوان قبووڵکردن و ڕەدکردنەوە، پانتاییەکی بەرین هەیە لە کتێبی ئوسوڵ فیقهـ تایبەتکراوە بۆ خستنەڕووی ئەو جیاوازییە، لەوانە کتێبی "إعلام الموقعين"ی ئیبن قەیمی جەوزی[2]، کە تایبەتکراوە بۆ خستنەڕووی جیاوازی لەسەر بە بەڵگە کردنی پێوانە(لاپەڕە ١٣٠-٢٣٧) واتە (٢٠٧) لاپەڕە، لەگەڵ ڕێزم بۆ گەورەیی ئیبن قەیم ئەو کارە تەمەن و کات بەفیڕۆدانە، چونکە باس لە پێوانە پێویستی بە لاپەڕەیەکە چونکە جیاوازی لە بەبەڵگە کردنی پێوانە جیاوازی سەرزارەکی و نەرۆکە، هیچ بەرێکی بەسوودی لێوە پەیدا نابێت، هەر کەس بە بەڵگە کردنی پێوانە ڕەد دەکاتەوە مەبەستی پێی ئەو پێوانەیە کە حوکم دروست دەکات، ئەو کەسەی بەرگری دەکات لە بە بەڵگەبوونی پێوانە پێویستە مەبەستی ئەوە بێت بەو پێوانەیە پەردە لابدات لەسەر حوکمەکان، چونکە هۆکارێکی گرنگە بۆ ئەو پەردە لەسەرلادانە، لە ڕێگەی گێڕانەوەی بەشەکی بۆ هەمووەکی مانا ژنەوراو[3]، وەك گێڕانەوەی هەموو پارەیەکی کاغەز یان کانزایی ئاڵوگۆڕکراو لە جیهاندا بۆ لای زێڕ و زیو لەم ئایەتەدا: ﴿وَالَّذِينَ يَكْنِزُونَ الذَّهَبَ وَالْفِضَّةَ وَلاَ يُنفِقُونَهَا فِي سَبِيلِ اللّهِ فَبَشِّرْهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٍ﴾[4]، بۆیە پێویستە لە پارەی ئاڵوگۆڕدا لە هەموو کات و

---

[1] أعلام الموقعين /المرجع السابق/١١٣/١.

[2] الجزء الاول.

[3] واتە هەمووەکییەکان کە هۆی حوکمەکانی دەزانرێت.

[4] سورة التوبة /الآية ٣٤.

شوێنێك حوكم بە پێویستبوونی بكات وەك هەموو ئەوەی لە زێڕ و زیودا پێویست دەبێت، نموونەی زەكاتدان، هەر بەو جۆرە هەر شتێك لە زێڕ و زیودا حەرام دەكرێت لە پارەشدا حەرام بكرێت، وەك بە سوودان، رەد كردنەوەی بە بەڵگە كردنی پێوانە وەك هۆكارێك بۆ پەردە لادان لەسەر حوكمەكان لە جۆری گفتوگۆی بێبنەما و رەدكردنەوەی بەڵگەنەویستەكانە[1].

١١. لەسەر قازی پێویستە لە كاتی دادگا و دادبینیدا وەڕس و بێزار و نیگەران نەبێت، تاكو ئەوە كار نەكاتە سەر دادپەروەری بڕیارەكەی، چونكە قازی لەو بارانەدا پاساو و بیانوو وەرناگرێت و لە بیركردنەوە و ئەنجامگیریی لەوەی خراوەتە بەردەمی قووڵ نابێتەوە.

لەسەر قازی پێویستە لە كاتی دادگادا مێشكی گرژ و تووڕە نەبێت، بەهۆی فەرموودەكەی پێغەمبەرەوە(ﷺ): (نابێ كەسێك دادوەری بكات لە نێوان دوو كەسدا و تووڕەبێت)[2]، هەروەها لەبەر ئەوەی تووڕەبوون هەلی تێڕامانی بۆ بە دەستهێنانی نەزانراوی پێویست(بڕیارێكی دادپەروەرانە) لەدەست دەدات لەو زانیارییە بەدەستهاتووانەی لەلایەتی و پەیوەستە بە بابەتی داواكەوە و لێی ورد دەبێتەوە.

---

[1] بەڵگە لەسەر ئەوەی پێوانە بەڵگەیەكی دەرخەرە ئەوەیە كە حوكمی پێوانەكراو هەمان حوكمی پێوانە لەسەركراوە بە دەق.

[2] صحيح مسلم/١٣٤٢/٣/رقم الحديث ١٧١٧.

# بەشی دەیەم

.

## داینکارییەکانی تۆمەتبار و پارێزبەندی

ئەم لێکۆڵینەوەیە دابەش دەبێت بۆ دوو باس

یەکەمیان بۆ دەستەبەرییەکانی تۆمەتبار.

دووەم بۆ پارێزبەندی.

# باسی یەکەم:
# دابینکارییەکانی تۆمەتبار

شەریعەتی ئیسلام بە کۆمەڵێك دابینکاری دەورەی تۆمەتباری داوە گەر رەچاویکرێن ئەوا هیچ کەس لە جیهانی قەزادە رووبەڕووی شتێك نابێتەوە پێچەوانەی قەزا بێت، لەو دابینکاریانە[1]:

**یەکەم: بنەمای شەرعییەت:** (تاوان و سزا تەنها بە دەقە)، واتە سزا دروست نییە مەگەر کارێك بێت یاسا بە تاوانی دابنێت لە کاتی ئەنجامدانیدا، و دروست نییە سزایەك بسەپێت توندتر بێت لەو سزا جێبەجێکەرە لە کاتی ئەنجامدانی کارێکی تاوانکاریدا، بۆیە هەر تاکێك پێویستە پێشوەخت بزانێت چی لەسەر قەدەغەکراوە لە کار و کردەوە و رەفتارەکان تاکو لای رۆشن بێت لە پشت ئەوانەوە بۆی موباحن لەسەر بنچینەی: (بنەڕەت لە شتی بەسوودا موباحکردنە) بۆیە قازی خاوەنی دەسەڵاتی داهێنانی تاوانی نییە بە هەمان شێوە مافی داهێنانی سزای نییە.

شایانی باسە یاسا ئەم بنەمایەی نەزانیوە لەدوای شۆڕشی فەرەنسی نەبێت بۆ مافی مرۆڤ دەرچوو لە ساڵی ١٧٨٩ز، دەقی مادەی حەوتەم لەو جاڕنامەیە لەسەر بنەمایەکی بنچینەیی دامەزراوە کە بریتییە لە: تۆمەتبار کردنی تاك یان راگرتنی یان بەندکردنی دروست نییە مەگەر لەو بارانەی کە یاسا قەدەغەی کردوون بەپێی ئەو بنەڕەتانەی کە دیاری دەکات[2]

پاشان جاڕنامەی مافی مرۆڤ لە ساڵی ١٩٤٨ز دانیپیانا لە مادەی (١١)یدا، هەروەها رێکەوتننامە نێودەوڵەتییەکان تایبەت بە مافی مەدەنی و سیاسی لە ساڵی ١٩٦٦ لە مادەی (١٥) کە لە دەستوورە

---

[1] بینا لەسەر داوای قازییەکی ئەمریکی کە داوای لێکرابوو لە گرفتەکانی قەزا لە عێراقدا بکۆڵێتەوە لە پەیمانگای قەزایی محازەرەیەکمان بە ئامادەیی قوتابیانی ساڵی یەکەم و دووەمی پەیمانگاکە پێشکەش کرد، هەروەها بە ئامادەبوونی کۆمەڵێك لە قازیان و مامۆستایان لە بەرواری ٢٠٠٣/٧/٨

[2] الحريات العامة وحقوق الانسان للدكتور محمد سعيد مجذوب: ص ٥١

دانراوەکاندا هاتووە، لەوانە دەستووری عێراقی کاتی (م/٢٠ و م/٢١)[1]

شەریعەتی ئیسلام بە سەدان ساڵ پێش ئەم یاسا و جاڕنامە و دەستوورانە کەوتووە، ڕاگەیاندنی ئەم بنەمایە لە ئایەتی: ﴿وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّى نَبْعَثَ رَسُولاً﴾[2]

**دووەم: بنەمای کەسایەتی تاوان:** واتە هیچ مرۆڤێك لە ڕووی سزاییەوە پرسیاری لێ ناکرێت و سزا نادرێت لەسەر کاری تایبەت بە خۆی نەبێت، بۆیە پرسیارکردن لە کەسێك لەسەر کاری کەسێکی تر لە خێزانەکەی و کەسانی تر دروست نییە، بۆ گرنگی ئەم بنەمایە قورئان لە پێنج سورەتدا پێداگری لەم بنەمایە کردۆتەوە لە "سورة الأنعام"[3]: ﴿وَلاَ تَكْسِبُ كُلُّ نَفْسٍ إِلاَّ عَلَيْهَا وَلاَ تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَى﴾ هەر کارێك کارێکی تاوانکاری بێت ئەو بەتەنها دەچێتە ژێر بەرپرسیارێتی و دەرئەنجامەکانی و هیچ نەفسێك شان نادات ژێر بەرپرسیارێتی تاوانکاری کەسێکی تر کەسەکە هەر کەسێك بێت و هەر جۆرە پەیوەندییەکی لەگەڵیدا هەبێت.

هەروەها لە "سورة الأسراء"[4]: ﴿مَنِ اهْتَدَى فَإِنَّمَا يَهْتَدِي لِنَفْسِهِ وَمَن ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيْهَا وَلاَ تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَى﴾، واتە هەر کەس لایدا بەلای تاکاری تاوانکاریدا ئەو بەتەنها دەرئەنجامەکەی دەگرێتە ئەستۆ، هەروەها لە "سورة فاطر"[5]: ﴿وَلاَ تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَى﴾، لە "سورە الزمر"[6]: ﴿وَلاَ تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَى﴾، لە کۆتاییشدا لە "سورە النجم"[7]: ﴿أَلاَّ تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَى﴾.

**سێیەم: بنەمای نەگەڕانەوەی یاسا:** هەر کەس کارێك ئەنجام بدات بەر لەوەی یاسا بە تاوانی دابنێت و بە قەدەغە سەرژمێری بکات لەڕووی مەدەنی و سزاییەوە پرسیاری لێ ناکرێت، بۆ گرنگی ئەم بنەمایە قورئان لە چوار ئایەتدا باسی لەبارەوە کردووە:

---

[1] مادەی (٢٠) لە دەستوور ٢٩ی نیسان ١٩٦٤ دەقەکەی (تاوان و سزا تەنها بینا لەسەر یاسا بوونیان هەیە، سزاش تەنها لەسەر کاروکردەوەی دوا‌تره بە دەرچوونی یاساکە کە بە دەق ئامـاژەی پێدەکات) دەستووری ئاماژەبۆکراو بە دەق هێناویەتی لە مادەی (٢١) کە (سزاکە تاکە کەسییە).

[2] سورة الإسراء–الآية ١٥.

[3] الآية: ١٦٤

[4] الآية ١٥

[5] الآية ١٨

[6] الآية ٧

[7] الآية ٣٨

لە "سورة النساء"[1]: ﴿وَلاَ تَنكِحُواْ مَا نَكَحَ آبَاؤُكُم مِّنَ النِّسَاء إِلاَّ مَا قَدْ سَلَفَ﴾ بەندوباوی کۆمەڵگەی عەرەبی وابوو کە کوڕ بۆی هەبوو ژنی باوکی(دایکی خۆی نە) مارە بکاتەوە لە دوای مردنی باوکەکە، بەو مانایەی ژنەکەی باوکی بەشێکە لە لێبەجێماو، قورئان ئەمەی حەرام کرد و بە تاوانی دانا، بەڵام فەرمووی لە رووی سزاییەوە پرسیار لە کەس ناکرێت کە پێش حەرام کردن ئەو کارەی ئەنجام دابێت، هەروەها لە "سورة النساء"[2]: ﴿وَأَن تَجْمَعُواْ بَيْنَ الأُخْتَيْنِ إَلاَّ مَا قَدْ سَلَفَ﴾، قورئان کۆکردنەوەی دوو خوشکی لەگەڵ یەکتر لە هاوسەرگیریدا بە حەرام داناوە، لە "سورة المائدة"[3]: ﴿عَفَا اللّهُ عَمَّا سَلَف وَمَنْ عَادَ فَيَنتَقِمُ اللّهُ مِنْهُ﴾، هەروەها لە "سورة الأنفال"[4]: ﴿قُل لِلَّذِينَ كَفَرُواْ إِن يَنتَهُواْ يُغَفَرْ لَهُم مَّا قَدْ سَلَفَ﴾.

**چوارەم: بنەمای بنەڕەت ئەستۆپاکییە:** هەموو مرۆڤێك کە لەدایك دەبێت ئەستۆی پاکە لە هەموو پابەندبوونێکی مەدەنی و سزایی، گەر لە کاتی پێگەیشتن و ساڵی باڵغبووندا تۆمەتێکی سزایی یان مەدەنی درایە پاڵ ئەوا لەسەر قازی پێویستە کەسەکە بە بێتاوان تەماشا بکات هەتا تاوانبارکردنی دەسەلمێت، زانایانی ئوسوڵ فیقە لە سەرەتای ئیسلامەوە ئەم رێسا ئوسوڵییەیان راگەیاندووە و یاسای ئەم رێسایەی لێ وەرگیراوە: (تۆمەتبار بێگوناهە تا تاوانبارکردنی دەسەلمێت)[5]

زانایانی موسڵمان ئەم رێسایەیان لە دەقەکانی قورئانەوە وەرگرتووە، لەو دەقانە: لە "سوره الحجرات"[6]: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اجْتَنِبُوا كَثِيراً مِّنَ الظَّنِّ إِنَّ بَعْضَ الظَّنِّ إِثْمٌ﴾، هەروەها لە "سوره النجم"[7]: ﴿وَإِنَّ الظَّنَّ لَا يُغْنِي مِنَ الْحَقِّ شَيْئاً﴾.

پێنجەم: بنەمای دانانی نەزانی(ئاگادارنەبوون) بە یاسا بیانوویەکی رێگرە لە بەرپرسیارێتی سزایی: ئەمەش ئەوەیە کە قورئان رایگەیاندووە، لە سورەتی "قصص"دا[8] ﴿وَمَا كَانَ رَبُّكَ مُهْلِكَ الْقُرَى حَتَّى يَبْعَثَ فِي أُمِّهَا رَسُولاً يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِنَا﴾، ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە مرۆڤ بەرپرسیار نییە لە هەر کارێکی تاوانکاری ئەنجامی دەدات گەر ئاگادار نەکرابێتەوە لەلایەن پێغەمبەرێکەوە، بە بەڵگەی ئەو

---

[1] الآية ٢٢
[2] الآية ٢٣
[3] الآية ٩٥
[4] الآية ٣٨
[5] مادەی (٢٣) لە دەستووری ئامادەبۆکراو دەڵێت: (تۆمەتبار بێگوناهە تا تاوانبارکردنی دەسەلمێت)
[6] الآية ١٢
[7] الاية ٢٨
[8] الاية ٥٩

بەشەی ئایەتەکە: ﴿يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِنَا﴾، لە کاتێکدا یاسا ئەم نەزانینە بە پاساو و بیانوو دانانێت لەدوای بڵاوکردنەوەی لە هۆکارەکانی راگەیاندنی رەسمیدا مەگەر ئەوەی بە یاسا هەڵاوەردە دەکرێت.

**شەشەم: بنەمای وەرنەگرتنی هەواڵی هەواڵدەر هەتا دوای دڵنیابوونەوە لە دروستی هەواڵەکە:** دروست نییە هیچ رێوشوێنێکی قەزایی دژی تۆمەتبار بگیرێتە بەر بینا لەسەر هەواڵی هەواڵدەر مەگەر دوای دڵنیابوونەوەی قازی لێکۆڵەر لە دروستی هەواڵەکە، ئەوەش بۆ ئەوەی خۆی بەدوور بگرێت لە ئازاردانی بێگوناهێك و پەشیمانی کە ناتوانێت لەدوای لەدەستچوونی کات پیابگات و باریووی بکاتەوە، قورئان لە سورەتی "الحجرات"دا دەفەرموێت: [1]﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِن جَاءَكُمْ فَاسِقٌ بِنَبَإٍ فَتَبَيَّنُوا أَن تُصِيبُوا قَوْماً بِجَهَالَةٍ فَتُصْبِحُوا عَلَى مَا فَعَلْتُمْ نَادِمِينَ﴾

**حەوتەم: بنەمای سزادانی ئەو کەسەی بوختان بە کەسێك دەکات بە تۆمەتی ئەخلاقی(تاوانی زینا):** گەر ئەو تۆمەتە لەبەردەم قەزادا بە چوار شایەت نەسەلمێنرا، قورئان لە سورەتی "النور"[2] دەفەرموێت: ﴿وَالَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ[3] ثُمَّ لَمْ يَأْتُوا بِأَرْبَعَةِ شُهَدَاءَ فَاجْلِدُوهُمْ ثَمَانِينَ جَلْدَةً وَلَا تَقْبَلُوا لَهُمْ شَهَادَةً أَبَداً وَأُولَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ﴾، ئەم ئایەتە سێ جۆر سزای راگەیاندووە بۆ هەر کەسێك تۆمەتێکی ئەخلاقی دەبەخشێتەوە بەسەر کەسانی تردا و ناتوانێت بە بوونی چوار شایەت بەسەریدا بسەلمێنێت، سزای یەکەمیان جەستەییە کە بریتییە لە لێدانی هەشتا جەڵد، دووەم و سێیەم سزای نەفسین کە بریتین لە دارمانی کەسایەتی ئەو کەسە بەوەی شایەتی لەبەردەم قەزادا قبووڵ ناکرێت و بە مۆری "فسق-دەرچوو یان لادەر" مۆردەکرێت.

**هەشتەم: توندکردنەوەی سەلماندنی تاوانی زینا:** ئەم تاوانە تەنها بە چوار شایەتی پیاوی دادپەروەر دەسەلمێت، بە جۆرێك هیچ جیاوازییەك لە نێوان قسەکانیاندا نەبێت، قورئان ئەو راستییەی بەیان کردووە لە "سوره النور"[4]: ﴿لَوْلَا جَاءُوا عَلَيْهِ بِأَرْبَعَةِ شُهَدَاءَ فَإِذْ لَمْ يَأْتُوا بِالشُّهَدَاءِ فَأُولَئِكَ عِندَ اللَّهِ هُمُ الْكَاذِبُونَ﴾، بۆیە ئەم تاوانە لە مێژووی ئیسلامدا نەسەلماوە مەگەر تاوانبارەکە خۆی هاتبێت دانی بە تاوانەکەدا نابێت ئەوەش لە کاتی هاتنی پەیامی ئیسلامدا کە سزای ئەم تاوانە بەسەر ژمارەیەکی کەمدا پیادەکراوە کە لەبەردەم پێغەمبەردا دانی بە گوناهەکەیدا ناوە.

---

[1] الاية ٦

[2] الاية ٤

[3] ئافرەتی مێرداری خاوەن شەرەف

[4] الاية: ١٣

**نۆیەم: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی بە قازی کردووە تۆمەتباری تاوانی زینا هانبدات پەشیمان ببێتەوە لە دان پیانانەکەی،** چونکە تەنها بە دان پیادا نان دەسەلمێت: "أبو هريرە" دەفەرموێت: پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: ((پیاوێك لە موسڵمانان هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) کە لە مزگەوت بوو، وتی: ئەی پێغەمبەری خودا من زینام کردووە، پێغەمبەر پشتی لێ هەلکرد و رووی لێ وەرچەرخان، وتی: ئەی پێغەمبەری خودا من زینام کردووە، ئەم جارەش دیسان پشتی لێکرد، تا چوار جار دووبارە بوویەوە، کە چوار شایەتی لەسەر خۆیدا پێغەمبەر(ﷺ) بانگی کرد و پێی فەرموو: تۆ شێتی، وتی نەخێر، فەرمووی: ژنت هێناوە؟ وتی: بەڵێ، فەرمووی ببەن رەجمی بکەن))[1]

شایانی باسە سزای رەجم لە قورئاندا بوونی نییە، بەڵکو بە کاری پێغەمبەر(ﷺ) جێگیر بووە، هەندێك پێیان وایە بە ئایەتی جەڵد لێدان سڕاوەتەوە، ئایەتەکە: ﴿الزَّانِيَةُ وَالزَّانِي فَاجْلِدُوا كُلَّ وَاحِدٍ مِّنْهُمَا مِئَةَ جَلْدَةٍ﴾[2]، بە بۆچونی ئێمە ئەم رایە پێکاویەتی و دروستە، چونکە لە جیاکەرەوەکانی تاوانی سنووربەزێنی بریتییە لە کاریگەرنەبوون بە رەوشی توندکراوە، سەرباری ئەوەی لە رووی کردارییەوە ئەو تاوانە لەبوونخراوە.

**دەیەم: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی کردووە بە قازی رێگەی ئاشتەوایی بۆ دوو لایەنە رکەبەرەکە بخاتە روو** لەو شتانەدا ئاشتەوایی تیایاندا دروستە.

**یازدەهەم: ئازادی گفتوگۆکردن و تاوتوێ کردن لەگەڵ قازی بۆ دوو رکەبەرەکە لە پرسە سزایی و مەدەنییەکاندا:** ئەوەش کاتێك رکەبەرەکە قەناعەتی بە دادپەروەی بڕیارەکەی قازی نەبێت، ئەم ئازادییە قورئان رایگەیاندووە کاتێك "خولە بنت حكيم" گفتوگۆی کرد لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) و پێدلگری کرد لە گفتوگۆکەیدا لەو بڕیارەی دەریکردبوو لەمەڕ زهاری (پشت تێکردن و لەخۆ قەدەغە کردن) هاوسەرەکەی لە خەولە، کاتێك وتی: ئەی پێغەمبەری خودا، هاوسەرەکەم(ئەوس) ماڵەکەی خواردم، ، گەنجێتی تیابردم، سکم بۆی هەڵچۆڕا تا تەمەنم کرد و لە منداڵ بوون وەستام زیهاری لێکردم، پێغەمبەر وەڵامیدایەوە: من وا دەبینم تۆ لەو حەرامکراوی، خەولەش جارێکی تر لەگەڵ پێغەمبەر لەسەر ئەو پرسە پێدلگری کردەوە و بەو ئەوپەڕی ئازادییەوە گفتوگۆی لەگەڵ دەکرد و دەیوت: ئەی پێغەمبەری خودا منداڵم لێی هەیە، گەر باوکیان بیانگرێتە خۆ تیادەچن، گەر من بیانگرمە خۆم برسیان دەبێت، پێغەمبەر

[1] صحيح مسلم: ١٣١٨/٣.
[2] سورة النور-الاية: ٢.

بۆی دووپارە کردەوە و فەرمووی: من وا دەبینم تۆ لەو حەرامکراوی، ئەوەش لەبەرئەوەی زیهار بەر لەوەی حوکمەکەی لە قورئاندا دابەزێت تەڵاق بوو، بۆیە خەولە وتی: سکاڵای خۆم دەبەمە لای خودا بۆ خۆم و منداڵەکانم، دیاربوو بە حوکمەکە قەناعەتی نەبوو، پاشان ئایەتە قورئانییەکە دابەزی بۆ بەرژەوەندی خەولە، قورئان حوکمەکەی دیاری کرد بەوەی ئەو کارە تەڵاق نییە، بەڵکو لەسەر زیهارکردن سزای پیاوەکە دەدرێت بە سزای بەدەنی و دارایی بەهۆی یارىکردن بە پەیوەندی هاوسەرێتییەوە، بۆیە قورئان حوکمەکەی بە یەکێك لەم سێ سزایە دیاری کرد، ئەوەش بەپێی زنجیرە وەك ئەوەی لە ئایەتەکەدا بەدوای یەکتردا هاتوون: بۆیە یەکەم لەسەر پیاوەکە پێویستە بەندەیەك بکڕێت و ئازادی بکات، گەر بەندەی نەبینییەوە دوو مانگ بەدوای یەکدا بەڕۆژوو بێت، گەر نەیتوانی خواردنی شەست کەدا بدات[۱].

**دوازدەهەم: شوبهە لە تاوانی سنووربەزێنیدا سەردەکێشێت بۆ کەوتنی یان وەرچەرخانی بۆ سزایەکی سووکتر لەو سزادانە:** بۆ نموونە، تاوانی دزی لە نێوان بنەڕەت و لقدا(لە رەچەڵەکدا) یان لە نێوان دوو هاوسەردا وەردەچەرخێت بۆ تاوانێکی رووشکێنی گەر تاوان دەرحەقکراو داوایەك پێشکەش بکات لەسەر سزادانی تاوانبار بە سزایەکی رووشکێنی بەبێ دەستبڕین، ئەمە ئەوەیە کە فەقیهەکانی شەریعەتی ئیسلام کۆدەنگیان هەیە لەسەری، برگەی سێیەم لە مادەی سێیەم لە بنەڕەتی دادگاییکردنە سزاییەکان کاریگەری شوبهەی وا لەبەرچاوگرتووە کە کورتهەڵهێنەرە لە وەرچەرخانی تاواندا لە دەستدرێژیکردنە سەر مافێکی گشتی بۆ دەستدرێژی کردنە سەر مافێکی تایبەت، بۆیە دروست نییە داوای سزایی بجوڵێنرێت مەگەر بینا لەسەر سکاڵای تاوان دەرحەقکراو یان ئەو کەسەی لەرووی یاساوە لە جێگەی ئەو راست دەبێتەوە.

**سیازدەهەم: لێبوردەیی سزایی تۆمەتبار:** لە شەریعەتی ئیسلامدا لەرووی سزاییەوە لە تۆمەتبار ناپرسرێت گەر ئەم پێنج مەرجەی تێدا نەبێت، کە ئەمانەن:

١.دەبێت گەیشتبێتە تەمەنی پێگەیین لە کاتی ئەنجامدانی تاوانەکەدا، گەر نەیدەتوانی جیاکاری

---

[۱] سورة المجادلة / نص الاية: ﴿قَدْ سَمِعَ اللَّهُ قَوْلَ الَّتِي تُجَادِلُكَ فِي زَوْجِهَا وَتَشْتَكِي إِلَى اللَّهِ وَاللَّهُ يَسْمَعُ تَحَاوُرَكُمَا إِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ بَصِيرٌ، الَّذِينَ يُظَاهِرُونَ مِنْكُمْ مِنْ نِسَائِهِمْ مَا هُنَّ أُمَّهَاتِهِمْ إِنْ أُمَّهَاتُهُمْ إِلَّا اللَّائِي وَلَدْنَهُمْ وَإِنَّهُمْ لَيَقُولُونَ مُنْكَرًا مِنَ الْقَوْلِ وَزُورًا وَإِنَّ اللَّهَ لَعَفُوٌّ غَفُورٌ، وَالَّذِينَ يُظَاهِرُونَ مِنْ نِسَائِهِمْ ثُمَّ يَعُودُونَ لِمَا قَالُوا فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مِنْ قَبْلِ أَنْ يَتَمَاسَّا ذَلِكُمْ تُوعَظُونَ بِهِ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ، فَمَنْ لَمْ يَجِدْ فَصِيَامُ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ مِنْ قَبْلِ أَنْ يَتَمَاسَّا فَمَنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَإِطْعَامُ سِتِّينَ مِسْكِينًا﴾. الاية ١–٤.

بکات ئەوا پرسیاری لیٚ ناکریٚت، گەر کەسیٚك جیاکاری دەکرد ئەوا تەنها هۆکاری چاککردنی لەگەلٚ دەگیریٚتە بەر.

٢.پیٚویستە کەسەکە ئاقلٚ بیٚت، بۆیە هەر ناتەواوییەکی ئەقلٚی لە کەسی تۆمەتباردا بە ریٚگر لە بەرپرسیاریٚتی سزای سەرژمیٚر دەکریٚت.

٣. دەبیٚ کەسەکە ئازاد بیٚت لە هەلٚبژاردندا واتە خاوەنی ویستیٚکی ئازاد بیٚت، گەر کەسەکە زۆرلیٚکراو بوو یان ناچاربوو ئەوا لەرووی سزاییەوە پرسیاری لیٚ ناکریٚت.

٤. پیٚویستە کەسەکە خاوەنی توانین بیٚت بەسەر ئەوەی داوای لیٚکراوە ئەنجامی بدات یان وازی لیٚ بهیٚنیٚت.

٥.پیٚویستە زانا بیٚت بەوەی داوای لیٚکراوە لە کردن یان نەکردن.

ئەم پیٚنج مەرجە لەژیر ئەم ئایەتەدا جیٚگەی دەبیٚتەوە کە دەفەرمویٚت: ﴿لاَ يُكَلِّفُ اللّهُ نَفْساً إِلاَّ وُسْعَهَا﴾[1]

**چواردەهەم: لیٚوەشاوەیی قازی:** لە شەریعەتی ئیسلامدا تەنها ئەوانە دەکریٚنە قازی کە دادپەروەر و پاك و شایستەن بۆ ئیجتیهاد، هەتا ئەو سیفەتە چاك و پاکانە لە قازیدا زۆرتر و زیاتر بیٚت دەستەبەرکردنی دادپەروەری بریارەکەی زۆرتر بەدیدیٚت.

**پازدەهەم تەزکیەی شایەتەکان:** دروست نییە قازی بریار بدات بینا لەسەر وەلاٚمگۆیی شاهیدەکان گەر تەزکیەی ئەو شاهیدانە نەکرابیٚت لە لایەن ئەهلی متمانەوە.

**شازدەهەم: پیٚویستە قازی لە کاتی دادگاییدا خاوەنی حالٚیٚکی ئارام و نەفسییەتیٚکی جیٚگیر بیٚت دوور لە گرژیوونیٚکی دەمارگیرانە:** "عبدالرحمن بن أبی بکرە" دەگیریٚتەوە کە گوێی لە پیٚغەمبەری خودا بووە فەرموویەتی: ((نابیٚ کەسیٚك داوەری بکات لە نیٚوان دوو کەسدا و توورەبیٚت))[2]

**حەڤدەهەم: گەر تاوانبارکردنی تۆمەتبار سەلمیٚنرا بە ئەنجامدانی تاوانی کوشتنی هەلٚە سزاکە بریتییە لە پیٚدانی خویٚن لە لایەن کەسوکاری تۆمەتبارەوە:** ئەو هیچ جۆرە بەرپرسیاریٚتییەکی ئەو سزایە هەلٚناگریٚت، کەسوکاری کەسەکە واتە عەشرەت و هۆز و بنەمالٚەکەی گەر هەبوو، ئەگەر نە، لەسەر ئەو دامەزراوەیە کە تاوانبار خۆی داوەتە پالٚ وەك یەکیٚتییەکان.

---

[1] سورة البقرة– الاية: ٢٨٦.

[2] صحيح مسلم: ١٣٤٣/٣.

**هەژدەهەم: قازی دەتوانێت بڕیار دەربکات بە بێتاوانی کەسی تۆمەتبار و شوێنکەوتووەکان لە سەرپەرشتیار و وەسێتدار و کەسانی تر شان بخەنە ژێر بەرپرسیارێتی کاری تاوانکاری:** عومەری کوڕی خەتاب بەمە قەزاوەتی کردووە کاتێك چەند کۆیلەیەکی "حاطب المزني" تـاوانی دزیـان[1] کردبـوو لـە گەورەکەی خۆیان، یەکەمجار حوکمی دەرکرد بە بڕینی دەستی بەندەکان، پاشان پـێش جێبـەجێ کردن وتی بە "حاطب": وا دەتبینم تۆ ئەم بەندانەت برسی کردبێت، سوێند بە خودا بە سزایەکی دڵڕایی وا سزات دەدەم ئازارت پێ بگەیەنێت، لە کەسێك کە وشتری هەبوو پرسیاری نرخەکەی کرد، وتـی لـە ٤٠٠ درهەمدا نەمدەفرۆشت، واتە بەو برە پارەیە وشترەکەم لەدەست نەدەبوویەوە، بۆیە عومەر بڕیاری دەرکرد بەسەر "حاطب"دا بە هەشت سەد درهەم سزای دڵڕایی.

**نۆزدەهەم: وەلامگۆیی کەسی تۆمەتبار وەرناگیرێت گەر لەژێر فشاری هەڕەشەلێکردن و ئازاردانـدا لە دەمی وەرگیرا بوو:** ئەوەش لەبەر ئەوەی بێباوەڕی کردن لەدوای باوەڕ لەژێر فشاری زۆرلێکـردن و ئازاردان و هەڕەشەدا بە بێباوەڕی نازمێررێت، بێباوەڕی لە گەورەترین تاوانەکانە، قورئان بە دەق ئەوەی هێناوە و دەفەرموێت: ﴿مَنْ كَفَرَ بِاللَّهِ مِنْ بَعْدِ إِيمَانِهِ إِلَّا مَنْ أُكْرِهَ وَقَلْبُهُ مُطْمَئِنٌّ بِالْإِيمَانِ﴾[2]، گـەر بێباوەڕی لەژێر فشاری هەڕەشە لێکردن و ئازارداندا وەرناگیرێت و هیچ ئاسەوارێك لەسەری پەیدا نابێـت ئەوا وەرنەگرتنی وەلامگۆی کەسی تۆمەتبار بە هەڕەشە و ئازاردانی لەپێشترە.

**بیستەهەم: حورمەتی شوێنی نیشتەجێبوون: نادروستی چوونە ژوورەوە بۆ مالان و هەستان بـە پشکنینی مەگەر مۆڵەتی پێشینە لە خاوەن ماڵ و دەسەلاتداری بەرپرس وەرگیرابێت:** قورئان بە دەق حورمەتی شوێنی نیشتەجێ بوونی راگەیاندووە و نادروستی پێشێلکاری حورمەتی ئـەو ماڵـەی بـەیان کردووە: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَدْخُلُوا بُيُوتًا غَيْرَ بُيُوتِكُمْ حَتَّى تَسْتَأْنِسُوا وَتُسَلِّمُوا عَلَى أَهْلِهَا ذَلِكُمْ خَيْرٌ لَكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ، فَإِنْ لَمْ تَجِدُوا فِيهَا أَحَدًا فَلَا تَدْخُلُوهَا حَتَّى يُؤْذَنَ لَكُمْ وَإِنْ قِيلَ لَكُمُ ارْجِعُوا فَارْجِعُوا هُوَ أَزْكَى لَكُمْ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ﴾[3].

مادەی (٨) لە یاسـای بنـەڕەتی عێراقـی[4] دەلێـت: (شـوێنی نیشـتەجێ بـوون لـە دەسـت بـۆ درێژکردن پـارێزراوە، هـەروەها مـادەی (٢٧) لـە دەسـتووری کـاتی سـاڵی ١٩٦٤ دەلێـت: (ماڵـەکان

[1] وشترێکیان دزی بوو سەریان بڕی بوو و گۆشتەکەیان خوارد بوو
[2] سورة النحل-الاية: ١٠٦
[3] سورة النور -الأيتان: ٢٧-٢٨.
[4] دستور ١٩٢٥

حورمەتی خۆیان هەیە و دروست نییە دەستیان بۆ دریژ بکریت)، هەر بەو جۆرە دەیان بنەما و ریسای گشتی کە شەریعەتی ئیسلام رایگەیاندون بۆ بەرژەوەندی کەسی تۆمەتبار بەر لە زیاتر لە چواردە سەدە، یاسا رۆربەیانی نەزانیوە و نەناسیوە هەتا سەدەیەك یان دوو سەدە لەمەوبەر، هەشیانە هێشتا یاسا پەیی پێ نەبردووە.

# باسی دووەم:
# پارێزبەندی

## پێناسەی پارێزبەندی:

(بەخشینی دەستەیەك لە تاکەکان لە ئەرك و پابەندبوونی دیاریکراو)[1]

ئیسلام پارێزبەندی بۆ هیچ کەسێك: خودی خۆی یان رەچەڵەکی یان پلەی کۆمەڵایەتی یان سیاسی یان ئیداری دانەناوە و دانانێت.

سەرچاوەی ئەم بریارە قورئان و فەرموودەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) و هاوەڵە فەقیهەکان و فەقیهەکانی شوێنکەوتوولە، وەك لەم رۆشن کردنەوانەی کە دێن:

### یەکەم: قورئان:

خودا –سبحانه وتعالى– دەفەرموێت: ﴿فَمَنْ يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَه، وَمَنْ يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَه﴾[2]، وشەی (من) لەم ئایەتە پیرۆزەدا ناوی مەرجییە، لە خودی خۆیدا شێوازێکی

---

[1] وەك پارێزبەندی پەرلەمانی ئەوەش بریتییە لەرێگری دادگایی کردنی ئەندامی پەرلەمان یان گرتنەبەری شوێنپێ هەڵگرتنی سزایی دژ بەو کەسە بەپێی حوکمەکانی یاسا، هەروەها ریزبەندی دیبلۆماسی ئەوەش بنەمایەکە دلوا دەکات کەسی دیبلۆماسی نەچێتە ژێر باری قەزای لۆکاڵی دەوڵەتەوە، واتە ئەو دەوڵەتەی ئەو تیایدا دیبلۆماتکارە، خانووەکەی و بینای دەستەی دیبلۆماتکار پارێزبەندی دەیانگرێتەوە، بە جۆرێك دروست نییە کارمەندانی دەوڵەت بچنە ژوورەوە بە مۆڵەتی ئەو نەبێت، یان بە مۆڵەتی سەرۆك کۆمار (د. عبدالواحد کرم – معجم مصطلحات الشريعة والقانون – عمان /ط٢ / ١٩٩٨ ص١٦١–١٦٢)

[2] سورة الزلزلة / ٨٥٧.

گشتگیرییە بە کۆدەنگی زانایانی ئوسولّ فیقە و زانایانی رەوانبێژی، بۆیە موسلّمان و کەسانی تریش دەگرێتەوە، هەر بەو جۆرە نێر و مێ و هەر کەسێکی تر بەبێ وردبوونەوە لە پلە و پایە و دەسەلاّتی.

بەپێی داواکاری گشتی ئەم ئایەتە هیچ پارێزبەندییەك بۆ سەرۆکی دەولّەت و ئەندامانی پەرلەمان و ئەندامانی کاری دیپلۆماسی بوونی نییە، ئەو وەك هەر مرۆڤێکی ئاسایی ترە، گەر تاوانێك ئەنجام بدات و لەبەردەم قەزادا بسەلمێت ئەوا لە رووی سزاییەوە پرسیاری لێ دەکرێت و سزا دەدرێت، بەبێ ئەوەی دەسەلاّتی سیاسی و ئیدارییەکەی رێگر بن لەبەردەم سزادانیدا، ئەمەش پێچەوانەی ئەوەیە کە یاسای دانراوی دەولّەتانی جیهانی لەسەرە.

**دووەم: سوننەتی پێغەمبەر:**

پێغەمبەر(ﷺ) بەر لە مردنی لەبەردەم هاوەلاّنیدا و لەسەر مینبەر وتارێکی خوێندەوە و ئەم بنەما بەرز و شکۆمەندەی راگەیاند: (خەلّکینە، گەر لە مالّی هەر کەسێك شتێکم بردووە ئەوە مالّەکەم چەندی دەوێت با لێی ببات، هەر کەس لە پشتیم داوە ئەوە پشتم با تۆلّەی خۆی لە من بکاتەوە، هەر کەس جنێوێکم بە ناموس و حورمەتی داوە ئەو حورمەت و ناموسم با جنێوەکەم پێ بداتەوە)[1]

لە عائشەوە(ﭫ): قورەیش ئافرەتێکی مەخزومی کە دزی کردبوو، بوو بە خەم و پەژارەیان، وتیان: کێ دەتوانێ لەگەلّ پێغەمبەر(ﷺ) قسە بکات و کێ بوێری ئەوەی تێدایە مەگەر ئوسامە خۆشەویستی پێغەمبەری خودا(ﷺ) بۆیە ئوسامە لەگەلّ پێغەمبەر قسەی کرد، پێغەمبەر فەرمووی: (ئایا بۆ سنووربەزێنییەك بۆ سەر سنوورەکانی خودا تکا دەکەی؟!) پاشان هەستا و وتاری خوێند و فەرمووی: (خەلّکینە، ئەوانەی پێش ئێوە گومڕابوون[2]، ئەوان گەر کەسێکی دەسەلاّتدار و بەهێز[3] لەناویاندا دزی بکردبایە وازیان لێ دەهێنا، گەر کەسێکی لاوازیش لەناویاندا دزی بکردبایە سزایان بەسەردا دەسەپاند، سوێند بە خوداگەر "فاطمة"ی

---

[1] ينظر مؤلفنا: – فلسفة الشريعة –دار الرسالة للطباعة –بغداد ١٩٧٩ ص١٢٤ وما يليها.
[2] وفي رواية انما اهلك.
[3] اي القوي

کچی محمد دزی بکات دەستی دەبڕم)[1]

## سێیەم: کۆمەڵگای فەقیهان لە هاوەڵان و شوێنکەوتووان:

أ.لە ڕێسا شەرعییە گشتییەکان لە ئیسلامدا: (گوێڕایەڵی بۆ هیچ دروستکراوێك بوونی نییە لە یاخیبوونی خودادا)

ب.کاتێك ئەبوبەکر(ﷺ) خەلافەتی گرتە دەست لەبەردەم کۆمەڵێکدا وتارێکی خوێند و پێی وتن: (گوێڕایەڵیم لیّ بکەن هەتا گوێڕایەڵی خودا دەکەم، گەر لە خودا یاخیبووم ئەوا گوێڕایەڵی کردنی من لەسەر ئێوە بوونی نییە)

ج.کاتێك عومەری کوڕی خەتاب خەلافەتی گرتە دەست پێی وتن: (گوێڕایەڵیم لیّ بکەن تا گوێڕایەڵی خودا دەکەم، گەر یاخی بووم گوێڕایەڵی کردنی من لەسەر ئێوە نییە) یەکێك لەناو خەڵکەکەدا راست بوویەوە و پێی وت: سوێند بە خودا گەر لارییەکت تێدا ببینینەوە بە شمشێرەکانمان راستت دەکەینەوە، عومەر فەرمووی: حەمد بۆ ئەو خودایەی لە ئوممەتی محمەددا کەسانێکی دلناوە عومەر بە شمشێر راست دەکاتەوە، کاتێك عومەر خەلیفە بوو "أبی بن کعب" هات بۆ لای و دلوای لێکرد سەودای (گۆڕینەوە) لەگەڵ بکات وەك دلواکردنەوەی مافی خۆی، هەردوو ڕێکەوتن لەسەر ئەوەی "زید بن ثابت" کە یەکێکە لە هاوەڵە فەقیهەکان قازی بێت لە نێوانیاندا بۆ یەکلایی کردنەوەی ناکۆکییەکەیان، عومەر رۆیشت بۆ ماڵی زەید کاتێك رۆیشتە ژوورەوە بۆ لای زەید ژێرەخەرێکی بۆ عومەر راخست بۆ ئەوەی لەسەری دابنیشێت، عومەر پێی وت: (ئەمە یەکەمین ستەمی تۆیە، تۆ دەزانی من وەك رکەبەرێك هاتووم)

لەبەر دەستیدا دانیشت، زەید دوو شاهیدی دادپەروەری لە دلواکەر دلوا کرد بۆ سەلماندنی ئەوەی دلوای دەکات، وتی هیچ بەلگەیەکم بە دەستەوە نییە، با ئەمیری باوەڕداران سوێند بخوات، زەید پێی وت: لە ئەمیری باوەڕداران ببوورە، عومەر پێی وت: (ئایا ئاوا لە نێوان هەموو خەڵکیدا قەزاوەت دەکەیت؟ وتی: نەخێر، وتی: کەوابوو حوکم لە نێوانماندا دەریکە، وەك چۆن حوکم لە نێوان خەڵکیدا دەردەکەی، پێی وت: سوێند بخۆ ئەو مافەی "ئوبەی" لە زەوی تۆدا نییە، ئەویش سوێندنی خوارد)[2]

---

[1] الحديث متفق عليه و في رواية مسلم (لقطعت يدها): صحيح مسلم ٣ / ١٣١٥ رقم الحديث ١٦٨٨.

[2] الديموقراطية الاسلامية للدكتور عثمان خليل / ص ٤٠ج.

د.یەهودییەك ناكۆكی لەگەڵ ئەمیری باوەڕداران عەلی كوڕی ئەبی تالب بۆ دروست بوو لەلای قازی "شریح" خەلیفە لە دادگاییەكەدا ئامادە بوو، قازی دژ بە خەلیفە بڕیارەكەی دەركرد، چونكە مافەكە مافی یەهودییەكە بوو[1].

"عبدالملك بن مروان" لە سەردەمی ئەمەوییەكاندا لەبەردەم قازی"جبیر بن نعیم" ئامادە بوو كە ناكۆكی لەگەڵ ئامۆزایەكی هەبوو، لەسەر شوێنەكەی قازی دانیشت، قازی پێی وت: هەستە لەگەڵ ئامۆزاكەت رابوەستە، "عبدالملك" تووڕەبوو و لە شوێنی دانیشتنی قازی هەستا[2]

و.لە چاخی عەباسیدا دەستەیەك لەسەر خەلیفە مەنصور لەبەردەم قازیدا(محمد بن عمیر الگلحی) دلوایان تۆمار كرد و دلوای مافێكیان دەكرد، قازی دلوای ئامادەبوونی مەنصوری كرد لەبەردەم قەزادا، خەلیفە شوكری قازی كرد و پێی وت: خودا پاداشتت بداتەوە لەسەر دینەكەت و پێغەمبەرەكەت و خەلیفەكەت بە باشترین پاداشت.

ز.پیاوێك لەسەر خەلیفە مەئمون دلوایەكی بەرز كردەوە و دلوای مافێكی دەكرد لەبەردەم قازی "یحیى بن أكثم"دا، بانگكرا لە خەلیفە لەگەڵ ركەبەرەكەیدا دابنیشێت، ئەویش هات و پاسەوانەكەی فەرشێكی بۆ هەڵگرت بوو، قازی فەرمانی پێكرد دابنیشێت لەگەڵ ركەبەرەكەی، پاسەوانەكە فەرشەكەی بۆ راخست، قازی پێی فەرموو: ئەی ئەمیری باوەڕداران گەورەیی مەجلیس بەسەر ركەبەرەكەتدا مەگرە دەست، بۆیە فەرشێكی تریان هێنا بۆ ركەبەرەكە رایان خست و لەسەری دانیشت[3]

نهێنی لەم یەكسان بوون و دیموكراسییەدا لە ئیسلامدایە، ئەوەش ئەوەیە كە شەریعەتی ئیسلام پەیوەندی نێوان گەلان و ئوممەتان و تاكەكان لەسەر حەوت بنچینە بونیاد دەنێت:

بنچینەی یەكەم: یەكێتی رەچەڵەك لە نێوان مرۆڤدا، قورئان لە چەندین ئایەتدا ئەوەی راگەیاندووە، هەموو ئەندامانی خێزانی مرۆڤایەتی برا و خوشكی یەكترن و لە یەك دایك و یەك باوكن، سیفەتی برایەتیش بریتییە لە یەكسانی لە مامەڵەدا و یارمەتی و كۆمەكی كردنی یەكتر و دەستخستنە ناو دەستی یەكتر و تەولوكاری بۆ ژیانێكی رێزدار و شكۆمەند لەسەر راخەری

---

[1] الولاة والقضاة للكندي ص ٣٥٧ نقلا عن فاروق الكيلاني –إستقلال القضاة ص ١٣٠

[2] الدكتور سلام مدكور – المدخل للفقه الاسلامي ص ٣٥٩

[3] المحاسن والمساوىء للبيهقي ص ٣٩٢ نقلا عن استقلال القضاء المرجع السابق ص ١٣١

هەسارەی زەوی، لەگەڵ نەبوونی جیاکاری بە باشتر و چاکتربوون لە پلە و پایە و کار و پلەی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئیداری، بەڵکو چاکتربوون و باشتربوون بۆ کەسێکە لە خودا نزیکتر و سوود و قازانجی زۆرتر بێت بۆ خەڵکی، خودا –سبحانه وتعالى– دەفەرموێت: ﴿يَاأَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ ذَكَرٍ وَأُنْثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِنْدَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ﴾[1]

بنچینەی دووەم: یەکێتی کانزای مرۆڤ لە چەندین ئایەتی قورئاندا ئەوەی راگەیاندووە ئەو کانزایەی مرۆڤی لێ دروستکراوە بریتییە لە خاك(خۆڵ)، خاکیش پڕە لە تەوازوع و هەموو بوونەوەرێکی زیندووی جووڵاوی خاوەن ویست بەسەریدا تێدەپەرێت، بۆیە هەر کەس لە خاك دروستکرابێت پێویستە هەروەکو خاك پڕبێت لە تەوازوع.

ئەوەی بەڵگەنەویستە هەر تاکێك لە تاکەکانی مرۆڤ لە دوو رەگەز پێکدێت: رەگەزی "گیاندار‌ی مەنەوەی پیاو" لەگەڵ رەگەزی "هێلکەی ئافرەت"، ئەم دوو رەگەزەش لە مادەی خۆراکییەوە سەرهەڵدەدەن، بۆیە هەموو مرۆڤێك لە کانزای خاك دروستکراوە، خودا –سبحانه وتعالى– دەفەرموێت: ﴿وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَكُمْ مِنْ تُرَابٍ ثُمَّ إِذَا أَنْتُمْ بَشَرٌ تَنْتَشِرُونَ﴾[2]

پێغەمبەر(ﷺ) ئەم دوو بنەمایەی لە حەجیماڵئاواییدا دووپات کردەوە و فەرمووی: ((هەمووتان لە ئادەمن و ئادەمیش لە خاکە، هیچ گەورەییەك بۆ عەرەب نییە بەسەر ئەعجەمی و سپی بەسەر رەشدا مەگەر بە تەقوا))

بنچینەی سێیەم: یەکێتی بەدیهێنەر، هەموو مرۆڤێك یەك بەدیهێنەر و ئەفرێنەری بۆ هەیە ئەویش خودایە –عز وجل–، مرۆڤ وەك شمەکەکانی بازاڕ نییە بۆ نموونە هەندێکی یابان دروستی کردبێت و چاکی و بەرگەگری بەسەر بەرهەمەکانی تردا هەبێت وەك ئەوەی چین دروستی کردووە، کاتێك بەدیهێنەر تەنها یەك کەس بێت کەواتە دروستکراوەکان لەسەر یەك پلە لە چاکی و خراپیدان، خودا –سبحانه وتعالى– دەفەرموێت: ﴿يَاأَيُّهَا النَّاسُ اعْبُدُوا رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُمْ وَالَّذِينَ مِنْ قَبْلِكُمْ﴾[3]

---

(1) سورة الحجرات /١٣

(2) سورة الروم – ٢٠

(3) سورة البقرة – ٢٥

بنچینەی چوارەم: یەکێتی بەرژەوەندی هاوبەش، هەموو پەیامە ئاسمانییەکان بۆ بەرژەوەندی مرۆڤ هاتوون، لەپێش هەموویانەوە پەیامەکەی پێغەمبەرمان محمد(ﷺ)

خودا-سبحانە وتعالی- لەگەڵ پێغەمبەرەکەی ئاخافتن دەکات و دەفەرموێت: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلاَّ رَحْمَةً لِلْعَالَمِينَ﴾ رەحمەت بریتییە لە بەرژەوەندی چاك و پاك(قازانجی بەدەستهاتوو) هەروەها وەلانانی بەرژەوەندی خراپ (مەفسەدەی پاڵپێوەنراو) جا ئەو دوو جۆرە بەرژەوەندییە مادی بن یان مەعنەوی، دونیایی بن یان دواڕۆژی، هەموو ئەوەی لەسەر زەوییە لە بوونەوەرە زیندووەکان و نازیندووەکان لەپێناو بەرژەوەندی مرۆڤدا دروستکراون، گشت خێر و بێرەکانی سەر زەوی هەموو تاکەکانی سەر زەوی تیایدا بەشدار و هاوبەشن، خودا-سبحانە وتعالی- دەفەرموێت: ﴿هُوَ الَّذِي خَلَقَ لَكُمْ مَا فِي الأَرْضِ جَمِيعًا﴾[1]

هەر مرۆڤێك بۆی هەیە بەشی خۆی لە خێر و بێری سەر زەوی و ئاسمان ببات بەپێی پێویستییەکانی، بە مەرجێك دەستدرێژی نەکاتە سەر مافی کەسانی تر، خودا-سبحانە وتعالی- دەفەرموێت: ﴿وَلاَ تَنسَ نَصِيبَكَ مِنْ الدُّنْيَا﴾.

بنچینەی پێنجەم: یەکێتی چارەنووس، چارەنووسی هەمووان جیابوونەوەیە لە ژیان و رووبەڕوو بوونەوەی مردن بەبێ جیاوازی لە نێوان بەهێز و لاوازدا، خودا-سبحانە وتعالی- دەفەرموێت: ﴿كُلُّ نَفْسٍ ذَائِقَةُ الْمَوْتِ وَإِنَّمَا تُوَفَّوْنَ أُجُورَكُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ﴾[2] هەروەها دەفەرموێت: ﴿أَيْنَمَا تَكُونُوا يُدْرِككُّمْ الْمَوْتُ وَلَوْ كُنتُمْ فِي بُرُوجٍ مُشَيَّدَةٍ﴾[3].

بنچینەی شەشەم: یەکێتی شان دانە ژێر ئەمانەت، مرۆڤ بە تەنها لە نێوان گیاندارە زیندووەکاندا شان دەداتە ژێر کۆڵی ئەمانەت، ئەوەش بریتییە لە کۆی ئەو ئەرکانەی پێویستە بەرانبەر کەسانی تر ئەنجامی بدات، خودا-سبحانە وتعالی- دەفەرموێت: ﴿إِنَّا عَرَضْنَا الأَمَانَةَ عَلَى السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَالْجِبَالِ فَأَبَيْنَ أَنْ يَحْمِلْنَهَا وَأَشْفَقْنَ مِنْهَا وَحَمَلَهَا الإِنْسَانُ إِنَّهُ كَانَ ظَلُومًا جَهُولاً﴾. [4]

---

[1] سورة البقرة – ٢٩
[2] سورة آل عمران –١٨٥
[3] سورة النساء –٧٨
[4] سورة الأحزاب /٧٢

بنچینەی حەوتەم: یەکێتی بەرپرسیارێتی، هەموو مرۆڤێک شان دەداتە ژێر کۆڵی بەرپرسیارێتی کار و کردەوەکانی، گەر کار و کردەوەکانی خێر بن بە خێر پاداشتی دەدرێتەوە و گەر شەڕیش بن سزاکەی شەڕ دەبێت، بەبێ جیاکاری لە نێوان مرۆڤێك لەگەڵ مرۆڤێکی تر بە رەگەز یان رەچەڵەك یان رەنگ و روو یان وڵات و هاوشێوەکانی ئەمانە، خودا–سبحانه وتعالی– دەفەرموێت: ﴿فَمَنْ يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَه، وَمَنْ يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَه﴾[1]، وشەی "مَن" لە ئایەتەکەدا مانایەکی گشتگیری هەیە و لە خودی خۆیدا مانای گشتی دەگەیەنێت، هیچ تایبەت کردنێك نەهاتووە ئەو گشتگیرییە تایبەت بکاتەوە.

لەگەڵ ئەوەی باسمان کرد لە پاساوی نەبوونی پارێزبەندی بۆ هەر مرۆڤێك مەنزیلەکەی هەر شتێك بێت، پلە و پایە و کار لە ئیسلامدا ماف نییە و ئاستێك نییە خۆی لە خەڵکی پێ جیابکاتەوە، بەڵکو ئەرك و شاندانە ژێر بەرپرسیارێتییە، ئەو کارەی هەر بەرپرسێك دەیگرێتە دەست بریتییە لە خزمەت کردن بە کەسانی تر، بۆیە لەپێشترە بە کارەکەی شایستەیی پارێزبەندی بەدەست نەهێنێت.

لە سەحیحی "مسلم"دا[2] هاتووە: ((لە "أبي ذر"ەوە وتی: وتم بە پێغەمبەری خودا، ئایا بەکارم ناهێنی[3] لە ئەرکێکدا، دەڵێ: بە دەستی کێشانی بە ناوشانمدا و فەرمووی: ئەی "أبا ذر" تۆ لاوازیت، ئەم کارەش ئەمانەتە، و لە رۆژی دواییدا شەرمەزاری و پەشیمانییە، مەگەر کەسێك بە حەقی خۆی دەستی بۆ ببات و ئەو مافەی تیایدا لەسەر شانی دانراوە جێبەجێی بکات))

ئەم فەرموودە شکۆمەندە بنەڕەتێکی مەزنە لە دوورکەوتنەوەی پلە و پایە و ئەرك و کار بە تایبەت بۆ ئەوانەی لاوازن لە هەستان بە ئەرکەکانی ئەو پلە و پایانە، بە هۆی ناشایستەبوون و لاوازی لە لێوەشاوەیی ئەودا.

---

[1] سورة الزلزلة (الآية ٧و٨)

[2] صحيح مسلم ٣/ ١٤٥٧

[3] واتە لە ئەرك و پلە و پایەیەکدا دامبمەزرێنە

# بەشی یازدەهەم:
# ئیجتیهادی قەزایی

جیاوازییەکی جەوهەری لە نێوان ئیجتیهادی قەزایی و جۆرەکانی تری ئیجتیهادا بوونی نییە، بۆیە بابەتەکە بە شێوەیەکی گشتی دەستی بۆ دەبەین.

ئیجتیهاد لە "جهد-کۆشان"ەوە وەرگیراوە لە رووی زمانەوانییەوە بە "چم الجیم و فتحها"-واتە پیتی جیمەکە بۆری لەسەر بێت یان سەر بە چەند جۆرێك لە مانا هاتووە کە نزیکترینیان بۆ مانای زاراوەیی وشەکە بریتییە لە "الطاقە-توانین"

لەرووی زاراوەییەوە بریتییە لە بەخشینی توانای زانستی بۆ پەردە لادان لەسەر مانای راستەقینە بۆ بابەتە گرنگپێدراوەکە.

قازی لە ئیسلامدا جێبەجێکردنی ئەو ئەرکەی نەدەگرتە دەست گەر موجتەهید نەبوایە یان لێوەشاوەیی ئیجتیهادی تێدا نەبوایە با لە چەند پرسێکیشدا بوایە جیا لە هەندێکی تری، بەمەرج نەگیرابوو موجتەهیدی رەها بێت لە هەموو کار و بارەکاندا.

ئەم شێوازە بەردەوام بوو لە چاخی پەیامەوە تا کۆتاییەکانی چاخی عەباسی، پاشان قازی بوو بە چاولێکەر بۆ مەزهەبێکی دیاریکراو وەك چاولێکەری و شوێنکەوتنی مەزهەبی حەنەفی لە عێراق و ئەو دەوڵەتانەی لەژێر دەسەلاتی خەلافەی عوسمانیدا بوو.

تایبەتمەندی لە رووی شوێن و کارەوە بوونی نەبوو، قازی لە هەموو جۆرە پرسەکان وردەبوویەوە جا پرسەکان سزایی بوونایە یان مەدەنی یان باری کەسێتی یان شتانی تر، چونکە ژیان لەو سەردەمەدا سادە و ساکار بوو بەراورد بە چاخی نوێ.

سەرۆکاری ستەمخۆری(ولایە المظالم) ئەو سەردەمە تا رادەیەکی زۆر وەك دادگای پێداچوونەوەی(یان دادگای هەڵوەشانەوە)ی ئەمڕۆ وابوو.

ئـەو کەسـانەی وریدبوونـەوەیان لـەم جـۆرە دادگـادا دەگرتـە دەسـت قازییـەکان تیایـدا دەستەوسان بوون، هەروەها وریدبوونەوە لە حاڵەتی دەستدرێژکاری خـاوەن پایـە و رەچـەڵەکی دیار و خاوەن کار و پلەی باڵا لەو سەردەمەدا وەك قەزای کارگێڕی ئەم سەردەمە وابوو.

قازییەکان لە قەزلوەتەکانیاندا دەگەڕانەوە بۆ قورئان و فـەرموودەی پێغەمبـەری خـودا، گـەر دەقێکیان لەوێ نەبینیایەتەوە کاریان بە کۆدەنگی هـاوەڵان و پێشـینە قەزلیـەکانی خەلیفـەکان دەکرد، بە تایبەت خەلیفەکانی راشیدین.

گەر لەوێش نەیانبینیبایەتەوە شوێنی ئیمامی مەزهەبەکان دەکەوتن، بەڵام ئەوانـەیان ئـەهلی ئیجتیهاد بوونایە بۆ خۆیان سەربەخۆ ئیجتیهادیان دەکرد.

لەسـەر قـازی شـەرعی کـە لێوەشـاوەیی ئیجتیهـادی تێدایـە پێویسـتە پابەنـد بێـت بـەم ریزبەندیانەوە:

یەکەم قورئان، دووەم سوننەتی پێغەمبەر، سێیەم ئیجتیهاد و بەکارهێنانی را و بۆچوون.

وەك لە فەرموودەکەی "معاذ بن جبل"دا هاتووە دوای ئەوەی پێغەمبەر تـاقیکردەوە کاتێـك هەڵبژێرد بۆ ئەوەی ببێت بە والی و قازی یەمەن.

پێی فەرموو: چۆن قـەزلوەت دەکـەی؟ فـەرمووی: بـە کتێبەکـەی خـودا قـەزلوەت دەکـەم، فەرمووی: گەر لە کتێبەکەی خودادا نەتبینییەوە؟ وتی: بە سوننەتی پێغەمبەر قەزلوەت دەکەم، فەرمووی: گەر لە سوننەتی پێغەمبەری خودادا نەتبینییەوە، وتی: ئیجتیهاد لە بۆچـووندا دەکـەم و کەمتەرخەم نابم[1]، دەڵـێ: پێغەمبـەر(ﷺ) کێشـای بـە سـینەمدا و فـەرمووی: حەمـد بـۆ ئـەو خودایەی نێرلوەکەی پێغەمبەری خودای سەرکەوتوو کردووە لـە کارێکدا کـە پێغەمبـەری خـودا رازی دەکات[2].

## مەرجەکانی ئیجتیهاد:

أ.ئیجتیهاد لە حوکمە شەرعییەکاندا ئەم سێ مەرجە بە مەرج دەگرن:

---

[1] واتە لە پەنابردن بۆ ئیجتیهاد و بەکارهێنانی بۆچوون کەمتەرخەم نابم.

[2] رواه ابو داود – رقم الحديث ٣٥٩٢ و٣٥٩٣ كتاب الأقضية باب إجتهاد الرأي في القضاء. والترمذي رقم ١٣٢٧ و١٣٢٨ في كتاب الاحكام باب ما جاء في القاضي كيف يقضي.

١. لە رۆحی شەریعەتی ئیسلام و ئامانجەکەی تێبگات.

٢. لە جەهەر و کرۆکی ژیان و داواکارییەکانی تێبگات.

٣. لە پەیوەندی نێوان شەریعەت و ژیان تێبگات.

ب.ئیجتیهاد لە یاساکاندا ئەم سێ مەرجە بە مەرج دەگرن:

١. پێویستە کەسەکە شارەزا و بەئاگا بێت لە یاسا پەیوەندارەکان.

٢. لە سروشتی ئەو بابەتە تێبگات کە لێی ورد دەبێتەوە.

٣. پەی بەو پەیوەندییە ببات کە لە نێوان یاسای پێویست بۆ پیادەکردن و بابەتەکەدا هەیە[1].

بە مەرج ناگیرێت قازی نێر بێت، وەك چۆن بە مەرج ناگیرێت موسڵمان بێت مەگەر لە پرسە ئاینییەکاندا، گرنگ ئەوەیە ئەو کەسە ئەهلی ئیجتیهاد بێت.

ئیجتیهادی قازی یان لە میانەی بوونی دەقدایە یان لە میانەی نەبوونی دەقدایە، بۆیە لێکۆڵینەوەی ئیجتیهادی قەزایی بۆ دوو بەش دابەش دەبێت: ئیجتیهاد بە بوونی دەق، لەگەڵ ئیجتیهاد لە باری نەبوونی دەقدا، بۆ هەر یەکێك لەم دوانە باسێکی سەربەخۆ تەرخان کراوە.

---

[1] ئەم مەرجانە تایبەت بە شەریعەت و یاسا لە داهێنانی منە، چونکە ئەو مەرجانەی لێیان کۆڵاومەتەوە لە سەرچاوەکاندا زۆرینەیان بۆ ئەم سەردەمە پێشکەوتووە ناشێن سەرباری درێژکردنەوەی شەکەتکەر لەو مەرجانەدا.

# باسی یەکەم:
# ئیجتیهاد لە میانەی بوونی دەقدا

ئەوەی روونە دەقە یاساییەکان یان سزایین یان ناسزایین[1]، بۆیە لێکۆڵینەوەی هەر یەکێك لەم دوانە لە لقێکی سەربەخۆدا باس لێوە دەکەین.

## لقی یەکەم:
## ئیجتیهاد لە میانەی بوونی دەقی ناسزاییدا

باری کەسێتی عێراقی راوەستاو و دەقەکانی یاسای مەدەنی عێراقی راوەستاو، چونکە مەبەست لەم خستنەرووە بریتییە لە نموونەهێنانەوە و رۆشنکردنەوەیە، نەك مەرام بریتی بێت لە ئابلۆقەدانی هەموو لقەکانی یاسا لە ناوەوەی عێراق و دەرەوەی عێراق، چونکە ئابلۆقەدانی ئەو کارە دژوارە.

**یەکەم: ئیجتیهاد لە میانەی دەقدا لە یاسای باری کەسێتی عێراقی راوەستاو:**

١.پێشنیاری گۆڕینی برگەی یەکەم لە مادەی یەکەم(دەقە تەشریعییەکانی لەم یاسایەدا بەسەر هەموو ئەو پرسانەدا جێبەجێ دەکرێت کە ئەم دەقانە دەیگرنەوە لە گوزارەیدا یان مانا و ناوەرۆکیدا) ئەم برگەیە جێگەی بگرێتەوە (دەقە تەشریعییەکانی لەم یاسایەدا بەسەر هەموو ئەو پرسانەدا جێبەجێ دەکرێت کە ئەم دەقانە دەیگرنەوە بە گوێپێکراویان یان تێگەیشتن لێیان)

رووی پێشنیارەکە ئەوەیە کە برگە راوەستاوەکە دەسەڵاتی هەڵگوزینی حوکم تەنها لە دوو کەناڵەوە بە قازی دەبەخشێت، ئەو دوانەش گوێپێکراوی راشکاو و تێگەیشتنی تەبا، لە کاتێکدا برگەی پێشنیارکراو دەسەڵاتی هەڵگوزین لە شەش کەناڵەوە بە قازی دەبەخشێت، ئەوانەش(گوێپێکراوی دەق،

[1] پێوەری جیاکاری نێوان دەقە سزاییەکان ناسزاییەکان ئەوەیە کە بەشی یەکەم چارەسەری دەستدرێژی دەکات بۆ سەر مافی گشتی و دووەم چارەسەری دەستدرێژی دەکات بۆ سەر مافی تایبەت سەرباری ئەوەی قازی لە دەقە سزاییەکاندا پابەندە بە رەچاوکردنی بنەمای شەرعییەت بە پێچەوانەی شتانی ترەوە.

دلخوازی دەق، ئاماژەی دەق، کورتەئاماژەی دەق، تێگەیشتنی تەبا و تێگەیشتنی پێچەوانە)[1]

٢.پێشنیاری گۆڕینی ئەم گوزارەیە(گرێبەستی هاوسەرگیری بە زۆرلێکردن پووچەڵە گەر نەچوونە لای یەکتر) وەك لە دەقی مادەی نۆیەم لە یاسای ناوبراودا هاتووە، بۆ ئەوەی ئەم گوزارەیە جێگەی بگرێتەوە(گرێبەستی هاوسەرگیری بە زۆرلێکردن بە راگیراو یان تێکچوو دادەنرێت گەر ئارەزوومەندانە چوونە لای یەکتری لەگەڵ نەبێت)

رووی پێشنیارەکە: هاوسەرگیری پووچەڵ بە مۆڵەتدان ناگۆڕێت بۆ دروست، چونکە بزرکراوە، بزرکراویش لە هیچ رێگەیەکەوە وەرناچەرخێت بۆ هەبوون، پاشان چوونە لای لەولایەوە دیسان بە زۆرلێکردن بێت، بۆیە بە رەهایی هیچ کاریگەرییەکی نییە.

٣.برگەیەکی تازە دەخرێتە سەر مادەی (بیست) بەم جۆرە: مارەیی پاشینەی ژنەکە لەدوای جیابوونەوە لەیەکتر بە تەلاق یان مردن بە ئاڵتوون دەشکێتەوە بۆ کاتی سەرهەڵدانی هاوسەرگیری گەر مارەییەکە پارە بوو و هێزی کڕین و فرۆشتنی[2] بە بەرزبوونەوە یان بە نزمبوونەوە گۆڕانی بەسەردا هاتبوو.

رووی پێشنیارەکە: لابردنی ستەم لەسەر ئافرەتەکە بۆ نموونە پێش شەست ساڵ لەمەوبەر هاوسەرگیری لەگەڵ کراوە کاتێك نرخی مسقاڵێك ئاڵتوون یەك دینار بووە کەمتر یان زۆرتر، لە کاتێکدا ئێستا نرخی مسقاڵێك زێڕ زیاتر لە سەد هەزار دینارە، بۆیە داد و ویژدان نییە ژنەکە ئەو برەی پێ بدرێت لە پاش گۆڕانی هێزی کڕین و فرۆشتنی پارەکە و تەنها سەد هەزار دینار لە مارەیی پاشینە(مارەیی دواخراو) وەربگرێت.

٤. هەروەها لە ئیجتیهادە قەزاییە هەڵەکان: (ئیجتیهادی دادگای پێداچوونەوەیە بە بڕیاری ژمارە ٢٩٤/موسـعە اولى /٨٤ –٨٥ في ١٩٨٥/٦/٢٦ و٢٥٠٨/ شخصـيە ٨٤–٨٥ في ١٩٨٥/١٠/٦ و ١٩٨٣ /موسـعە اولى/٨٥–٨٦ في ١٩٨٦/٦/٣٠ و ٣٣٤/موسـعە اولى /٨٦–٨٧ في ١٩٨٧/٥/٦ یاسادانەری عێراقی رۆشنی کردۆتەوە لە (٨٩)[3]، لە یاسای ناوبراوەوە، سیستمی چینایەتی لە فیقهی جەعفەریدا

---

[1] پێشتر دەستمان بردووە بۆ لێکۆڵینەوەی ئەم شەش کەناڵە بە دوورودرێژی.

[2] چونکە پارە گەر هێزی کڕین و فرۆشتنی گۆڕا لە سیفەتی هاوشێوەییەوە دەگۆڕێت بۆ سیفەتی بەهایی، ئەو کاتە ئەو بەهایە بە بەهای ئەو رۆژەی پابەندبوونەکەی دروستکردووە دەشکێتەوە.

[3] دەقی مادەی (٨٩) میراتگران بە نزیکی و چۆنێتی میراتگرتنیان:

١.باوان و رۆڵەکان با داشبەزن بۆ هەر نێرێك وەك بەشی دوو مێ

وەرگرتووە، هەر چینێك لەو سێ چینە هاتووە بەپێی زنجیرەی برگەکانی (١،٢،٣)ی ئەم مادەیە ئەو چینەی بەدوایدا دێت مەحروم دەکات.

رووی هەڵەی دادگای پێداچوونەوە لە شرۆڤەکردنی مادەی (٨٩) بەم جۆرەیە:

أ. گەر ئەو شرۆڤەکردنە دروست بێت، ئەوا پێویستی بە گۆڕینی برگەی (٤)ی ئەم مادەیە نەدەبوو، کە ئەمەیە: (خوشکی دایك و باوکی وەك برای دایك و باوکی وایە لە مەحروکردنی ئەوانی تردا) چونکە وەك برا وایە لە سیستمی چینایەتیدا بەبێ ئەم گۆڕینە.

ب. گەر ئەو سیستمە ناوبراوە وەرگیرابا ئەم دەربڕینە نەدەهات (ذوو الرحام–کەسە نزیکەکان) چونکە ئەم دەربڕینە بوونی نییە لە مەزهەبی شێعەی ئیمامی و سیستمی چینایەتیدا.

ج. گەر ئەم سیستمە وەربگیرابا یاسادانەر لە برگەی دووەمدا دەیوت(والجداد–باپیرانیش) لە جێگەی (الجد–باپیر) لە کاتێکدا لە فیقهی ئیمامیدا باپیر باوکی باوك و باوکی دایکیش دەگرێتەوە، بۆیە ئەوان "باپیران" لە جێگەی "باپیر" بەکاردەهێنن.

**دووەم: ئیجتیهاد لە بوونی دەقدا لە یاسای مەدەنی عێراقی راوەستاودا:**

١. هەڵەی هاتوو لە برگەی یەکەمی مادەی یەکەمی ئەم یاسایەدا، بۆیە پێشنیار دەکەین ئەم دەربڕینە (لە گوزارە و ناوەرۆکیدا) بگۆڕدرێت بە (بە گوێپێکردن یان تێگەیشتن لێی) وەك پێشتر باسمان کرد.

٢. گرێبەست وا لەبەرچاوبگیرێت کە راگیراوە بەهۆی تەنگی لە ویست یان رازیبووندا لە مادەی (١٣٤) پێچەوانەی فیقهی ئیسلامی و فیقهی خۆرئاواییە، یاسادانەری عێراقی لەم ئاراستەیەدا تەنها کەوتووە، بۆیە پێشنیار دەکەین چاوپێداخشانەوە بەم بابەتەدا بکرێت و گرێبەستەکە وا دابنرێت جێبەجێکاری ناپابەندە.

٣. پێشنیار دەکەم وشەی (تبیح–بۆی موباح دەبێت) لە مادەی (١/٢١٢) بگۆڕدرێت بە گوزارەی (تجیز–دروستە) چونکە پێویست بوون لە هۆیەکانی موباح بوون نییە، بەڵکو بریتییە لە رێگری بەرپرسیارێتییە سزاییەکان نەك مەدەنییەکان، ئەوە لە هۆیەکانی مۆڵەتپێدانە، ئەو کەسەیماڵی کەسێك دەخوات بەبێ مۆڵەتی ئەو لەژێر فشاری پێویستی و ناچاریدا لەرووی سزاییەوە پرسیاری لێ ناکرێت،

---

٢.باپیر و داپیر و برلو خوشك و رۆڵەی برا و خوشك

٣.مام و پوور و خاڵ و پوور کەسوکار

بەلأم لەرووی مەدەنییەوە پرسیاری لیّ دەکرێت، بۆیە لەسەریەتی بارپووی ئەوە بکاتەوە کە خواربوویەتی.

له کاتێکدا له هۆیەکانی موباحبووندا کەسەکە نە لەڕووی سزایییەوە و نە لەڕووی مەدەنییەوە پرسیاری لیّ ناکرێت.

٤. یاسادانەری عێراقی تێکەڵییەکی لا دروست بووە لە نێوان باری پابەندبوون و بابەتی پابەندبووندا، هەر بەو جۆرە تێکەڵی لا دروست بووە لە نێوان باری گرێبەست و باری پابەندبوون له مادەی (١/١٢٩) لە یاسای ناوبراو کە ئەمە دەقەکەیەتی: (دروستە باری پابەندبوون ئامادەکراوبێت و کاتی گرێدانی گرێبەستەکە نەبێت، گەر لە داهاتوودا دەستەبەرکردنی بۆ هەبێت و دیاری بکات بە دیاری کردنێکی نەرێکار بۆ نەزانی و غەدریازی)

دروستە بلێت: (دروستە باری پابەندبوون) یان(باری گرێبەست) بزرکرابێت تا کۆتاییەکەی، چونکە پابەندبوون لە حوکمە دۆلکارییەکانە پەیوەست نابێت بە شتە بەرجەستەکانەوە، بەڵکو پەیوەست دەبێت بە کار و کردەوەکانەوە وەك پێدان و رادەستکردن و ڕێلێگری و هاوشێوەکانی ئەمانە، یاسادانەری میسری لە (م ١٣١–١٣٥) و سوری (م ١٣٢–١٣٦) و ئوردەنی (م١٥٧–١٦٤) و جەزائیری (م٩٢–٩٦)و یەمەنی (م ١٨٦–١٩٧) کەوتوونەتە ناو هەمان هەڵەوە.

بەم برە له پیادەکردنی ئیجتیهاد لە بوونی دەقدا دەوەستین، ئەم جۆرە لە ئیجتیهاد لەسەر قازی پێویستکراوە، چونکە ئەو دەق پیادە دەکات، بۆیە قازی یارمەتیدەری یاسادانەرە بۆ ئەوەی یاساپڕێژی بۆ کردووە لەو هەڵە و ناتەواویانەی لە هەر دەقێکدا پەیدا پیّ دەبات.

## لقی دووەم:
## ئیجتیهاد لە میانەی بوونی دەقە سزاییەکاندا

ئیجتیهاد لە میانەی بوونی دەقە سزاییەکاندا زۆر بەرتەسک ترە لە ئیجتیهاد لە میانەکانی تردا، چونکە قازی تیایاندا کۆتوبەندە بە بنەمای شەرعییەتەوە، بۆیە پێویستە لە ئیجتیهاددا پێڕلەکێشێت بە تایبەت لە دەقە سزاییەکاندا، چونکە قازی دەسەلاتی داهێنانی تاوان و سزادانی پێنەدراوە، بەلام دەسەلاتی ئیجتیهادی پێدراوە لە شرۆڤەکردنی دەقە سزاییە ناڕۆشنەکاندا، هەروەها دەسەلاتی ئەوەی پێدراوە دەقی گشتی بکات بە دەقی تایبەت، وەك تایبەت کردنی مادەی (٦) لە یاسای سزادانی عێراقی ڕاوەستاو: (ئەم یاسایە جێبەجێ ناکرێت بەسەر ئەو تاوانانەی کە ئەنجام دەدرێت لە عێراق لەو کەسانەوە کە خاوەنی پارێزبەندی بڕیار لەسەردراون بەپێی ڕێکەتننامە نێودەولەتییەکان یان یاسای نێودەولەتی یان یاسای ناوخۆیی).

هەروەها بۆی هەیە دەقێکی ڕەها بە حیکمەتی دەقەکە و هۆی حوکمەکەی سنووردار بکات، وەك سنووردارکردنی شەوی فەلەکی بە تاریکی لە مادەی (٤٤٠)ی هەمان یاسا، کە دەقەکەی ئەمەیە: (بە بەندکردنی هەتاهەتایی یان کاتی سزا دەدرێت هەر کەس دزییەك بکات ئەم ڕەوشانەی لای خوارەوەی تێدابێت:

١.دزییەکە لە نێوان خۆرئاوابوون و هەلهاتنی خۆردا ڕوویدابێت، ئەوەی ڕۆشنە ئەوەیە جیاوازی نییە لە نێوان کەمێك دوای خۆرهەلهاتن و تۆزێك پێش خۆرئاوابوون بە بڕی چارەکە کاتژمێرێك لەگەل ڕۆژدا، بۆیە حوکمەکەی بریتییە لە توندکردنەوەی سزا و دانانی شەو بە ڕەوشێکی توندکراوە، داوا دەکات ئەو شەوە سنووردار بکرێت بە تاریکی داهاتن کە شوێنی ترسە.

لە نموونەی ئەو ئیجتیهادانەی کە لە میانەی بوونی دەقدا کراون پێشنیاری گواستنەوەی بڕگەی (٤) لە مادەی (٤١) بۆ مادەی (٣٩) یان (٤٠)، چونکە ئەو بڕگەیە کە دەقەی دەلێت: (کاری توندوتیژی کە ڕوودەدات لەسەر ئەو کەسەی تاوانێك یان گوناحێکی ئەنجام دابێت بینراوە بە مەرامی ڕاگرتنی) لە دەروازەی جێبەجێ کردنی ئەرکە نەك بەکارهێنانی ماف.

هەروەها لە نموونەی ئیجتیهاد لە میانەی بوونی دەقدا، شرۆڤەکردنی گوازراوە لە مادەی (٣١٢) لە یاسای سزا میسرییە راوەستاوەکان لە پێناسەی دزی: (هەر کەس گوازراوەیەکی خاوەنداری کەسێکی تر بیات(لابخات) ئەو کەسە دزە) بە ئەولەشەوە کە پەیوەستن بە زەوی و چێنراوەوە تیایدا، دار نێژراو بە هەڵکێشانی، بەرووبوومی دار و درەخت بە لێکردنەوەی، هەروەها هێزی کارەبا و ئاو و هەموو جۆرە وزەیەکی تر کە لەم درێژەپێدانەی مادەی (٤٣٩)دا لە یاسای سزاکانی عێراقی راوەستاودا هاتووە.

هەروەها لە نموونەی ئیجتیهاد لە میانەی بوونی دەقدا گشتگیرکردنی مادەی (٢٣٧) لە یاسای سزای میسری راوەستاو: (هەر کەس لەناکاو کەوت بەسەر ژنەکەیدا لە کاتی ئەنجامدانی زینادا و لەو حاڵەدا پیاوەکە ژنەکەی و ئەوەی زینای لەگەڵ دەکات کوشت ئەوا بە بەندکردن سزا دەدرێت لە جێگەی ئەوەی بە دوو مادەی (٢٣٢ و ٢٣٦) سزا بدرێت، بەوەی دەستدرێژی کردنە سەر هەردووکیان یان یەکێکیان دەگرێتەوە بە دەستدرێژیکردنێك سەرکێشێت بۆ مردن یان کەمئەندام کردن، ئەوەش لە رێگەی تێگەیشتنی تەبایی بۆ دەقە باسکراوەکە، چونکە گەر سزای کوشتنی بە ئەنقەست بەو رەوشە ناشیرین و نالەبارە کاریگەر بێت و دابەزێت بۆ سزای گوناح نەك تاوان، ئەوا کاریگەربوون پێی لە سزادان بە لێدان تا مردن یان کەمئەندام کردنیان لە دەروازەی لەپێشترە.

لە کۆی قسەکان دەگەینە ئەوەی بڵێین ئیجتیهاد لە میانەی بوونی دەقی سزاییدا دروستە، یەکسانە لە قازییەوە بێت یان لە کەسانی ترەوە، بە مەرجێك ئەو ئیجتیهادە سەرنەکێشێت بۆ داهێنانی تاوانێك یان سزادانێك کە راشکاو یان لە میانەدا دەق نایگرێتەوە، ئەوەش وەك پابەندبوونێك بە بنەمای دەقی شەرعییەوە (تاوان و سزادان تەنها بە دەقە)

# باسی دووەم:
# ئیجتیهاد لە میانەی نەبوونی دەقدا

## بواری پیادەکردنی ئیجتیهادی قەزایی:

أ. بوار بە ئیجتیهادی قەزایی و جۆرەکانی تر لە ئیجتیهاد نادرێت لە بابەت و پرسە سزاییەکاندا بەپێی بنەمای شەرعی (تاوان و سزادان تەنها بە دەقە)، بۆیە قازی دەسەلاتی داهێنانی تاوان یان جۆری سزای نییە لە شەریعەت و لە یاسادا، شەریعەت بە سەدان ساڵ پێش یاسا کەوتووە لە راگەیاندنی ئەم بنەما رەوادا، لە چەندین ئایەتدا، لەوانە: ﴿وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّى نَبْعَثَ رَسُولاً﴾الإسراء: ١٥، بۆیە رۆڵی ئیجتیهادی کورتدەبێتەوە لەو مەیدانانەدا کە سزایی نیین.

ب. ئەوەی کۆدەنگی فەقیهەکانی شەریعەت، یان مەجلیسی شورا، یان مەجلیسی نوێنەران(پەرلەمان)ی لەسەرە لە دەروازەی ئیجتیهادی قەزایی نییە، چونکە رۆڵی قەزایی لەوەی ئەو لایەنانە بڕیاری لەسەر دەدەن تەنها لە پیادەکردندا کورتدەبێتەوە، بایەخی هەروەك بایەخی پیادەکردنی دەقەکانە.

ج. بۆ ئیجتیهادی قازی لەو شتانەی دەقیان لەسەر نییە چەندین رێگە بوونی هەیە لە نێوان فیقهی ئیسلامی و یاسادا کە قازی پەنایان بۆ دەبات بۆ گەیشتن بە حوکمی داواکراو جیاوازیش تەنها لە ناوناندایە، فەقیهەکان پێی دەڵێن (سەرچاوە بەهەندوەرگیراوەکان)، یاساناسانیش پێیان دەڵێن (رێساگشتییەکان)

د. زانایانی ئوسوڵ فیقە تێکەڵییەکیان دروستکردووە لە نێوان رێگەی ئیجتیهاد بۆ گێڕانەوەی بەشەکییەکان بۆ هەمووەکییەکان لە دەقە مانا ژنەوراوەکانەوە (واتە ئەوانەی ژێری پەی دەبات بە هۆیەکان و حیکمەتەکانیان لە قورئان و سوننەتی پێغەمبەردا) لەگەڵ سەرچاوەکانی حوکم، ئەوانە رێگەلێکن بۆ پەردە لادان لەسەر لەسەر حوکمەکانی خودا، نەك بوونە سەرچاوە بۆیان.

هـ. قازی لە جێبەجیّ کردنی پێشینە قەزاییەکاندا چاو لە قازییەکانی پێشووتر دەکات، ئەو پیادەکردنە نابێتە ئیجتیهادێکی قەزایی.

و. پیاوانی ئاین لەو کاتەوەی مەزهەبەکان تۆمارکراون کارکردنیان بە ئەوەی زانایانی ئوسولّ فیقه پێی دەڵێن سەرچاوە بەهەندگیراوەکان پشتگویّ خستووە، بە جۆرێك کتێب دانان و ولەوتنەوە و فێربوون و لەسەر دەق نووسین بەراورد بەو سەرچاوە بەهەندوەرگیراوانە تەنها کارێکی چاولێکەرانە بووە، پاشین چاولێکەری پێشینیان کردووە کە هیچ کاریگەرییەکی نەبووە، چونکە مفتی و قازی خۆی ماندوو نەدەکرد بە بەکارهێنانی سەرچاوەیەك لەو سەرچاوە بەهەندگیراوانە بۆ گەیشتن بە حوکمی دلوکراو، بەڵکو هەر یەك لەوانە دەگەڕایەوە بۆ سەرچاوەیەکی فیقهی مەزهەبێك کە شوێنی دەکەوت، هەروەها بۆ ئەوەی خۆی ماندوو نەکات بە بەراورد کردن لە نێوان مەزهەبەکەی خۆی و مەزهەبێکی تردا و لەوێشەوە رایەکی پارسەنگ بدۆزێتەوە یان رایەکی گونجاو بۆ سەردەم و رەوشەکان ببینێتەوە کە لەناویدا دەژی، ئەمەش بەڵایەکی مەزنە کە لەدێر زەمانەوە جیهانی ئیسلامی دلگرتۆتەوە.

## گرنگترین رێگەکانی ئیجتیهاد لەو میانەی دەقی لەسەر نەهاتووە:

گرنگترین رێگەکانی ئیجتیهادی قەزایی و ناقەزایی کە زانایانی ئوسولّی فیقه پێیان دەڵێن (سەرچاوە بەهەندوەرگیراوەکان) و یاساناسانیش بە (رێسا گشتییەکان) یان(سەرچاوە فەرمییەکان) ناویان دەهێنن، یاسا دان دەنێت بە کارکردن پێیان لەو شتانەی کە دەقیان لەسەر نەهاتووە، ئەو رێگانەش ئەمانەن:

١. **عورف:** ئەو شتەیە کە بەکارهێنانی چەندبارە بووەتەوە لە گوفتار و کردار تا سیفەتی جێگیربوونی وەرگرتووە لە ناخدا و قبوولّ کردن بە ژیری و رەچاوکردن لە هەڵسوکەوتدا[١]، قورئان کارکردن بە عورفی لە چەندین ئایەتدا راگەیاندووە، لەوانە ﴿خُذِ الْعَفْوَ وَأْمُرْ بِالْعُرْفِ وَأَعْرِضْ عَنِ الْجَاهِلِينَ﴾[٢]، بەبەڵگەبوونی لە پرسە ناسزاییەکاندا بە رێسا فیقهییە هەمووەکییەکان جێگیر بووە و سەلماوە، لەو رێسایانە: (عورف سەپاوە)[٣]، هەروەها(ئەوەی

---

[١] ينظر مؤلفنا اصول الفقه في نسيجه الجديد/١/٧٧.

[٢] سورة الاعراف/ ١٩٩.

[٣] مجلة الاحكام العدلية المادة (٣٦).

لە رووی عورفەوە ناسراو و سەپاوە وەك بەمەرجگیراو وایە)[1]، هەروەها(ئەوەی لە نێوان بازرگانەکاندا باوە وەك مەرج وایە لە نێوانیاندا)[2]، هەروەها(دیاریکردن بە عورف وەك دیاریکردن وایە بە دەق)[3]

عورف لە یاسا ناوخۆییەکاندا گرنگی کەم بووەتەوە لەدوای ئەوەی زۆربەی عورفەکان گۆڕان بە دەقی یاسایی، بەڵام هێشتا رۆڵی کاریگەری هەیە لە یاسا نێودەوڵەتییەکان و چارەسەری ململانێ و کێبەرکێکان لەبەر رۆشنایی عورفی نێودەوڵەتییدا.

هەر بەو جۆرە گرنگییەکی گەورەی هەیە لە ئیجتیهادی قەزایی و فیقهی ئیسلامیدا.

**مەرجەکانی کارکردن بە عورف:**

١. عورفێکی دروست بێت و پێچەوانەی دەقێکی راشکاو و رێکخستن و ئادابی گشتی نەبێت.

٢. چەسپاو بێت و لەرزۆك نەبێت، بەوەی جێگیربێت و کاری پێ بکرێت.

٣. پێش ئەو رووداوە کەوتبێت کە بەسەریدا پیادە دەکرێت.

٤. گشتی بێت لە حوکمە گشتییەکاندا.

٥. کۆدەنگییەك لە پەیوەندارەکانەوە بوونی نەبێت بۆ کارکردن بە پێچەوانەکەی[4].

**٢. پێوانە:** ئەوەش بریتییە لە گێڕانەوەی بەشەکییەکان بۆ هەمووەکییەکانی دەقە مانا ژنەوراوەکان ولە دەقە گشتییەکان کە ژێری تەندروست دەتوانێت هۆیەکان و ئامانجەکان لە قازانجێکی راکێشراو یان زیانێکی پاڵپێوەنراو پەی پێ ببات، پێشتر بە درێژی باسی پێوانەمان کرد، پێشنیار دەکەم ئەم پێناسەمان وەربگیرێت، چونکە تۆکمەتر و وردترە لە پێناسەی زانایانی ئوسولی فیقە بۆی.

**٣.بەرژەوەندی:** بریتییە لە سوود و قازانجێکی راکێشراو یان زیانێکی پاڵپێوەنراو، پێشتر باسی ئەوەمان کرد کە خودا-سبحانه وتعالى- لە پەیامی پێغەمبەرمان محمد(ﷺ) ئامانجی کورتکردۆتەوە لە

---

[1] المجلة (٤٣).
[2] المجلة (٤٢).
[3] المجلة (٤٥).
[4] أصول الفقه في نسيجه الجديد /٨٤/١ ومايليها.

بەرژەوەندی مرۆڤدا، وەك لەم ئایەتەدا: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَالَمِينَ﴾، شایانی باسە سەرجەم رێگە ئیجتیهادییەکانی تر بۆ بەرژەوەندی دەگەڕێنەوە[1].

٤. **بەبلشزانین:** ئەوەش بریتییە لە هەڵاوەردەکردنی هەندێ لە پرسە بەشەکییەکان لە رێسا هەمووەکییەکانیان وەك رەچاوکردنێك بۆ بەرژەوەندییەك یان پێویستییەك یان عورف.

وەك هەڵاوەردەکردنی شەهید لەپێناو بەرژەوەندییەکی گشتیدا لە مەرجی تەولو کردنی خزمەتی سەربازی گشتی یان مەدەنی بۆ مەرامی مووچەی خانەنشینی، ئەمەش وەك رەچاوکردنی بەرژەوەندی گشتی و بەرژەوەندی خێزانەکەی، هەروەها وەك هەڵاوەردەکردنێکی ناچاری لە خواردنی گۆشتی مردارەوە بوو و خواردنی ماڵی کەسانی تر لە رێسای بە تاوانداانان، وەك رەچاوکردنێك بۆ پێویستی ناچاری.

٥. **داخستنی دەرگای هۆکار و کردنەوەی:** هۆکارەکان حوکمی ئامانجەکانیان هەیە رەوابن یان نارەوا، دەکرێنەوە گەر رەوا بن و دادەخرێن گەر نارەوا بن، چوار بەشی هەیە:

أ. هۆکار و ئامانج رەوا بن، وەك پێدانی خەڵات بە قوتابیینە یەکەمەکان بە مەبەستی پێشبڕکێ لەپێناو سەرکەوتن و پێشکەوتنی زانستی، بۆیە هۆکارەکەی دەکرێتەوە.

ب. هەردووکیان نارەوا بن وەك رێککەوتنی تاوانکارانە لەسەر ئەنجامدانی تاوانێك بەرانبەر بڕێك پارە لێرەدا هۆکار دادەخرێت.

ج. هۆکاری رەوا و ئامانجی نارەوا وەك پێشکەش کردنی هەدییەیەك بە قازی بە مەبەستی لایەنگیری بۆ ئەو لە کاتی دادبینیدا، لێرەدا دادەخرێت.

د. هۆکار نارەوایە و ئامانج رەوایە، لێرەدا دەکرێتەوە، وەك سزادانی کەسی تاوانکار بە مەبەستی پارێزگاری کردن لە رۆح و ماڵ و ناموس و ئاسایش و ئارامی.

٦. **هاوەڵیکردن:** ئەوەش بریتییە لە دان نان بە حوکمێکی پێشینەدا کە تیاچوونی نەسەلماوە.

**بەشەکانی چوارن:**

أ. مویاحکردنی بنەڕەتی بۆ شتە بەسوودەکان، گەر پێچەوانەی ئەوە نەسەلمابێت، بنەڕەت لە بوونە گەردوونییەکانی شتە بەسوودەکاندا موباح بوونە ﴿هُوَ الَّذِي خَلَقَ لَكُم مَّا فِي الْأَرْضِ

[1] للاطلاع على تفصيل ذلك ينظر مؤلفنا أصول الفقه في نسيجه الجديد/١/١١.

جَمیعًا﴾، "لام"ی وشەی "لکم" بۆ سوود و قازانجە، وێنا ناکرێت خودا شتێکی بۆ سوود و قازانجی مرۆڤ دروست کردبێت پاشان قەدەغەی کردبێت.

ب. هاوەڵی کردنی بێگوناهی بنەڕەتی، مرۆڤ لەدایك دەبێت و لە ئەستۆدا پاکە لە هەموو پابەندبوونێکی تاوانی یان مەدەنی، بۆیە لەسەر قازی پێویستە وا تەماشای بکات کە هێشتا بێگوناه و بێ تاوانە لە هەموو دۆلکارییەکی قەزایی تا پێچەوانەی ئەوە دەسەلمێت.

ج. هاوەڵی کردنی سیفەتێکی بنەڕەتی بە بەلگەیەکی شەرعی تا پێچەوانەی ئەوە دەسەلمێت، ئافرەتی پێشتر شووکردوو گەر دوا لە قازی بکات لە پیاوێکی تر مارەی بکات لەسەر قازی پێویستە دوایەکەی رەد بکاتەوە تا جیابوونەوە لە مێردەکەی پێشووی بە مردن یان بە تەلاق و تەواوبوونی عیدە دەسەلمێت.

د. هاوەڵی کردنی سیفەتێکی بنەڕەتی بۆ شتەکان، هەرکەس ئۆتۆمبێلێکی کڕی و پاشان بەکارهێنا و ناتەواوییەکی تێدا دەرکەوت کە گرێبەستەکە هەڵبوەشێنێتەوە و فرۆشیاریش بانگەشەی ئەوەی کرد کە دوای فرۆشتن ناتەواوییەکەی تێدا پەیدا بووە و ئەو دەستەبەری ناکات و کڕیاریش بانگەشەی ئەوەی کرد کە ناتەواوییەکە پێش کڕینەکە بووە، ئەوا لەسەر قازی پێویستە لایەنی فرۆشیار پارسەنگ بکات تا پێچەوانەی ئەوە دەسەلمێت، چونکە بنەڕەت سەلامەتی و نەبوونی نەنگییە و ناتەواوی و نەنگی لابەلایە.

## یاسا و ئیجتیهادی قەزایی:

تەنها ئاماژە بە یاسای عێراقی و میسری دەکەین تاکو خۆمان لە درێژکردنەوەی شەکەتکار دووربخەینەوە.

## یەکەم: یاسای مەدەنی عێراقی بەرکار:

مادەی یەکەمی ئەم یاسایە و سێ برگەکەی قازی سەرپشك دەکات لە دەسەڵاتی ئیجتیهاد لە میانەی بوونی دەق و میانەی نەبوونی دەقدا، بەم جۆرە:

أ. برگەی یەکەم لە باری بوونی دەقدا تایبەتکراوە، دەقەکەی بەم جۆرەیە: (دەقە یاساڕێژکراوەکان بەسەر هەموو پرسەکاندا تێدەپەڕێن کە ئەم دەقانە لە گوزارە و ناوەرۆکیاندا دەستی بۆ دەبەن)، ئەم برگەیە ناتەواوە و نەنگی تێدایە، کورتکراوەتەوە لە تەنها دوو رێگەدا لە رێگەکانی هەڵهێنجانی حوکم لە

دەقەوە لە لایەن قازییەوە: ڕێگەی گۆپێکراوی ڕاشکاو بۆ دەق کە لەم بارەدا قازی پێویستی بە ئیجتیهاد نییە.

لەگەڵ ڕێگەی تێگەیشتنی تەبا، وقسە لە پێویستی قازی بە ئیجتیهاد، لەم بارەدا لەسەر سنووردارکردنی جۆناندنی تێگەیشتنی تەبا[1] ڕاوەستاوە، گەر جۆناندنی بۆ کرا لێ بێدەنگ بوو پێوانە دەکرێتە سەر گۆ پێکراو لە حوکمدا بەهۆی بەشداربوونیان لە هۆیەکەیدا، پێوانە دەبێت کردەیەکی ئیجتیهادی لەسەر قازی و پێویستە پەنای بۆ ببات، بەڵام گەر جۆناندنی بۆ کرا بەوەی لە جۆری ئاماژەی گوزارەیی عورفی ڕاستەقینەیە یان مەجازییە ئەوا پێویست بە ئیجتیهاد ناکات.

لە هەموو بارەکاندا برگە یاساییەکە ناتەواوە، چونکە تەنها لە دوو ڕێگەدا کورت بووتەوە بۆ دەرهێنانی حوکم لە دەق (گۆپێکراوی ڕاشکاو و تێگەیشتنی تەبا) لە کاتێکدا ڕێگەکانی هەڵهێنجان لە واقیع و لە خۆیدا شەشن وەك پێشتر باسمان کرد، ئەوانەش (گۆکراوی دەق، دلخوازی دەق، ئاماژەی دەق، کورتەئاماژەی دەق، تێگەیشتنی تەبا و تێگەیشتنی پێچەوانە)، بۆ ڕاستکردنەوەی ئەم هەڵە گەورەیە پێویستە گوزارەی (لە گوزارە و ناوەڕۆکیدا) بگۆڕین بۆ (بە گۆپێکردن و تێگەیشتن لێی)

برگەی دووەم و سێیەمی ئەم مادەیە دەست بۆ ئیجتیهادی قەزایی دەبات لە باری نەبوونی دەقدا.

ب. برگەی دووەم: (گەر دەقێکی یاساڕێژۆکراو نەبینرایەوە کە بتوانرێت پیادەبکرێت، دادگا بەپێی عورف بڕیار دەردەکات، گەر نەبینرایەوە بەپێی بنەماکانی شەریعەتی ئیسلام کە زۆرترین گونجانی هەیە بۆ ئەم یاسایە بەبێ پابەندبوون بە مەزهەبێکی دیاریکراوەوە، گەر نەبینرایەوە ئەوا بەپێی ڕێسای دادپەروەری)

کەسی یاسادانەر وەك ڕۆشنە قازی سەرپشك کردووە بە دەسەڵاتی ئیجتیهاد و پەنابردن بە سێ ڕێگە هاتووەکەوە لەگەڵ ڕەچاوکردنی ئەم ڕیزبەندییە:

یەکەم: عورف دووەم: بنەماکانی شەریعەتی ئیسلام سێیەم: ڕێساکانی دادپەروەری.

---

[1] هەندێك جۆناندنیان بۆ کردووە بەوەی ئاماژەی تێگەیشتن ئەقڵی و پێوانەیی و ئیجتیهادییە، قازیش گەر هۆی حوکمە هاوبەشەکە پەی پێ نەبات لە نێوان گۆپێکراو و لێ بێدەنگ بوودا ناتوانێت یەکەم بە دووەم بگەیەنێت، پێوانەش تەنها ئەم مانایەی هەیە. هەندێ وای بۆدەچن کە ئاماژەکە گوزارەیی و مەجازییە لە شێوەی باسکردنی تایبەت و ویستنی گشتییە. کۆمەڵێك دەڵێن ئاماژەیەکی گوزارەیی ڕاستەقینەی عورفییە، بۆ زیاتر ئاگاداربوون تەماشای ئەم کتێبەمان بکە: أصول الفقه في نسیجه الجدید٢/ ٤٩١ ومایلیها

ئەنگییەکانی ئەم برگەیە ئەمانەیە:

١. پێشخستنی عورف بەسەر شەریعەتدا[1]، لەگەڵ ئەوەی شەریعەت لە سیستمی گشتییە و دروست نییە کودەنگی بکرێت لەسەر سەرپێچی لێکردنی بە پێچەوانەی عورفەوە.

٢. کاتێك عورف و شەریعەت بەرهەڵستی یەکتریان کرد عورف بەسەر شەریعەتدا پێشدەخرێت بەپێی ریزبەندی ئاماژەبۆکراو، ئەمەش لە ولاتێکدا کە لە دەستوورەکەیدا هاتووە ئیسلام ئایینی دەوڵەتە.

٣. یاسادانەر تێکەڵییەکی لا دروست بووە لە نێوان شەریعەت و فیقهی ئیسلامییەدا، لەگەڵ ئەوەی شەریعەت دەقی قورئان و فەرموودەیە، ئەوانەش لەرووی باوەڕ و کارپێکردنەوە پابەندبوون پێیانەوە پێویستە و جێگیرن و بەپێی کات و شوێن و کەس و گۆڕانی بەرژەوەندییەکان ناگۆڕێن و ئەگەری هەڵەیان تێدا نییە، بە پێچەوانەی فیقهەوە کە بریتییە لە شرۆڤەکردنی ئەو دەقانە و ناپابەند و ناجێگیرە و ئەگەری هەڵە و گۆڕانی تێدا هەیە.

٤. گوزارەی "بنەماکانی شەریعەتی ئیسلام" هەڵەیەکە جێگەی لێخۆشبوون نییە چونکە وەحییە، لە کاتێکدا بنەما لە بیناکردنی بیری مرۆڤە.

٥. "رێساکانی دادپەروەری" نەزانرا و ناڕوشن و نادیارە بۆ قازی، ئەو رێسانە کامانەن، ئایا یاسای شەرعین یان یاسایین یان ئوسولیین یان لۆژیکیین یان ئەقڵیین؟!.

٦. رەوانەکردنی قازی بۆ نادیارێك یان تێگەیشتنێکی گشتی مەشخەڵ ناڕۆشن رەفزکراوە لە ژیریێژی و ئەقڵی تەندروستدا.

ج. **برگەی سێیەم** "دادگاکان لە هەموو ئەوانەدا رێنموونی وەردەگرن بەو حوکمانەی قەزا و فیقهـ بریاریان لێداوە لە عێراق و پاشان لە ولاتانی تر کە یاساکانیان لە یاسا عێراقییەکان نزیك دەبنەوە".

**ئەم برگەش کۆمەڵێك ئەنگی تێدایە:**

---

[1] پرۆژە یاسای مەدەنی عێراقی بەرکاری ئامادەکراو لەلایەن لیژنەیەکی پێکهاتوو لە ئەندامانی عێراقی بە سەرۆکایەتی خوالێخۆشبوو سەنهوری، لەو پرۆژەیەدا شەریعەت پێش عورف خرابوو لە کاتی تەواوکردنی پرۆژەکەدا، لەدوای گەرانەوەی سەنهوری بۆ قاهیرە ئەندامە عێراقییەکان عورفیان لە شەریعەت پێشخست، سەنهوری نامەیەکی سەرزەنشتی لەسەر ئەو کارەیان بۆ نووسین: من ئەو نامەیەم خوێندەوە کە لەلای مامۆستا "ضیاء الشیت" بوو، سەرۆکی پێشتری دادگای پێداچوونەوە.

١.حوکمی قازی بەوەی فیقه یان قازی عێراق یان ولاتێکی تر کە یاساکانی لە یاسا عێراقییەکان نزیکدەبێتەوە بڕیاری لێداوە لە دەروازەی چاولێکەرییە نەك ئیجتیهاد.

٢.هەموو پرسێك رەوش و پاشخانی تایبەت بەخۆی هەیە، گەر پرسەکان لێکچوو بوون ئەوا دروست نییە بۆ قازی لە پرسێکی تایبەتدا بڕیار بدات بەوەی قازی پێشتر یان فەقیهێك بڕیاری پێداوە لە هاوشێوەکانیدا، جیاوازی حوکم بەپێی جیاوازی رەوش و کات و شوێن و کەس کارێکی باوە.

٣.لەوانەیە قازی پێشتر یان فەقیهەکە لە حوکمەکەیدا ناڕاست بێت، چونکە ئیجتیهادی کردووە، هەموو موجتەهیدێکیش وەك چۆن ئەگەری پێکانی هەیە ئەگەری هەڵەشی هەیە، لە باری دووەمدا هەڵەکە دووبارە دەبێتەوە لە ئیجتیهادی قازی شاندادەر لەسەر حوکمەکەی پێشوو گەر بە هەمان حوکم بڕیار دەربکات.

٤.حوکم کردن بە حوکمەکانی ولاتێکی تر سەرباری نزیکی یاساکان کارێکە فەلسەفەی یاسا ڕەدی دەکاتەوە، چونکە لە هەر ولاتێکدا پێویستە یاساکان لە واقیعی خۆی و سروشتی ژیانی خۆیەوە هەڵبگوزرێن، وەك پێشتر ئاماژەمان پێدا "مۆنتسکیو" دەڵێت: یاسای هەر کۆمەڵگەیەك بەکاری کۆمەڵگەیەکی تر نایەت.

**دووەم: یاسای مەدەنی میسری بەرکار[1]:**

یاسادانەری میسری کەوتۆتە ناو هەمان هەڵەوە کە یاسادانەری عێراقی تێکەوتووە لە مادەی یەکەم دەقەکەی: (دەقە یاساڕێژی بۆکراوەکان بەسەر هەموو پرسەکان تێدەپەڕێنرێن کە ئەو دەقانە دەستی بۆ دەبەن لە گوزارە یان ناوەڕۆکییاندا، گەر دەقێکی یاساڕێژیۆکراو نەبینرایەوە کە بتوانرێت پیادەبکرێت، (دادگا بەپێی عورف بڕیار دەردەکات، گەر نەبینرایەوە بەپێی بنەماکانی شەریعەتی ئیسلام کە زۆرترین گونجانی هەیە بۆ ئەم یاسایە بەبێ پابەندبوون بە مەزهەبێکی دیاریکراوەوە، گەر نەبینرایەوە ئەوا بەپێی رێسای دادپەروەری)، هیچ پاساوێك بۆ هەڵەی یاسای مەدەنی عێراقی بوونی نییە لە پەیوەست بە یاسای مەدەنی میسرییەوە، بەڵام پێویستە ئاماژە بە هەڵەیەك بکەین کە یاسای مەدەنی میسری تێکەوتووە لە خستنەسەری گوزارەی یاسای سروشتی، ئەم یاسایە لە نێوان راستەقینە و خەیاڵدا ژیاوە و دەژی.

[1] رقم ١٣١ لسنة ١٩٤٨.

گەر مەبەست پێی یاسای خودایی ئەوا ئەو سیفەتانەی یاساناسانی یاسای سروشتی باسیان کردووە بەسەریدا پیادە دەکرێت، گەر مەبەستی ئەو یاسایە بێت کە لە سروشتی واقیعی کۆمەڵگەوە هەڵدەگوزرێت ئەوا راستەقینەیەکی بۆ هەیە، بەڵام هەتاهەتایی و نەمر و نموونەیی نییە.

بەڵام گەر مەبەستی ئەوە بێت هەندێ لە فەقیهەکانی یاسا وتویانە وەك خوالێخۆشبوو "سەنهوری" و خوالێخۆش بوو"عبدالباقي البكري" و خوالێخۆش بوو "منذر الشاوي" بەوەی یاسایەکی هەتاهەتایی و هەرهەریی و نموونەیی و جێگیرە و بە گۆڕانی کات و شوێن و کەس گۆڕانی بەسەردا نایەت و لەسەر یاسادانەر پێویستە لەبەر رۆشناییەکەیدا یاسا پێشبخات ئەوە لە دەروازەی وڕێنە و چنینی خەیاڵە، بۆیە پێشنیار دەکەین دارشتنی مادەی یەکەم لە هەردوو یاسای عێراقی و میسریدا بەم جۆرە بێت:

١. دەقە یاسارێژی بۆکراوەکان بەسەر هەموو پرسەکاندا تێدەپەڕێنرێن کە ئەو دەقانە دەیگرنەوە و دەستی بۆ دەبەن بە گوێیکراویان یان بە تێگەیشتن لێیان.

٢. گەر دەقێکی یاسارێژیۆکراو نەبینرایەوە بتوانرێت پیادەبکرێت ئەوا دادگا بەپێی رێسا گشتییەکان بڕیار دەردەکات کە لە سەرچاوە بەهەندگیراوەکانی ئوسوڵی فیقهی ئیسلامیدا خۆیان دەنوێنن.

٣. دادگاکان لە ئیجتیهادەکانیاندا رێنموونی وەردەگرن لە رێسا فیقهییەکانی فیقهی ئیسلامی بەبێ پابەندبوون بە مەزهەبێکی دیاریکراو و پێشینەی قەزایی دروستی دادپەروەر لە هاوشێوەکانی.

رَبِّ زِدْنِي عِلْمًا وَأَلْحِقْنِي بِالصَّالِحِينَ

سەرپەرشتیاری پرۆژە
ڕێدار رەئوف ئەحمەد

الصلة بين المنطق والقانون

پەیوەندی نێوان

مەنتق و یاسا

نووسینی : دکتۆر مصطفی زەڵمی
وەرگێرانی : عبدالكريم فتاح
نەخشەسازی : جمعە صدیق کاکە
نۆرەی چاپ : چاپی یەکەم ٢٠١٧

نرخی هەر بیست و شەش بەرگ
٢٥٠.٠٠٠ دینار

پرۆژەی وەرگێرانی
کۆبەرهەمی دکتۆر مستەفا زەڵمی لە شەریعەت و یاسادا

بەپێی گرێبەستی واژۆکراو لە بەرواری ٢٠١٤/٩/١٧ لەنێوان لایەنی یەکەم: بەڕێز دکتۆر مصطفی زەڵمی کە لەبری ئەو بەڕێز مسعود مصطفی زەڵمی واژۆی کردووە.
لایەنی دووەم: دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی رۆژهەڵات کە بەڕێز حەسەنی دانیشفەڕ واژۆی کردووە.
مافی وەرگێڕانی ئەم بەرهەمانە بۆ زمانی کوردی و چاپکردنیان بەپێی ئەو خاڵانەی لە گرێبەستەکەدا لەسەری ڕێککەوتوون، دراون بە دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی رۆژهەڵات.

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (٧٤٤) ساڵی ٢٠١٦ی پێدراوە

﴿وَمَن يُؤْتَ ٱلْحِكْمَةَ فَقَدْ أُوتِيَ خَيْرًا كَثِيرًا﴾

سورة البقرة/٢٦٩

(حيكمەت بەدەستبهێنە،

چونکە خێر لە حیکمەتدایە)

فەرموودەی پێغەمبەر

(هەر کەس مەعریفەی بە مەنتق

نەبێت متمانە بە کاری ناکرێت)

ئیمامی غەزالی

(مەنتق ترازووی زانستەکانە)

ئیبن سینا

## ناوەرۆك

## پێشەکی

یاساناس لەگەڵ دەقدا دەژی، دەقەکان کێڵگەی کاری یاساین، وەك چۆن یاسا هەیە بۆ ڕێکخستنی پەیوەندی مرۆڤ لەگەڵ مرۆڤ لە داواکارییەکانی ژیاندا، هەر بەو جۆرە سێ یاسا بۆ ڕێکخستنی پەیوەندی یاساناس بە دەقەکانەوە بوونی هەیە:

**یەکەم: یاسای زمان(زمانی دەق):**

ئەم یاسایە زمانی یاساناس لە هەڵەی گوزارشت دەپارێزێ و قەڵەمەکەی لە هەڵەی نووسین و هەروەها پاراستنی ئامادەکردنی پرۆژە یاسا لە هەڵەی داڕشتنی هونەری ورد بۆ دەقە یاساییەکان.

**دووەم: یاسای ئوسولی فیقە:**

ئەم یاسایەش زەینی فەقیە و قازی و پارێزەر.. لە هەڵەی هەڵهێنجانی حوکمەکان لە دەقەکانیان و لقەکان لە بنەڕەتەکانیان دەپارێزێت.

**سێیەم: یاسای مەنتق:**

ئەم یاسایە ژیری بیرمەندی یاسایی دەپارێزێت لە هەڵەی بیرکردنەوە و ئیجتیهاد و بەڵگەهێنانەوە و چۆناندنی ڕووداوەکان و نەخشەسازی لێکۆڵینەوە یاساییەکان و ڕێکخستنی خستنەڕوویان، لەبەر بەربڵاوی پەیوەندی نێوان دوو یاسای یەکەم و دەقەکان لەم لێکۆڵینەوەدا تەنها هەندێ لە حوکمە مەنتقی و یاساییەکان ڕوشنکردنەوە و خستنەڕوویان بۆ دەکەین، ئەو حوکمانەی پێداگری لە پەیوەندی نێوان زانستی مەنتق و یاسا دەکەنەوە، گرنگی کاریگەری مەنتق لە یاسادا ڕوشن دەکەنەوە لەو گۆشەنیگاوە کە مەنتق زەینی کەسی یاسایی تیژ دەکاتەوە، و بیری قووڵدەکاتەوە بەجۆرێك وای لێدەکات لە قووڵایی دەریای دەقەکاندا نوقم ببێت، لەجێی ئەوەی مەلە لە تەنکاوەکانیدا بکات.

## پێناسەی مەنتق:

کارێکی ئەستەمە پێناسەیەك بۆ مەنتق بکەین هەموو جۆرەکانی لەئامێز بگرێت، بەڵام ئەوەی لەم باسەماندا لامان گرنگە مەنتقی ئاسایی "ئەرەستۆ"یە کە پەیوەندی هەیە لەگەڵ دەقەکان و چۆنێتی بەلگەهێنانەوە و سروشتی هەڵهێنجان بۆ گەیشتن بە بڕیارێکی دادپەروەرانە کە دەقی تەشریعی و یاسایی ئامانجیانە دەستەبەری بکەن.

ئەم جۆرە لە مەنتق بە چەندین شێوە پێناسە کراوە، هەر هەموو بە دەوری تەوەرێکدا دەسوڕێنەوە ئەوەش: مەنتق زەین لە هەڵە دەپارێزێت لە کاتی بیرکردنەوە و بەلگەهێنانەوە و ئەنجامگیریدا.

فارابی مەنتقی پێناسە کردووە بەوەی: (کۆمەڵە یاسایەکە بۆ پێوانەکردنی ژنەوراوەکان(معقولات) بەکاردەهێنرێن، وەك چۆن کێشانە و پێوانەکان بۆ پێوانەی تەنە بەرجەستەکان بەکاردەهێنرێن)[1]

ئیبن بەم جۆرە پێناسەی مەنتقی کردووە: (یاسایەکی دروستکراوە زەین لە هەڵە و تێکەوتن دەپارێزێت، جیاکەرەوەی رای دروستە لە رای هەڵە) [2]

غەزالی پێناسەی کردووە بەوەی: (ئەو یاسایە رادە[3] و پێوانە[4] لە شتەکانی تر جیادەکاتەوە، وەك ئەوەی ترازوویەك یان پێوەرێك بێت بۆ هەموو زانستەکان، هەر شتێك بە ترازوو هەڵنەسەنگێنرێت قورسبوونی لە سووکبوون و قازانجی لە زیانی جیانابێتەوە)[5]

تۆما ئەکوینی پێناسەی کردووە بەوەی: (ئەو هونەرەیە بە سیستم و بە شێوەیەکی ئاسان و بەبێ هەڵە لەناو کردە ئەقلّی و ئاماژەییەکاندا رێنموونیمان دەکات)

لەم پێناسانە و پێناسە گەلێکی ترەوە دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە: مەنتق زانستێکی شیکارییە، زانستی بیرکردنەوەی تەندروستە یان زانستی یاسای بیرە کە جیاکاری دەکات

---

[1] الفارابي ابو النصر: احصاء العلوم. نقلاً عن الدكتور مهدي فضل الله: مدخل الى علم المنطق (المنطق التقليدي)، ص١٨.

[2] ابن سينا: منطق الاشارات والتنبيهات، ص٢٣.

[3] پێناسە بە خوسییەکان.

[4] پێوانەی مەنتقی.

[5] الغزالي ابو حامد: مقاصد الفلاسفة تحقيق سليمان دنيا—دار المعارف القاهرة، ١٩٦١، ص٣.

لە نێوان دروست و نادروست(تێکچوو)، هەروەها لە نێوان راست و هەڵە لە بونیادی بیری ئاماژەیی و دەرئەنجامیی مرۆییدا.

مەنتق بە مانایەکی گشتی ئامێری زانستەکانە، زانستە سروشتییەکان و کۆمەلآیەتییەکان و یاساییەکان و ئوسولییەکان رێساکانی بەکار دەهێنن و پێی ئاتاجن، بەلآم ئەو(مەنتق) بەو زانستانە ئاتاج نییە.

## گرنگی مەنتق:

لەسەر رۆشنکردنەوەی گرنگی مەنتق تەنها رستەیەکی پوختی کۆکەرەوەی داهێنەرانە دەخەمە روو کە فەیلەسوفی دونیای ئیسلام غەزالی دەیڵێت پێش نزیکەی نۆسەد ساڵ لەمەوبەر، ئەوەش: ((هەر کەس مەعریفەی بە مەنتق نەبێت متمانە بە کارەکەی ناکرێت))

### بابەتەکەی:

زانیارییە وێناکراوەکان و بەڕاستزانراوەکان لەڕووی پەنابردن بۆیان بۆ پەردە لادان لەسەرنەزانراوە وێناکراوە بەڕاستزانراوەکان[1].

### ئامانجەکەی:

ئامانجی بەمەبەستگیراو لە مەنتق بریتییە لە پارێزگاری زەینی مرۆڤ لە هەڵە لە کاتی دوو بەدەستهێنانە وێناکراویی و بەڕاستزانراوەکەدا.

### سەرهەڵدانی:

زانستی مەنتق لەو کاتەوەی مرۆڤ پرسیار لەمەڕ بوون و دیاردەی گەردوونی مەزن دەکات سەریهەڵداوە، بیردەکاتەوە و بەڵگە دەهێنێتەوە و پاشان بڕیار دەردەکات! !

هەندێ لە لێکۆڵەران دەڵێن: ٩٩٪ی خەڵکی بە فیترەت کەسی مەنتقین بەبێ ئەوەی بە خۆیان بزانن، بەلآم ئەم زانستە لەڕووی تیوری و بابەتی لێکۆڵینەوە و پیادەکردنەوە کاتێك سەریهەڵدا کە ئەرەستۆ(٤٢٧-٣٤٧پ.ز.) بەرپەرچی سۆفستاییەکانی دایەوە،

---

[1] العلامة اسماعيل الكلنبوي: البرهان، مطبعة السعادة، القاهرة، ص١٥.
العلامة زكريا الانصاري: شرح ايساغوجي في المنطق ص٢٠ وما بعدها.

بەڵگەنەویستەکانی ئەوانی وەردەگرت پاشان ناچاری دەکردن لە پێشەکییەکاندا دایان بنێن لـە رێگـەی پێوانـەی مەنتقیانـەوە و پاشـان ناچـاری دەکـردن بـە خۆرادەسـت کـردن بـە سەرئەنجامەکان.

لەوانەیـە یەکـەمین کەسـێك کـە مـەنتقی بـەکارهێنابێت بـۆ گەیشـتن بـە ناسـینی دروستکەر(خودا) گەورەمان ئیبراهیم-علیـه السـلام- بووبێـت، وەك چـۆن قورئـان بۆمـان دەگێرێتەوە: ﴿وَكَذَلِكَ نُرِي إِبْرَاهِيمَ مَلَكُوتَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَلِيَكُونَ مِنَ الْمُوقِنِينَ، فَلَمَّا جَنَّ[1] عَلَيْهِ اللَّيْلُ رَأَى كَوْكَباً قَالَ هَـذَا رَبِّي فَلَمَّا أَفَلَ[2] قَـالَ لا أُحِـبُّ الآفِلِـينَ، فَلَمَّا رَأَى الْقَمَـرَ بَازِغاً[3] قَالَ هَـذَا رَبِّي فَلَمَّا أَفَلَ قَالَ لَئِن لَّمْ يَهْدِنِي رَبِّي لأكُونَنَّ مِـنَ الْقَـوْمِ الضَّـالِّينَ، فَلَمَّا رَأَى الشَّمْسَ بَازِغَةً قَالَ هَـذَا رَبِّي هَـذَا أَكْبَرُ فَلَمَّا أَفَلَتْ قَالَ يَا قَـوْمِ إِنِّـي بَـرِيءٌ مِّمَّا تُشْـرِكُونَ، إِنِّـي وَجَّهْتُ وَجْهِيَ لِلَّذِي فَطَرَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ حَنِيفاً[4] وَمَا أَنَاْ مِنَ الْمُشْرِكِينَ﴾[5].

## گەشە و پێشکەوتنی مەنتق:

سەرەرای بۆچوونی هەندێك کەس، لەوانـە "کانـت" بـەوەی مـەنتق لـە ئەرەسـتۆوە بـە کامڵی و تەواوکاری لەدایك بوو، لەو کاتەوە یەك هەنگاو بۆ پێشەوە هـەنگاوی هەڵنـەگرتووە وەك چـۆن بـۆ دواوە هـەنگاوی نـەناوە، لەگـەڵ ئـەوەش مـەنتقی ئەرەسـتۆ بـەهۆی زانـا موسڵمانەکانەوە لە جیهانی عەرەبی و ئیسلامی، هەروەها بەهۆی هەندێ لە بیرمەندانی ئەم سێ سەدەی دوایی لە جیهانی ئەوروپا گەشە و پێشکەوتنی بەرچاوی بە خۆوە بینیوە، لـە کاتێکدا مەنتقی ئەرەستۆ ئاتاجە بە میتۆدی ئەزموونی بۆ چارەسەری هەموەکییەکان زیاتر لە چارەسەری کاروبارە بەشەکییەکان دەبینین "ئیبن سـینا" مـەنتقی نزیـك کردۆتـەوە لـە میتۆدی ئەزموونی لە رێگەی چارەسەری بەشەکییەکانەوە پاشان گواستنەوە لێیانـەوە بـۆ هەمووەکییەکان، فەیلەسوفە موسڵمانەکان رێسا ئەقڵییـە مەنتیقییـەکانیان لەگـەڵ بەڵگـەی ئەقلی شەرعی تێکەڵ کرد بە مەبەستی گفتوگۆی بەرهەڵسـتکاری لـەناو بـیری ئیسـلامیدا و

---

[1] تاریکبوو
[2] بزربوو(ئاوابوو)
[3] هەڵهات
[4] بەلای ئایینی راست و رەوانددا بادەدەمەوە
[5] سورة الانعام الاية ٧٥-٧٩.

قەناعەت پیّ هێنانی نەیاران بە حیکمەت و ئامۆژگاری جوان و باش و دروست، وەك چۆن قورئان فەرمانی پیّ کردووە: ﴿ادْعُ إِلَى سَبِيلِ رَبِّكَ بِالْحِكْمَةِ وَالْمَوْعِظَةِ الْحَسَنَةِ وَجَادِلْهُم بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ﴾(١)

هەر بەو جۆرە زانایانی ئوسولّی فیقە رۆلّێکی بەرچاویان هەبووە لە پێشکەوتنی زانستی مەنتق و جێگیرکردن و سەلماندنی زۆرێك لە رێساکانی لە زانستی ئوسولّی فیقهدا، بە مەبەستی پەنابردن پێی لە کاتی هەلّهێنجانی حوکمەکان لە دەقەکانیان و دەرهێنانی لقەکان لە بنەڕەتەکانیان.

لە جیهانی ئەورووپاش زۆرێك لە زانایانی سەدەی هەژدەهەم و نۆزدەهەم و بیستەهەم لە پێشکەوتنی مەنتقدا رۆلّیان بینیوە، لەوانە "فرانسیس بیکون" کە رێساکانی میتۆدی ئەزموونی دارشت، هێلّە بەراییەکانی بۆ مەنتقی شوێنپێهەلگرتن رەنگرێژ کرد کە لە جەوهەر و بەرویبوومیدا لە مەنتقی ئەرەستۆیی جیاوازە، هەر بەو جۆرە"ستیورات مل" کە میتۆدی مەنتقی پێشخست بۆ زانستێکی ئەزموونی کرداری تاکو لە زانستەکانی تردا بەشداری بکات.

**پەیوەندی مەنتق بە زانستەکانی ترەوە**

دوای پێشکەوتنی زانستی مەنتق چەندین ئاراستە لە پەیوەندی مەنتقەوە بە زانستەکانی ترەوە سەریهەلّدا، گرنگترینیان:

**١. ئاراستەی زمانەوانی:**

زانایانی زمان پێیان وایە پەیوەندییەکی توندوتۆلّ هەیە لە نێوان زمان و مەنتقدا، چونکە یەکەمیان(زمان) گوزارەیەکی رووالّەتی و دەرەکییە و دووەمیان(مەنتق) بیرکردنەوەیەکی ناوەکییە، زمانیش نواندنێکی رۆشنی پەیپێبراوی زەینییە.

زانایانی نەحو لە موسلّمانان لەناو خۆیاندا دابەش بوون، هەیانە دابەش کردنە مەنتقییەکانی لە نەحودا قبوولّە، هەشیانە رەدی دەکاتەوە لەوانە "خەلیل" و "سیبەوەی"، بەلاّم لە کۆتاییدا نەحوی مەنتقی سەرکەوتنی بەدەستهێنا و بە سەروەری ئەو کۆتایی پێهات.

(١) سورة النحل ١٢٥.

### ٢. ئاراستەی میتافیزیکی[١]:

سەرخەرانی ئەم ئاراستەیە لە "برانتل" و "هیگڵ" و کەسانی تریش پێیانوایە: مەنتق بریتییە لە زانستی بیرکردنەوەی پێویست بە جۆرێك پراوپڕ بێت لەگەڵ بووندا، یان وەك هیگڵییەکان دەڵێن: زانستی بیرۆکەی رووت، لەبەر ئەوەی لە بنەماکانی و بەشەکانیدا میتافیزیکییە وەك بنەمای نەبوونی هەڵوەشانەوە و بنەمای بۆ هەر هۆدارێك هۆیەك بوونی هەیە و شت بریتییە لە ئەو ئەو...

### ٣. ئاراستەی کۆمەلأیەتی:

هەندێ لە کۆمەڵناسان پەیوەندی نێوان زانستی مەنتق و کۆمەڵناسی لەسەر ئەو بنچینە بینا دەکەن کە رێساکانی مەنتق بە بوونی کۆمەڵگە بوونیان هەیە، ئەو کۆمەڵگەی مەنتقی داهێناوە لە سەردەمێکی کۆمەلأیەتی دواکەوتوودا وێنای راستەقینە و راستگۆیی و ماف و پێوەرە کۆمەلأیەتییەکانی تری کردووە و بینیوەتەوە، لە سەرانی ئەم ئاراستەیە "دۆرکایم"ە کە دەڵێت: کۆمەڵگە هەنگاوە سەرەتاییەکانی بە بینا کردنی بیری مەنتقی بەخشیوە.

### ٤. ئاراستەی سایکۆلۆژیانە:

هەندێ لە زانایان هەوڵیانداوە لەوانە "کانت" زانستی مەنتق بە دەروونناسییەوە ببەستنەوە، لەسەر ئەو بنچینەی کە چاوگەی کردە ئەقڵی و ویستراوەکان بریتییە لە هەست، بەو جۆرە دەتوانین مەنتق بگێڕینەوە بۆ سایکۆلۆژیای ئەقڵ و ئەخلاقیش بۆ سایکۆلۆژیای ویست، وێنەکانی بیر و یاساکانی دەچنە ژێر بینای دەروونی یان بینای هەستەوە.

---

[١] میتافیزیقیا: لقێکە لە فەلسەفە بەدوای حەقیقە بەرلیەکانی بووندا دەگەڕێت، ئەرەستۆ بە "فەلسەفەی یەکەم" ناوی دەبات، بۆ ئەو دیوی سروشت (مادە) بەکاردەهێنرێت، لەلای "کەندی" فەلسەفەی یەکەم و باسی پەروەردگارییە، لەلای "فارابی" بریتییە لە زانست بە بوون بەوەی لە هەبووندایە، لەلای "ئیبن سینا"بریتییە لە زانستی خودایی، لای "ئیبن روشد" بریتییە لە تێڕامان لە بوون بەوەی لە بووندایە هەموو ئەم پێناسانە بە دەوری یەك تەوەردا دەسوڕێنەوە ئەوەش بریتییە لەو بوونەی کە لە دەرەوەی جیهانی بەرهەستەوەیە و کەوتۆتە ناو جیهانی ژنەورلوەوە. انظر الموسوعة العربية الميسرة، ص١٧٩٥.

**٥. ئاراستەی ماتماتیکیانە:**

بەم دواییانە ئاراستەیەك سەریهەڵداوە کە پێداگری لەوە دەکات پەیوەندییەکی توندوتۆڵ بوونی هەبێت لە نێوان زانستی مەنتق و ماتماتیکدا، دەرئەنجامی ئەوە مەنتقی ماتماتیکیانە سەریهەڵداوە[1].

جێگەی داخە لە نێوان ئەم هەموو ئاراستەدا "ئاراستەی یاسایی" نابینینەوە کە رۆشنکردنەوەی پەیوەندی نێوان زانستی مەنتق و یاسا لەئەستۆ بگرێت، لەگەڵ ئەوەی بە باوەڕی من پەیوەندی ئەو دوانە لە هەر پەیوەندییەکی تری نێوان زانستی مەنتق و زانستەکانی تر بەهێزترە.

هەر ئەوەش بوو پاڵینام بۆ پێشکەش کردنی ئەم هەوڵە کەمە بۆ خێزانی یاساناسان بەو سیفەتەی کە هەندێك لە سەرەتاکانی مەنتق و یاسام بەدەستهێناوە[2]، بانگەشەی لێوەشاوەیی تەواو ناکەم بۆ وەفاداری بەم پابەندبوونە ئەدەبییەوە وەك ئەوەی پێویستە، بەلام دەوترێت: (ئەوەی هەمووی بەدەست نەهێنرێت کەمێکی واز لێ ناهێنرێت) بەپێی توانای خۆم هەوڵدەدەم لەم بابەتانە بکۆڵمەوە:

١- مەنتق و ئاماژەی دەقە یاساییەکان.

٢- مەنتق و شرۆڤەکردنی زاراوە یاساییەکان.

٣- مەنتق و دابەشکردنی بابەتە یاساییەکان.

---

(1) أنظر الدكتور علي عبدالمعطي محمد، المنطق ومناهج البحث العلمي في العلوم الرياضية والطبيعة، ص٤٣ وما بعدها.

الدكتور على سامي النشار، المنطق الصوري منذ أرسطو وتطوره المعاصر، ط١ ص٣٦ وما بعدها.

(2) لە نێوان ساڵەکانی ١٩٣٩-١٩٤١ لەسەر دەستی هەندێ لە مامۆستایانم لە زانایانی کوردی باکووری عێراق هەندێ کتێبی مەنتقم خوێندووە لەوانە: "شرح زكريا الانصاري على متن ليساغوجي في المنطق. وتهذيب المنطق للتفتازاني مع شرح الخبيصي وحاشية اليزدي، وتحرير القواعد المنطقية شرح رسالة الشمسية للعلامة قطب الدين الرازي، وكتاب البرهان للعلامة الكلنبوي" هەستام بە وتنەوەی ئەو مادانە لە قوتابخانە ئیسلامییەکانی پارێزگای سلێمانی لە ساڵانی ١٩٤٦-١٩٥٥، ئەوجا بووم بە ئەندامێکی خێزانی یاسایی ساڵی ١٩٦٠ لە کۆلێژی یاسا و سیاسەت(کۆلێژی مافی جاران)-زانکۆی بەغداد وەك فێرخوازێك، لە ساڵی ١٩٧٦ەوە بە پیشەی وانە وتنەوە خەریکم لە هەمان کۆلێژدا.

٤- مەنتق و تێکەڵی لە نێوان زاراوە یاساییەکاندا.

٥- مەنتق و ڕێسا یاساییەکان.

٦- مەنتق و بەڵگە قەزاییەکان.

ئەمەش لە شەش بەشدا بەپێی ئەو زنجیرە ئاماژەبۆکراوە.

# بەشی یەکەم

## مەنتق و ئامازەی دەقەکان

ناوەرۆکی ئەم بەشە بۆ دوو باس دابەش دەبێت:

یەکەمیان ئامازە و بەشەکانی.

دووەمیان: سروشتی ئامازەی دەقەکان لەسەر حوکمەکان.

# باسی یەکەم:
# ئاماژە و بەشەکانی

### ئاماژە:

بریتییە لە بوونی شتێك لە بارێك(حاڵێك)دا کە زانست پێی -لە دوای زانست بەو بار(حاڵ)ەی تێیدایە- زانست بە شتێکی تر پێویست بکات، یەکەمیان بریتییە لە ئاماژەکەر و دووەمیان بریتییە لە ئاماژەبۆکراو، حاڵەتەکەش بریتییە لە بنچینەی پێویستبوونی نێوانیان، گەر بارەکە دانانی بوو ئەوا ئاماژەکە دانانییە، گەر سورشتی بوو سروشتییە، گەر ئەقڵی بوو ئەقڵییە، بینا لەسەر ئەمە بەشەکانی ئاماژە بە ڕەچاوکردنی ئەو حاڵەتە شەش بەشە:

**١. ئاماژەی گوزارەیی دانانی:**

وەك ئاماژەی دانپیادانانی دانپیادانەر لە ڕووی یاسایی و شەرعییەوە لەسەر سەلماندن و جێگیر کردنی دانپیادانراو، گەر مەرجەکانی هاتنە دی، بە گوزارەیی ناودەبرێت، چونکە بنچینەگەی بریتییە لە گوزارشت کردن، هەروەها بە دانانی ناونراوە، چونکە وشەکە بۆ مانایەکی دیاریکراو دانراوە و بە شتێکی تر شرۆڤە ناکرێت و لێکنادرێتەوە لە دانپیادانانی کەسەکە و وەلامگۆییەکەیدا.

**٢. ئاماژەی گوزارەیی سروشتی:**

وەك ئاماژەی هەندێ وشە کە لێکۆڵەر ئاراستەی کەسی تۆمەتباری دەکات و لە دەروونیدا هەڵچوونی توند دروست دەکات لەبەر بوونی پەیوەندی بە بابەتی تاوانەکەوە و سەلماندنی تۆمەتە ئاراستەکراوەکە بۆی، بە ئاماژەیەکی گومانئامێز ئەگەری سەلماندنی پێچەوانەشی هەبێت{واتە ئەگەری ئەوە هەیە کەسەکە تاوانبار نەبێت} ، لێرەوە ئاماژەکە

بە "گوزارەیی" ناونراوە، چونکە لەو وشانەوە سەرهەڵدەدات کە لێکۆڵەر ئاراستەی تۆمەتباری دەکات، یان گوزارەگەلێك کە تۆمەتبار دەریدەبڕێت، هەروەها بە "سروشتی" نانراوە چونکە پەرچەکردار و هەڵچوونەکان بریتین لە دیاردەی سروشتی ئامازەکەر بۆ سەر شتێك بە سروشت.

٣. ئامازەی گوزارەیی نەقلی:

وەك ئامازەی دژ بە یەك و بەرهەڵستکار بە یەکتر لە وەڵامگۆیی شایەتەکاندا لە میانەی تۆمەتی ئاراستەکراو بۆ تۆمەتبارەکە لەسەر نەسەلماندنی ئەو تۆمەتە بە سەلماندنێکی قەناعەتپێکەر بۆ دادگای تایبەت، بە "ئەقلی" ناوبراوە، چونکە لە ئەنجامگیرییەکی ئەقڵییەوە بەرهەم هاتووە لەوەی لەناو وشە دژ بە یەکەکاندا دەسوڕێنەوە.

٤. ئامازەی ناگوزارەیی دانانی:

وەك ئامازەی هێماکانی هاتووچۆی نێودەوڵەتی و ناوخۆیی دانرلو لەسەر ڕێگەکان و شەقامە گشتییەکان بۆ سەر ئەو مانانەی لە یاسای هاتووچۆدا بۆیان دانراون.

٥. ئامازەی ناگوزارەیی سروشتی:

وەك ئامازەی گۆڕانی فسیۆلۆژی لەسەر سەلماندنی تۆمەتی ئاراستەکراو بۆ تۆمەتبار، فەیلەسوفی یۆنانی دامەزرێنەری زانستی مەنتق یەکەمین کەسێك بووە ئەو ئامازەی بۆ دۆزینەوەی تاوان بەکارهێناوە، لێدانی دڵی کەسی تۆمەتباری دەگرت لە وەڵامگۆییدا تاکو بزانێت ئایا کەسەکە لە قسەکانیدا راست دەکات یان درۆ، گەر لێدانی خێرابوو بە ئامازەیەکی سروشتی ئامازەی بە پەشۆکان و درۆی کەسەکە دەکرد، گەر لێدانەکەی ئاسایی بوایە ئامازە بوو بە پێچەوانەکەی، چینییە کۆنەکان برنجی وشکی نەکوڵاویان دەکردە دەمی کەسی تۆمەتبارەوە گەر بە وشکی لە دەمیدا بمایەتەوە لە دوای لێکۆڵینەوە دەکرایە بەڵگەیەکی ناگوزارەیی لەسەر ئەوەی کە تاوانبارە، پەیوەندی نێوان ئامازەکەر و ئامازەبۆکراو بریتی بوو لە سروشت، چونکە لە سروشتی لیکەڕژێنەکان ئەوەیە کە لەباری ئاساییدا لیك بڕژێنن و لەباری ترس و هەڵچوونیشدا لە رژان بکەون، ئەمە لە ئێستادا بەو ئامێرە دەچێت کە پێی دەوترێت "ئامێری پەردە لادان لەسەر درۆ" کە بۆ پێوانەی

هەناسەدانی تۆمەتبار بەکاردەهێنرێت یان بۆ پێوانەی فشاری خوێنی یان پلەی بەرگری پێستی بۆ تەوژمێکی کارەبایی کە لە کاتی لێکۆڵینەوە لەگەڵی لەسەری دەردەکەوێت[1].

٦. ئاماژەی ناکۆزارەیی ئەقلی:

وەك بەڵگەی ئەم گەربوونە مەزنە کە تاکو ئێستا ژێری گەربووننناسان تیایدا سەرسامە، لە کوێوە دەست پێ دەکات و لە کوێوە کۆتایی پێ دێت؟!! لەسەر بوونی دروستکەرێك– سبحانە وتعالی– ئەمە لە زانستی فەلسەفەدا پێی دەوترێت بەڵگەی "ئەگەری"، واتە ئاماژە بە ئەسەر لەسەر خاوەن ئەسارەکە، بەرانبەر بەمە بەڵگەی "بۆچەیی" راست دەبێتەوە کە ئاماژەیە بە خاوەن ئەسەر لەسەر بوونی ئەسەر، وەك ئاماژە بە ڤایرۆس و میکرۆب لە خوێندا دوای ئازمایش لەسەر بوونی نەخۆشییەکی دیاریکراو لەو کەسە نەخۆشەدا.

هەر بەو جۆرە هەندێ لە ئەسەری تاوانکاری بۆ سەلماندنی تۆمەتی ئاراستەکراو بۆ کەسی تۆمەتبار لە رێگەی بەڵگەهێنانەوەی ئەگەرییەوە(واتە بەڵگە هێنانەوە بە ئەسەر لەسەر بوونی خاوەن ئەسەر).

---

[1] لنظر الدكتور سلطان الشاوي، اصول التحقيق الاجرامي، ص٢٢٠.
الدكتور حسين محمد علي، الجريمة واساليب البحث العلمي، ص٢٨٧.
الدكتور سعد جلال، اسس علم النفس الجنائي علماً وعملاً، ص٣٨٩.
هەندێ جار لێکۆڵەر پەنا دەبات بۆ بینینەوەی رێگەی جۆرلوجۆر بۆ گەیشتنە بەڵگە کە بەهۆیەوە ئەنجامی لێکۆڵینەوەکە رادەگەیەنێت، لە ترساندن و تۆقاندن و سزای دەروونی یان جەستەیی کەسی تۆمەتبار، ئاماژە بە جۆری ئەو بەڵگەیە لەو حاڵەتەدا نەکراوە و باسی رادەی لاکردنەوە بە لایدا نەکراوە.

# باسی دووەم:
# سروشتی ئاماژەکانی دەق لەسەر حوکمەکان لەبەر رۆشنایی زانستی مەنتقدا

دەقە تەشریعی و یاساییەکان تێدەپەڕن بەسەر هەموو ئەو پەیوەندییانەی دەیگرنەخۆ و ئاماژە بە حوکمەکانی دەکەن بە یەکێك لەم شەش ئاماژە هاتووانە:

١. ئاماژەی گۆکراو
٢. ئاماژەی چەمکی کۆکی و تەبایی
٣. ئاماژەی چەمکی پێچەوانە
٤. ئاماژەی هێما
٥. ئاماژەی خوازیاری
٦. ئاماژەی نیمچە ئاماژە

لەبەر رۆشنایی رێساکانی زانستی مەنتقدا ئەم شەش ئاماژەیە دەگەڕێنەوە بۆ ئـەم سـێ ئاماژە مەنتقییە:

١. ئاماژەی پڕاوپڕی(یان پڕاوپڕە ئاماژە)
٢. ئاماژەی لەئامێزگرتن(یان ئامێزە ئاماژە)
٣. ئاماژەی پابەندبوون(یان پابەندبوونە ئاماژە)

وەك لەم رۆشنکردنەوەوە روون دەبێتەوە:

**یەکەم - پڕاوپڕە ئاماژە:**

ئەوەش بریتییە لە ئاماژەی گوزارەی دەق لەسەر تەولوی ئەو مانایەی بـۆی دانـراوە لـە رووی زمانەوە یان لە رووی شەرعەوە یان لە رووی عورفەوە، گەر بۆ دەقەکە گوزارەلێدراو و

تێگەیشتن بوونی هەبوو ئەوا ئاماژەی گوزارەی دەق لەسەر هەردووکیان پڕاوپڕییە(واتە ئاماژەکەر پڕاوپڕە لەگەڵ ئاماژەبۆکراو نە لێی زیادە و نە لێی کەمە)

**دووەم -ئامێزە ئاماژە:**

ئەوەش بریتییە لە ئاماژەی گوزارەی دەقەکە بۆ سەر هەندێ لە مانا بۆدانراوەکەی[1] لە ئامێزی هەموودا.

ئەم دوو ئاماژەیە(پڕاوپڕی و ئامێزگری) لە مادەی (٢٣٧) لە یاسای سزا میسرییەکانی جێبەجێکار کە دەقەکەی هاتووە: (هەر کەس لەناکاو کەوت بەسەر هاوسەرەکەیدا لە باری زینادا و هەردووکیانی کوشت، ژنەکە و ئەو کەسەی زینای لەگەڵ دەکات، بە بەندکردن سزا دەدرێت لە جێگەی سزا بڕیار لەسەردراوەکان لە مادەی (٢٣٢ و ٢٣٦)).

ئەم دەقە بە گوزارەی خۆی ئاماژە دەکات بە سووککردنی سزای کوشتن بە لەسێدارەدان یان بەندکردنی هەتاهەتایی یان کارکردنی سەختی هەتاهەتایی یان کاتی بۆ سزای بەندکردنی کاتی(واتە ماوەیەك کە لە پێنج ساڵ تێنەپەڕێت)

هەروەها بە تێگەیشتنەکەی –لە دەروازەی لەپێشتر– ئاماژە دەکات بە سووککردنی سزای کەتئەندامی هەمیشەیی گەر پیاوەکە کەسی زیناکەری تووشی ئەو کەتئەندامییە کرد لە جێگەی کوشتن، هەروەها ئاماژە دەکاتە سەر سووکرکردنی سزای دەستپێکردنی تاوان گەر شوێنەوار شارلوە بوو بەهۆیەك لە هۆیەکانەوە کە ناگەڕێتەوە بۆ ویستی کەسەکە.

ئەم "مادە میسرییە"م بۆیە باس کرد، چونکە یاسای سزا عێراقییەکانی جێبەجێکار لە مادەی (٤٠٩) باری کەتئەندامی هەمیشەیی کردووە بە گوزارشتی دەقەکە، بۆیە راشکاوانە باسی کردووە، بەڵام دیسان دەقە عێراقییەکە بە تێگەیشتنی پێکهاتن(تەبایی) ئاماژە دەکاتە سەر سووککردنی سزای دەسکردن بە تاوان گەر لەناکاو ژنەکەی یان یەکێك لە کەسە مەحرەمەکانی لەباری زینادا ببینێت یان لەناو یەك پێخەفدا بیانبینێت، کەسەکە دەستی بە

[1] مانای "بۆ دانراو" گونجاوترە، چونکە مانای "بۆ دانراو" بوونی مانای بۆ دانراو بۆ جگە لە ئەو دەگەیەنێت، ئەوەش ئەوەیە کە بێژەر مەبەستی نەبووە.

کوشتنیان کرد و شوێنەوارەکە راگیرا یان شارایەوە بەهۆیەکەوە کە نەدەچووە ژێر ویستی ئەوەوە[1].

لەم دوو مادە میسری و عێراقییەدا "ئاماژەی لەپێشتر" لەسەر کۆی گوزارەلێدراو(سووککردنی سزای کوشتن) و تێگەیشتنی(سووك کردنی سزای کەتئەندامی و دەستکردن بە تاوان) ئاماژەیەکی پڕاوپڕییە، ئاماژەی دووەم لەسەر کۆی گوزارەلێدراو(سزای کوشتن و کەتئەنام کردن) و تێگەیشتنی (سزای دەستکردن بە تاوان) ئاماژەیەکی پڕاوپڕییە، هەروەها ئاماژەی هەریەك لەو دوانە بۆ سەر تەنها گوزارەلێدراو یان تەنها تێگەیشتن لە ئامێزی هەموودا ئاماژەیەکی ئامێزگرانەیە[2].

شایانی باسکردنە ئاماژەی دەقەکە بۆ تێگەیشتنی پێکهاتن(تەبایی) ئاماژەیەکی گوزارەیی دانانی یاساییە یان شەرعییە، نەك ئاماژەیەکی ئیجتیهادی ئەقڵی پێوانەیی، ئەمەش بینا لەسەر بنەمای شەرعی(تاوان و سزا تەنها بە دەق بوونیان هەیە)

ئەم ئایەتە: ﴿إِنَّ الَّذِينَ يَأْكُلُونَ أَمْوَالَ الْيَتَامَى ظُلْماً إِنَّمَا يَأْكُلُونَ فِي بُطُونِهِمْ نَاراً وَسَيَصْلَوْنَ سَعِيراً﴾[3] بە گوزارشتی خۆی ئاماژە دەکات بۆ حەرام کردنی خواردنی ماڵی هەتیو بە زۆر و ستەم، هەروەها بە تێگەیشتن ئاماژە دەکات بە حەرام کردنی تیابردنێك زیان بە ماڵەکەی بگەیەنێت، جۆری تیابردنەکە و سروشتەکە هەر چۆنێك بێت، هەروەها ئاماژە کردن بە تەنها یەکێك لەو دوانە لە ئامێزی هەموودا ئاماژەیەکی ئامێزگرانەیە.

### سێیەم- پابەندکردنە ئاماژە

ئەوەش بریتییە لە ئاماژەی دەق بە ئاماژەیەکی ئەقڵی پابەندکردنی لەسەر حوکمێکی پێویستی راستەوخۆ بۆ گوزارەی دەق یان تێگەیشتنەکەی بە جۆرێك زەینی قازی لە زانست بە گوزارەلێدراو یان تێگەیشتنەکەوە دەگوێزێتەوە بۆ حوکمە پێویستە راستەوخۆکە، وەك ئاماژەی وشەی "گرێبەست" لەسەر کۆی گفت و قبووڵ کردن بە ئاماژەیەکی پڕاوپڕی،

---

[1] انظر المواد (٣٠، ٣١، ٣٢، ٤٠٥، ٤٠٦، ٤٠٩، ٤١٢) من قانون العقوبات العراقي النافذ رقم (١١١) لسنة ١٩٦٩.

[2] وەك لەو بارەدا کە تاوانەکە تەنها کوشتن بێت یان کەتئەندام کردن بێت یان دەستکردن بە تاوانەکە بێت یان کوشتن بێت بۆ یەکێکیان و کەتئەندام کردن و دەستکردن بە تاوان بێت بۆ یەکێکی تریان.

[3] سورة النساء/ ١٠.

هەروەها ئاماژە بە تەنها یەکێکیان لەئامێزی هەموودا بە ئاماژەیەکی ئامێزگرانە، هەر بەو جۆرە ئاماژە بۆ کۆی مافەکان و ئەرکەکانی سەرهەڵدراو لە گرێبەستەکەوە بە ئاماژەیەکی پابەندکەرانە.

چوار ئاماژەکەی تری دەقەکان(واتە جگە لە گوزارەلێدراو و تێگەیشتن) دەگەڕێنەوە بۆ ئاماژەی پابەندکردنی ئەقڵی وەك لەم روونکردنەوانەدا هاتووە:

### ١. ئاماژەی تێگەیشتنی پێچەوانە:

گەر یاسادانەر لە دەقەکەدا کۆتوبەندێکی بەهەندگیراوی لە حوکمەکەدا باس کرد بەجۆرێك بە بوون و نەبوون لەگەڵی بسوڕێتەوە، گەر کۆتوبەندەکە هاتە دی، ئەوا قازی گوزارەلێدراوی دەقەکە پیادە دەکات، واتە ئەوەی دەقەکە بە ئاماژەیەکی پڕاوپڕی ئاماژەی پێ دەکات لەبارێکدا تێگەیشتنی ڕێکەوتن(تەبایی) و ئاماژەی ئامێزگری –کاتی بوونی تێگەیشتنی ڕێکەوتن بۆی– بوونیان نەبوو، گەر کۆتوبەندەکە نواکەوت، ئەوا قازی تێگەیشتنی پێچەوانە پیادە دەکات، ئەوەش ئەو حوکمەیە دەقەکە ئاماژەی پێ دەکات بە ئاماژەیەکی پابەندکردنی ئەقڵی و پێچەوانە دەبێت لەگەڵ حوکمی پەیوەستبوو بە کۆتوبەندەکە، بە جۆرێك زانستی قازییەکە بە سوڕانەوەی حوکمەکە لەگەڵ کۆتوبەندەکەدا بە بوون و بە نەبوون زانستی ئەو پێویست دەکات بە پێویستبوونی پیادە کردنی حوکمی پێچەوانە لە باری نواکەوتنی کۆتوبەندەکەدا.

مادەی (١/١٢٩) لە یاسای مەدەنی عێراقی جێبەجێکار دەقەکەی دەڵێت: (دروستە جێگەی پابەندبوون نەبوو بێت لە کاتی گرێبەستەکەدا گەر لە داهاتوودا بەدەستهێنانی گونجاو بوو، هەروەها دیاری کرابێت بە دیاری کردنێکی تەواوی نەرێکەر بۆ نەزانی) بە گوزارەی خۆی ئاماژە دەکات بە ئاماژەیەکی پڕاوپڕی لەسەر دروستیی نەبوونی جێگەی پابەندبوون لە کاتی سەرهەڵدانی دەقدا، گەر ئەو دوو کۆتوبەندە بوونیان هەبێت: (گونجاویی بەدەستهاتن و دیاریکردنێك نەرێی نەزانی بکات)، بە تێگەیشتنی پێچەوانە ئاماژە دەکات بۆ ئاماژەی پابەندکردنی ئەقڵی لەسەر دروستنەبوونی ئەو گرێبەستە گەر یەکێك لە دوو کۆتوبەندەکە یان هەردووکیان نواکەوت.

مادەی (٤٥٩) لە پرۆژە یاسای مەدەنی عێراقی نوێ بە گوزارەی خۆی ئاماژە دەکاتە سەر: (هەر کەس ماڵی کەسانی تر بەکاربهێنێت بەبێ حەقێك ئەوا پابەند دەبێت بە

باریووکردنەوە) بە تێگەیشتنی پێچەوانە ئامـاژە دەکاتـە سـەر ئـەوەی هـەر کـەس مـاڵی کەسانی تر بە حەق بەکاربهێنێت پابەند نابێت بە باریووکردنەوەوە.

**٢. ئامارژەی هێماکردن( پێویست و پێویستکراو)**

ئـەوەش بریتییـە لـە ئامـاژەی دەق بـە ئامـاژەکردنێکی پابەنـدکردنی ئـەقڵی لەسـەر حوکمێکی بە مەرامنەگیراو لە بنەڕەتەوە لە دەقەکەدا، بـەلآم بـۆ حـوکمی ئامـاژەبۆکراو بـە پێویستبوونێکی ئەقڵی پێویستە، مادەی (١/٣٧٨) لە یاسای سزا عێراقییەکان جێبـەجێکار بە گوزارەکەی ئامارژە دەکات لەسەر ئەوەی: (دروست نییـە دلوای زینـاکردن بجوڵێنرێـت دژ بە یەکێك لە دوو هاوسەرەکە یان گرتنەبەری هەر ڕێکارێك تیایدا مەگەر بینا لەسەر سـکالآی هاوسەرەکەی تر) ئەم دەقە ئامارژە دەکـات بـە ئامارژەیـەکی هێمایی(ئامـاژەی پابەنـدبوونی ئەقڵی) لەسەر ئەوەی کە تاوانی یەکێك لە دوو هاوسەرەکە دەستدرێژی کردنە بۆ سەر مـاف تایبەتی هاوسەرەکەی تر، هەر بەو جۆرە مادەی (١/٣٧٩) بـە گوزارەکـەی ئامـاژە دەکاتـە سەر ئەوەی کە (هاوسەری بێگوناه دەتوانێـت جێبـەجێ کردنـی حـوکمی دەرچـوو لەسـەر هاوسەرەکەی رابگرێت) دیسان بە ئامارژەیەکی هێمایی(ئامارژەی پابەندبوونی ئەقڵی) ئامـاژە دەکات لەسەر هەمان حوکمی پێشوو (تاوانەکە دەستدرێژی کردنـە بـۆ سـەر مـاف تایبـەت) پێچـەوانەی ئـەوەی شـەریعەتی ئیسـلام دانـی پیـادا دەنێـت کـە تـاوانی زینـا بـە تـاوانی سنووریەزێنی دادەنێت و دەستدرێژی کردنە بۆ سەر ماف گشتی(ماف کۆمەڵگە لە ئـەخلاق و ئـاداب و بەهاکانیـدا)، هـەر یـەکێك لـە ئەنـدامانی ئـەو کۆمەڵگەیـە مـافی ئـەوەی هەیـە داوا بەرزبکاتەوە گەر تاوانەکە دوویـارە دەبوویـەوە یـان گەیشـتە رادەی بێڕێـزی بـە ئـەخلاق و ئاداب و ئایین، بەلآم گەر بۆ یەکەمجار بێت ئـەوا شـەریعەتی ئیسـلام فـەرمان بـە داپۆشـین دەکات بۆ پارێزاری لە ئـابرووی خێـزان، پێغەمبـەر(ﷺ) دەفـەرموێت: (هـەر کـەس براکـەی بپۆشـێت خـودا لـە ڕۆژی دواییـدا دەیپۆشـێت)، پاشـان سـزای تـاوانی زینـا لـە سـزا سنووریەزێنییەکانە و سوڵح و لێبووردن و سووککردن و قورس کردن و ئاڵوگۆڕ قبووڵ ناکات لە هیچ دەسەڵاتێکی تاکەکەسی و کۆمەڵەوە.

### ٣. ئاماژەی خوازیاری:

ئـەوەش بریتییـە لـە ئامـاژەی دەق بـە ئاماژەیـەکی پابەنـدکردنی ئـەقڵی لەسـەر پێویستبوونی خستنە سەری کۆتوبەندێك لەلایەن قازییەوە بۆ دەقی بەهەندگیراو بە پیادەکردن تاکو ئاماژە بکات بە مەرامی یاسادانەر یان مانای دروستی دەقەکە، ئەم خستنە سەرە کە دەقەکە خوازیارییەتی یاسادانەر بە راشکاوی باسی ناکات جا یان بەهۆی رۆشنی و ئاسانی پەیپێبردنی یان بەهۆی پەینەبردن بە گرنگییەکەی لە کاتی ئامادە کردنی پرۆژەکەدا و پەسەندکردن لە سەری.

مادەی (٨٨٠) لە یاسای مەدەنی عێراقی نوێ بە گوزارەکەی ئاماژە دەکات لەسەر ئەوەی کە: (بۆ بریکارگر هەیە لە هەر کاتێکدا بریکارەکەی لەکار بخات یان بریکارییەکەی سنووردار بکات) هەروەها بە ئاماژەی خوازیاری ئاماژە دەکات ((ئاماژەی ئەقڵی پابەندبوونی)) لەسەر ئەوەی کە پیادەکردنی بە شێوەیەکی دروستی دادپەروەر دوای خستنەسەری کۆتوبەندێك دەکات، ئەویش((مەگەر مافی خەڵکانی تر پەیوەست بێت بە بریکارنامەکەوە یان لە بەرژەوەندی بریکارەکە دەرچوو بێت)) چونکە لە باری پەیوەستبوونی مافی کەسانی تر بە بریکارنامەکەوە یان دەرچوونی لە بەرژەوەندی وەکیلەکە دروست نییە بریکارگر بە ویستی تاکەکەسی خۆی بریکارەکەی کەنارگیر بکات یان بریکارنامەکە سنووردار بکات، بەڵکو بریکارییەکەی بە بەرکاری دەمێنێتەوە سەرباری کەنارگیرکردنی بریکارەکە.

بۆ نموونە: گەر ژنەکە لە کاتی هاوسەرگیریدا بە مەرجی گرت کە مێردەکەی بیکات بە بریکار بۆ تەڵاقدانی خۆی گەر مێردەکەی ژنێکی تری بەسەردا هێنا پاشان کردی بە بریکار وەك وەفایەك بەو پابەندبوونەوە بەپێی مادەی(٣/٦) لە یاسای باری کەسێتی جێبەجێکار[1] ئەوا مافی مێردەکە نییە لەو بریکارییە ژنەکە کەنارگیر بکات، چونکە بۆ بەرژەوەندی ئەو(ژنەکە) دەرکراوە، ئەمەش فەقیهە مالیکییەکان دانیان پیادا ناوە[2].

---

[1] مادەی ٣/٦: (ئەو مەرجە رەوانەی کە لە دوتوێی گرێبەستی هاوسەرگیریدا بە مەرج دەگیرێن پێویستە وەفاداریان پێ بکرێت)

[2] الدسوقي على الشرح الكبير ٤٠٦/٢ وما بعدها. شرح الخرشي ٦٩/٤ وما بعدها.

زۆرێك له پیاده‌كاری له كێشه مه‌ده‌نییه‌كاندا له‌م باره‌یه‌وه بوونیـان هه‌یـه، له‌وانـه گـه‌ر كۆمه‌ڵێك هاوكار له كۆبه‌شدا یه‌كێك له هاوكاره‌كانیان كرد به بریكار له بـه‌ڕێوه‌بردنی دارایـی هاوبه‌شدا، ئـه‌و بریكارییـه تـه‌نها لـه به‌رژه‌وه‌نـدی هاوكاره‌كانـدا نییـه بـه تـه‌نها، بـه‌ڵكو لـه به‌رژه‌وه‌نـدی بریكاره‌كه‌شـیانه، هـه‌ر بـه‌و جـۆره گـه‌ر كه‌سـێكی دڵنیابۆكراو(بیمـه‌بۆكراو) شه‌ریكه‌ی بیمه‌ی كرد به بریكار له داوایه‌كیدا كه لێیه‌وه به‌رز ده‌كرێته‌وه یان له‌سـه‌ری بـه‌رز ده‌كرێته‌وه به‌هۆی مه‌ترسی دڵنیاپێكه‌ره‌وه(بیمه‌پێكه‌ر)، ئـه‌و بریكارییـه لـه‌و گریمانـه‌دا بـۆ به‌رژه‌وه‌ندی بریكاره‌كه‌یه كه كومپانیای بیمه‌كه‌یه، بریكارییش بۆ به‌رژه‌وه‌ندی كه‌سـانی تـر وه‌ك ئه‌وه‌ی كه‌سێك كه‌سێكی تر بكات به بریكار بۆ فرۆشتنی خانوویه‌كی خۆی و وه‌رگرتنی نرخه‌كـه و وه‌فـاداری قـه‌رز لـه ئه‌سـتۆیدا بـۆ كه‌سـانی تـر لـه‌و نرخـه، ئـه‌م بریكارییـه لـه به‌رژه‌وه‌ندی كه‌سانی تره ئه‌وه‌ش قه‌رزده‌ره‌كه‌یه.

زۆرینه‌ی یاسا مه‌ده‌نییه‌كان ئه‌م كۆتوبه‌نده‌یان راشكاوانه بـاس كـردووه له‌وانـه یاسـای مه‌ده‌نی میسری جێبه‌جێكار ماده‌ی (٢/٧١٥) كه ده‌قه‌كه‌ی ده‌ڵێت: ((گه‌ر بریكارنامه‌كه لـه به‌رژه‌وه‌ندی بریكاره‌كه یان به‌رژه‌وه‌ندی بیانی بوو، ئه‌وا دروسـت نییـه بریكـارگر بریكـاریی بریكاره‌كـه‌ی كۆتـایی پـێ بهێنێـت یـان سـنوورداری بكـات بـه‌بێ رازیبـوونی ئـه‌و كه‌سـه‌ی بریكارنامه‌كه له به‌رژوه‌ندی ده‌ركراوه)) [1]

## ٤. ئامازی هێمابۆكردن:

ئه‌وه‌ش بریتییه لـه ئامـاژه‌ی ده‌قـی په‌یوه‌نـدبوونی ئـه‌قڵی له‌سـه‌ر حیكمـه‌تی یاسـارێژی حوكمه ده‌ق له‌سـه‌ر هاتووه‌كـه، ئـه‌م ئامـاژه یارمـه‌تی قـازی ده‌دات بـۆ پیـاده‌كردنی ده‌ق به‌وه‌ی داپه‌روه‌ری ته‌ولو ده‌سته‌به‌ر بكـات، مـاده‌ی (٤٠٦) لـه یاسـای سـزا عێراقییـه‌كانی جێبه‌جێكار ئاماژه ده‌كات به ئاماژه‌یه‌كی گوزاره‌یی له‌سه‌ر ئه‌وه‌ی كه سزای تاوانی كوشـتن رێكه‌وت له‌گه‌ڵ ره‌وشێك له ره‌وشه توندەكانی هاتوو تیایدا له سێداره‌دانه، هه‌روه‌ها ئامـاژه ده‌كات به ئاماژه‌یه‌كی هێمایی كه حیكمه‌ت له یاسارێژی ئه‌و سزا توندە بریتییه له ترسناكی كه‌سی تاوانكار له‌سه‌ر كۆمه‌ڵگه كه په‌رده‌ی له‌سه‌ر تاوانه‌كه‌ی لاداوه.

---

[1] انظر السنهوري، الوسيط ٦٦٧/٧.

دوای خستنەڕووی ئەم پوختەیە بۆ ئاماژەی دەقەکان و سروشتیان هەڵەی مادەی یەکەم لە یاسای مەدەنی عێراقی جێبەجێکار و مادەی یەکەمی برۆژە یاسای مەدەنی نوێمان بۆ روون دەبێتەوە، هەروەها مادەی یەکەم لە هەموو یاساکانی دەوڵەتە عەرەبییەکان، لەوانە یاسای مەدەنی میسری... مادەی یەکەمی ئەم یاسایە دەقەکەی دەڵێت: ((دەقە تەشریعییەکان بە گوزارە و ناوەرۆکیانەوە جێبەجێ دەبن بەسەر هەموو ئەو پەیوەندییانەی کە دەیگرنەوە))

**رووی هەڵە:**

١. دەقەکان بە گوزارەکانیان بەسەر پەیوەندییەکاندا جێبەجێ ناکرێن، چونکە وشەکان قاڵبی رووتن، بەڵکو بە گوزارشتکردن و تێگەیشتن لێیان.

٢. دەربڕینی "بە ناوەرۆکیان" تەنها یەك وێنە لە ئاماژەی دەقەکان دەگرێتەوە، ئەوەش ئەوەیە کە هۆی حوکمەکە لە بێدەنگلێکراودا بەهێزتر بێت لە گوزارەلێدراو، وەك لەم ئایەتەدا: ﴿فَلاَ تَقُل لَّهُمَا أُفٍّ﴾ بە گوزارەلێدراو ئاماژە دەکات بۆ حەرام کردنی ئۆفکردن لە دایك و باوك بەهۆی ئەو ئازارەوە کە تێیدایە، هەر بەو جۆرە –لە دەروازەی لەپێشتر– ئاماژە دەکاتە سەر حەرام کردنی لێدان و جنێوپێدان... و شتانی تریش کە ئازاری زۆرتر و توندتری لە ئازاری ئۆفکردن تێدایە، ئەم حاڵەتە وێنەیەکە لە وێنەی تێگەیشتنی تەبا(کۆك)، بینا لەسەر ئەمە دەقە مەدەنییەکان جێبەجێ نابن بەسەر ئەو پەیوەندییانەی دەستی بۆ دەبەن مەگەر تەنها لەم ئاستە بەرتەسکەدا، ئەمەش هەڵەیەکی تەشریعییە، بۆیە بۆ ئەندامانی بەڕێزی لیژنەی ئامادە کردنی پرۆژە یاسای مەدەنی نوێ ئەوەم خستە روو لە کاتی گفتوگۆی راستکردنەوەی مادەی یەك کە بەم جۆرەیە: ((دەقە تەشریعییەکان بە گوزارەکردن و تێگەیشتنیان بەسەر هەموو ئەو پەیوەندییانەدا جێبەجێ دەبن کە دەیگرنەوە)).

رجام وایە خستنەڕوو و پێشنیارەکەم جێگەی قبووڵ کردن بێت.

زانایانی مەنتق پەیبردنی مرۆڤیان بۆ وێناکراوەکان و بەڕاستزانینەکان بۆ دوو بەش دابەش کردووە، پاشان هەر بەشێك لەمانەیان دابەش کردووە بۆ بەڵگەنەویستەکان و تێڕامانییەکان(بەدەستهێنراوەکان)، بۆیە دەڵێن: وێنەی بەدەستهاتووی شتێك لای ئەقڵی مرۆڤ گەر پەیبردن بێت بۆ ڕێژەیەکی تەواوی هەواڵدەری(ڕاگەیاندن) لە ڕێگەی ملکەچبوونەوە ئەوە بریتییە لە "بەڕاستزانین"، ئەگەر نە، بریتییە لە "وێناکردن"، "تێڕامان"یش بریتییە لە بەدەستهێنانی نادیار لە دیارەوە، وێناکردنی زانراو کە مرۆڤ وێناکردنێکی نادیاری پێ بەدەست دەهێنێت پێی دەوترێت پێناسە(وتەیەکی لێکدەرەوە یاخود شرۆڤەکەر)، ڕەگەزەکانی بریتین لە "پێنج هەمووەکییە زانراوەکان" جا یان بە بەداهەت(تێگەیشتنی خێرا و ڕاستەوخۆ) یان بە "بەدەستهێنان"[1] "بەڕاستزانینی زانراو"یش کە ئەقڵی مرۆڤ دەگەیەنێتە بەڕاستزانینی نادیار پێی دەوترێت بەڵگە، ڕەگەزەکانیشی بریتین لە پرسەکان(بابەتەکان) لە پێشەکییە زانراوەکانەوە لەلای کەسی بەڵگەهێنەرەوە.

هەروەها دەڵێن: هەڵە لە هەردوو بەدەستهاتووەکەی "وێناکردن و بەڕاستزانین"ەوە ڕوو دەدات، بۆیە دەبێت یاسایەك هەبێت زەینی بیرکەرەوە لە هەڵە بپارێزێت ئەوەش بریتییە لە زانستی مەنتق، کە بابەتەکەی بریتییە لە: زانیاری وێناکراوی و بەڕاستزانینی.

ئامانجەکەشی: پارێزگاری مرۆڤ لە هەڵە لەناو بیرکردنەوەدا لە کاتی پێناسە و شرۆڤەی زاراوەکان و بەڵگەهێنانەوە لەسەر دەرئەنجامە تێڕامانی و نابەدیهییەکان.

لێرەدا بنەمای وێناکردن(پێنج هەمووەکییەکان) و مەرامە وێناکراوەییەکان (پێناسەکان) باس لێوە دەکەین، بۆ هەر یەکێك لەم بنەما و مەرامانە باسێك تەرخان دەکەین.

---

[1] الكلنبوي، البرهان ص١١ وما بعدها.

# باسی یەکەم:
# بنەما وێناکراوەییەکان

بنەما وێناکراوەییەکان بریتین لە پێنج هەمووەکییەکان: ((رەگەز، جۆر، پۆل، لابەلای تایبەت، لابەلای گشتی))

**١. رەگەز:**

ئەوەش سیفەتێکە بەشێك لە راستەقینەی شتێکی بڕیار بەسەردادراو دەنوێنێت، ئەو سیفەتە لە ناو ئەو شتە و شتانی تردا دەبینرێتەوە، بەوە پێناسە دەکرێت کە هەمووەکییە جۆری هەمەچەشن لە راستەقینەیان هەڵدەگرێت، وەك "تاوان" ئەمە رەگەزێکە لە ژێریدا جۆرەکانی تاوان جێیاندەبێتەوە(تاوانی دەستدرێژی بۆ سەر کەسەکان، دەستدرێژی بۆ سەر ماڵ و سامان، دەستدرێژی بۆ سەر شەرەف و ناموس، تاوانی سیاسی و ئابووری، شتانی تریش..)

ئەم رەگەزە هەموو جۆرێك لەو جۆرانە دەگرێتەوە، بۆیە دەوترێت کوشتن تاوانە، دزی تاوانە، سوکایەتی بە ناموس تاوانە، قاچاخچێتی تاوانە..

**٢. جۆر:**

ئەمەش هەمووەکییە و چەندین شێوە لەژێریدا جێگەی دەبێتەوە، شێوەکان لە راستەقینەیاندا کۆك و تەبان، بەڵام لە سیفەت و جیاکەرەوە و بەرجەستەیاندا لەیەکتر جیاوازن، وەك "کوشتن" ئەمە جۆرێکە لە جۆرەکانی تاوان و هەموو جۆرەکانی کوشتن لەژێریدا جێگەیان دەبێتەوە: (کوشتنی ئەنقەستی دوژمنکارانە، کوشتنی بەهەڵە، کوشتنی بەرگری کردن لە خۆ... جۆرەکانی تری)

ئەم شێوانە یەك راستەقینەیان هەیە ئەوەش بریتییە لە مراندنی رۆح، بەڵام بۆ هەر شێوەیەك سیفەت و جیاکەرەوە و تایبەتمەندی خۆی هەیە و وا دەکات لە یەك جۆر سزادا

یەك نەگرنەوە و دروست نییە بە یەك بڕیار بڕیار بەسەر هەمووان‌دا دەربکرێت.

هەر بەو جۆرە "گەنم" جۆرێکە لە ڕەگەزی دانەوێڵە، و هەموو شێوەکانی گەنم لەژێریدا جێگەیان دەبێتەوە، خورما جۆرێکە لە ڕەگەزی بەروبووم و هەموو شێوەکانی خورما لەژێریدا جێگەیان دەبێتەوە، کە لە سیفەت و جیاکەرەوە و تایبەتمەندییاندا جیاوازن با لە یەك راستەقینەشدا کۆك و تەبا بن.

بینا لەسەر ئەم جیاوازییە ڕۆشنە لە نێوان هەر یەك لە "ڕەگەز و جۆر و شێوە"دا مادەی (١١٧) لە پرۆژە یاسای مەدەنی نوێ بە مادەیەکی ناتەندروست و نا مەنتقی دادەنرێت، چونکە تێکەڵی لە نێوان جۆر و پۆلدا دروست کردووە، بە جۆرێك دەقەکەی دەڵێت: ((داراییە هاوشێوەییەکان لەو جۆرانەن کە تەنها بە جۆرەکەیان دیاری دەکرێن و هەندێکی لە جێگەی هەندێکی تری راست دەبێتەوە))، ئەمە هەڵەیە، دروست ئەوەیە دارشتنی مادەکە بەم جۆرە بێت: ((داراییە هاوشێوەییەکان لەو جۆرانەن کە تەنها بە شێوەکەیان دیاری دەکرێن و هەندێکی لە جێگەی هەندێکی تری راستدەبێتەوە)).

ئەوەی ئاشکرایە شێوەیەك لە خورما هەیە نرخی کیلۆیەکی لە ئێستادا لە دینارێك کەمتر نییە، هەر بەو جۆرە شێوەی تری هەیە لە چارەکە دینارێك زیاتر نییە، گەر شوێن و جێی قەرزدار بریتی بێت لە شێوەی یەکەم، ئایا بە شێوەی دووەمیان وەفای کردووە بە گێڕانەوەی قەرزەکەی؟ وەڵامەکەی نەخێر، ئەگەر ڕێکەوتنێکی پێشوەختە لە نێوانیاندا نەبێت، لەگەڵ ئەوەش ئەم مادەیە ئەو مافەی پێ دەدات بەو بیانووەی کە هەموو شێوەکانی خورما یەك جۆرن، یەك جۆرێك هەندێکی لە جێگەی هەندێکی تری راست دەبێتەوە لە پێدانەوەی قەرزدا، ئەوەش دادپەروەری و یەکسانی داواکراو قبووڵی ناکات لە پابەندبوونە داراییە ئاڵوگۆڕەکاندا.

### ٣. پۆل:

ئەمەش خودییە لە خودییەکانی جۆر و بەشێکە لە راستەقینەی، چونکە هەر جۆرێك لە جۆرەکانی بوونەوەر لە دوو توخم پێکدێن: ڕەگەز و پۆل.

ئەرکی پۆل جیاکردنەوەی جۆرە لە جۆرەکانی تر کە لە یەك ڕەگەزدا لەگەڵی هاوبەشن، گەر وتمان: ((مرۆڤ بوونەوەرێکی زیندووی قسەکەرە بە سروشت)) توخمی

یەکەم(بوونەوەرێکی زیندووە)[1] رەگەزێکە مرۆڤ و زیندەوەرانی تر دەگرێتەوە، توخمی دووەم(بە سروشت قسەکەرە) مرۆڤ لە هەموو ئەوانە جیادەکاتەوە کە لە توخمی یەکەمدا لەگەڵی هاوبەشن.

**٤. لابەلای تایبەت:**

ئەمەش سیفەتێکی ناخوبیە و ناچێتە ناو راستەقینەی شتێکی بەو سیفەتە بڕیار بەسەردادراو، بەلاَم جیایدەکاتەوە لەو شتانەی پێیان وەسفناکرێت، وەك بیرمەند(بیرکەرەوە) بە سروشت تایبەتە بە مرۆڤ، سیفەتی بیرکردنەوە بەشێك نییە لە راستەقینەی مرۆڤ بەلاَم جیای دەکاتەوە لە هەر بوونەوەرێك کە ئەو وەسفەی بۆ جێگیر ناکرێت کاتێك کە دەڵێین مرۆڤ بوونەوەرێکی بیرکەرەوەیە.

**٥. لابەلای گشتی:**

ئەمەش سیفەتێکی ناخوبیە لە راستەقینەی شتێکی بڕیار بەسەردادراو بەو سیفەتە، بەڵکو لە تاکەکانی و تاکەکانی ئەوانی تردا دەستەبەر دەبێت، وەك وەسفی هەناسەدان کە لابەیەکی گشتییە و مرۆڤ و بوونەوەرە زیندووەکانی تری پێ وەسف دەکرێت، بەلاَم بەشێك نییە لە راستەقینەیان و خودێك لە خودەکانیان.

ئەم پێنج هەمووەکیە بریتین لە بنەمای وێناکردن کە رەگەزی پێناسەی هەموو شتێکیان لێوە هەڵدەبژێررێت، یەکەمین سێ دانەیان(رەگەز، جۆر، پۆل) لە خودی شتەکاندان، دوو دانەکەی دواییان لە لابەلاکان و وەسفەکانن[2]، دروست نییە پێناسە بەو دوانە بکرێت مەگەر بەدەستهێنانی خوبیەکان لە سێ دانەی یەکەمەوە سەخت و دژوار بێت، وەك لە باسی داهاتوودا دێت.

---

[1] گیانداران بۆ زیندوو و نازیندوو دابەش دەبن، بوونەوەرە زیندووەکان و گیانداران و رووەکەکان دەگرێتەوە، گیاندارانیش قسەکەر بە سروشت کە بریتییە لە مرۆڤ و ناقسەکەر و قسەکەر بە راهێنان دەگرێتەوە

[2] الكلنبوي: البرهان ص٦٩ وما بعدها.

العلامة التفتازاني/ تهذيب المنطق مع شرح الخبيصي وحاشية الدسوقي ٨٩ وما بعدها.

العلامة زكريا الانصاري: شرح ايساغوجي في المنطق ص٢٠ وما بعدها.

# باسی دووەم:
# مەرامەکانی وێناکردن

مەرامەکانی وێناکردن لە زانستی مەنتقدا بریتین لە پێناسەکان(زانیارییە وێناکراوەییەکان) کە نەزانراوە وێناکراوەییەکانیان پێ دەدۆزرێنەوە.

بۆ پێناسەی رەگەزەکان و مەرجەکان و بەشەکان.

**رەگەزەکانی پێناسە:**

بریتین لە پێنج هەمووەکییەکان لە خودییەکان(رەگەز و جۆر و پۆل) گەر نەبینرایەوە لە لابەلاکان.

**مەرجەکانی پێناسە:**

زانایانی مەنتق پێیان وایە پێناسەی هەر شتێك وەك هاوکێشەیەکی بیرکاریانەی لا یەکسان وایە لە رووی گەواهیدانی تاکەکان(یەکێك لە لاکان) بۆ مانای گشتی کە بریتییە لە پێناسەکراو و ئەویتریان بریتییە لە پێناسەکە، دروستی ئەم هاوکێشەیە هەمیشە لەسەر بوونی دوو مەرجی بنەڕەتی راوەستاوە:

مەرجی یەکەم: دوو لای هاوکێشەکە یەکسان بن لە رووی گەواهیدان بۆ مانای گشتی: بەجۆرێك هەموو ئەوەی پێناسەکراو بەڕاستی دەزانێت پێناسەکەش بەڕاستی بزانێت، هەر بەو جۆرە پێچەوانەکەشی تاکو پێناسەکە کۆکەرەوە و گشتگیر بێت بۆ هەموو ئەوەی دەچێتە ژێر تێگەیشتنی پێناسەکراوەوە، هەموو ئەوەش کە پێناسەکراو بەڕاستی نازانێت پێناسەکە بەڕاستی نەزانێت، هەر بەو جۆرە پێچەوانەکەشی، تاکو پێناسەکە رێگر بێت لە نەیار و بەزۆورکەوتوو لە پێناسەکراودا کە لە راستەقینە و واقیعدا لە ناو پێناسەکراودا نین.

بینا لەسەر ئەم مەرجە مەنتقییە بۆ پێناسەکان، پێناسەی گرێبەست لە پڕۆژە یاسای مەدەنی نوێدا بە پێناسەیەکی نامەنتقی دادەنرێت، چونکە شتگەلێکی لە بەبەرداکردن خستۆتەوە ناو گرێبەستەوە کە لە گرێبەست نییە، مادەی (٣١٣)ی ئەو پڕۆژە یاسایە بەم

جۆرە پێناسەی گرێبەست دەکات: ((رێکەوتنی دوو ویست یان زیاتر بۆ سەرپێهەڵدانی ئەسەرێك کە یاسا دانی پیادا دەنێت)).

ئەم پێناسەیە بەرداکردنەکان وەك تەلاق بە رێکەوتنی دوو هاوسەرەکە دەگرێتەوە، یاساکە بە ڕاستی دەزانێت بەوەی رێکەوتنی دوو ویستە لەسەر سەرپێهەڵدانی ئەسەرێك کە یاسا دانی پیادا دەنێت، هەروەها ئەستۆپاك کردنی قەرزدار لەلایەن قەرزدەرەوە لە هەموو قەرزەکەی یان لە بەشێکی، لەدوای رازیبوونی قەرزدار دەگرێتەوە، چونکە ئەوەش رێکەوتنی دوو ویستە لەسەر سەرپێهەڵدانی ئەسەرێك کە یاسا دانی پیادا دەنێت، لەگەڵ ئەوەی دابەزینە لە ماف و بەبەرداکردنە.

بۆیە پێشنیار دەکەم پرۆژەکە پێناسەی یاسای مەدەنی عێراقی جێبەجێکار وەربگرێت لە مادەی (٧٣) کە گرێبەست پێناسە دەکات بەم جۆرە: ((گرێدانی ئەرێ کردنی دەرچوو لە یەکێك لە دوو کەسی گرێبەستکار بە قبوول کردنی ئەویتریان لە روویەکەوە کە ئەسەرەکەی جێگیر بکات لەو شتەدا گرێبەستەکەی لەسەر کراوە))، هەروەها پێشنیار دەکەم ئەم سنووردارکردنەی بخرێتە سەر کۆتاییەکەی: (هەروەها لەسەر گرێبەستکار) تاکو ئەرکەکان(پابەندبوونەکان)یش بگرێتەوە.

مەرجی دووەم: پێناسەکە دروست ببێت لە رەگەزە خوسیەکانی شتی بەهەندگیراو بە پێناسەکە، وەك رەگەز و پۆلی نزیك بەیەکتر گەر لە تواناداا بوو، تاکو پێناسەکە پێناسەیەك بێت راستەقینەی پێناسەکراو و سروشت و چییەتی رۆشن بکاتەوە.

پێناسەی شت بەو ئاسەوار و حوکمانەی لەسەری سەرهەڵدەدەن دروست نییە، چونکە گەر مرۆڤ راستەقینەی شت و چییەتییەکەی نەزانێت ناتوانێت بە شتێك بڕیاری لەسەر بدات.

بینا لەسەر ئەم مەرجە مەنتقییە پێناسەی یاسادانەری عێراقی بۆ تەلاقی رجعی(گەڕاوە) و تەلاقی بائین(جیابوەوە) لە یاسای باری کەسێتی جێبەجێکار پێناسەیەکی نا مەنتقییە، چونکە بە حوکمەکانیان پێناسەی کردوون، گەر قازی نەزانێت تەلاقی رجعی یان تەلاقی بائین کامەیە چۆن دەتوانێت بە حوکمێك بڕیار بەسەریاندا دەربکات؟!

مادەی (٢/٣٦) تەلاقی رجعی پێناسە دەکات بەوەی: ((ئەو تەلاقەیە کە دروستە بۆ مێردەکەی لە باری عیدەدا ژنەکەی بگێڕێتەوە بەبێ گرێبەستی هاوسەرگیری)) ئەم پێناسەیە حوکمێکە لە حوکمەکانی تەلاقی رجعی، بۆیە گەر قازی نەزانێت تەلاقی رجعی

کامەیە چۆن دەتوانێت بڕیار بدات مافی پیاوەکەیە ژنەکەی بگێڕێتەوە لە عیدەیدا بەبێ گرێبەستێکی نوێ)) ؟

بۆیە پێشنیار دەکەم ئەو مادەیە بگۆڕرێت بەم شێوەیە: ((تەلاقی رجعی بریتییە لە هەر تەلاقێك دوای چوونە لای یەکتر بۆ جاری یەکەم و دووەم و بەبێ بەرانبەر[١]))

بە هەمان شێوە تەلاقی بائینی لە حوکمەکانییەوە پێناسە کردووە، مادەی پێشتر دەڵێت: ((تەلاقی بائین بە جیابوونەوەی بچووك ئەوەیە کە بۆ پیاوەکە دروستە هاوسەرگیری لەگەڵ ژنە تەلاقدراوەکەی بکاتەوە بە گرێبەستێکی نوێ))

ئەمەش دیسان پێناسەیەکی نا مەنتقییە، چونکە قازی ناتوانێت بەم حوکمە بڕیار دەربکات گەر لە راستەقینە و سروشتی تەلاقی بائین ئاگادار نەبێت.

بینا لەسەر ئەمە پێشنیار دەکەم پێناسەکە بەم جۆرە بێت: ((تەلاقی بائین بریتییە لە هەر تەلاقێك پێش چوونە لا بە رەهایی یان دوای چوونە لا و بەرانبەر بەدەلێك بێت و تەواوکاری جاری سێیەم بێت، و هەموو جیابوونەوەیەکی قەزاییش بەپێی ئەم یاسایە))

هەروەها لە مەرجەکانی تری پێناسە ئەوەیە کە تەمومژاوی و بە نموونە[٢] و هاو واتا[٣] و مەجاز[٤] و نەرێیی[٥] و خستنە پاڵ[٦] نەبێت

---

[١] بەمەرجگیراوە ئەو تەلاقە جیابوونەوەیەکی قەزایی نەبێت، چونکە (٤٥) لە یاسای باری کەسێتی هەموو جیابوونەوەیەکی قەزایی بە جیابوونەوەیی بچووك دادەنێت.

[٢] وەك پێناسەکەی ئیبن مالك لە ئەلفییەدا بۆ بکەر(فاعل) بە وتنی:

الفاعل الذي كمرفوعي أتى　　　زيد منيرا وجهه نعم الفتى

[٣] وەك پێناسەی شێر بە جەستە گەورە و توند و تۆڵ.

[٤] وەك پێناسەی حوشتر بەوەی کەشتی بیابانە.

[٥] وەك پێناسەی نەزانی بە نەبوونی زانست یان پێناسەی زانست بە نەبوونی نەزانی.

[٦] وەك پێناسەی باوك بەوەی ئەو کەسەیە کە منداڵی هەیە.

## جۆرەکانی پێناسە:

زانایانی مەنتق پێناسەیان بەپێی رەگەزەکانی دابەش کردووە بۆ چوار بەش کە ئەمانەن:

١.رادەی تەواو: بریتییە لە پێناسە کردنی شت بە سروشت و پۆلی نزیك بە یەکتر، وەك پێناسەی مرۆڤ بەوەی بوونەوەرێکی زیندووی قسەکەرە بە سروشت.

٢.رادەی ناتەواو: بریتییە لە پێناسە تەنها بە پۆلی نزیك یان بە پۆل و لەگەڵ رەگەزی دوور وەك پێناسەی مرۆڤ بەوەی قسەکەرە بە سروشت یان بەوەی جەستەیەکی قسەکەرە بە سروشت.

٣.وێنەی تەواو: ئەوەش بریتییە لە پێناسە بە لابەلا تایبەتەکان لەگەڵ رەگەزی نزیك وەك پێناسەی مرۆڤ بەوەی بوونەوەرێکی زیندووی بیرکەرەوەیە.

٤.وێنەی ناتەواو: ئەوەش بریتییە لە پێناسە لابەلاکان و سیفەتە تایبەتەکان وەك پێناسەی مرۆڤ بەوەی جگەرەکێشە، ئەم دابەش کردنە بریتییە لە زنجیرەیەکی سروشتی لە رووی هەڵبژاردنەوە، بۆیە پێناسە بە رادەی تەواو دەکرێت، گەر نەگونجا بە رادەی ناتەواو، گەر ئاسان نەبوو بە وێنەی تەواو، ئەگەر نە بە وێنەی ناتەواو[1].

[1] الكلنبوي المرجع السابق، ص١١٤ وما بعدها.
التفتازاني المرجع السابق، ص١١٠ وما بعدها.
الرازي قطب الدين الرازي: تحرير القواعد المنطقية، ص٦٣ وما بعدها.
الانصاري المرجع السابق، ص٧٢ وما بعدها.

# بەشی سێیەم

## مەنتق و دابەشکردنی بابەتە یاساییەکان

دابەش کردنی هەر بابەتێك یان دابەش کردنێکی ئەقڵییە یان خوێندنەوەییە(شوێنپێ هەڵگرتنی واقیع)، ئەوەیان کە ئەقڵییە لە نێوان ئەرێ و نەرێدا دەسورێتەوە، ئەوەشیان کە خوێندنەوەییە بریتییە لە لێکۆڵینەوەی مەیدانی.

## دابەش كردنی ئەقلی:

دابەش كردنی ئەقڵی بریتییە لە هەڵبژێرراو بۆ دابەشبوونی هەموو بابەتێك كە جێگەی لێكۆڵینەوەیە جا بابەتەكە یاسایی بێت یان نە، بۆ دەستەبەركردنی دەستتێوەرنەدانی نێوان بەشەكان و دووركەوتنەوە لە دووبارە و ناواخن و سەلامەتی ئامێزگری هەموو ئەوەی دابەشكراو لە دابەشبوونەكەدا دەیگرێتەوە.

لە نموونەكانی دابەش كردنی ئەقڵی بریتییە لە دابەش كردنی زانایانی نەحو بۆ وشە(الكلمة) بەم جۆرە:

وشە یەكەم یان ئاماژە دەكات بە مانایەكی سەربەخۆ لە خودی خۆیدا، یان دووەم بریتییە لە پیت(ئامراز)، ئەوەی یەكەمیان یان ماناكەی تێهەڵكێش دەبێت بە كاتی یەكێك لە سێ دەمەكەی فەرمان(رابردوو و ئێستا و داهاتوو) كە بریتییە لە فەرمان یان تێهەڵكێش نابێت كە بریتییە لە ناو.

دەتوانرێ تاوان دابەش بكرێت بۆ تاوانی گەورە و تاوانی بچووك، و سەرپێچی بە دابەش كردنێكی ئەقڵی بەم جۆرە: هەموو تاوانێك یان سزاكەی كەمتر نییە لە بەندكردن یان كەمترە لە بەند كردن، یەكەمیان بریتییە لە تاوان، دووەم سزاكەی لە سێ مانگ زیاترە یان بریتییە لە تاوانانە(غرامە)، یان بریتییە لە سەرپێچی، یەكەمیان بریتییە لە تاوانی بچووك.

لە بەڵگەنەویستە مەنتقییە رەچاوكراوەكان لە هەر دابەش كردنێكدا ئەمانەیە:

١. دابەشكراوەكە بەرەهایی گشتی ترە لە هەر بەشێك لە بەشەكانی، تاوان بە رەهایی گشتگیرترە لە تاوانی بچووك و سەرپێچی.

٢. هەر بەشێك لە بەشەكان تایبەتترە لە بەشكراوەكە، هەموو تاوانكارییەك(گەورەتاوان) تاوانە، هەر بەو جۆرە هەموو تاوانێكی بچووك یان سەرپێچی تاوانە، بەڵام پێچەوانە گشتییەكەی ناڕاستە، ناوترێت هەموو تاوانێك تاوانی بچووكە یان سەرپێچییە، هەر بەو جۆرە هەموو(الكل) گەورەترە لە هەریەك لە بەشەكان.

٣. هەر بەشێك جودایە لە بەشێكی تر، لەگەڵی كۆنابێتەوە و ناچنە ناو یەكەوە، هەموو ئەوەی هەریەك لە تاوان و تاوانی بچووك و سەرپێچی لە خۆی دەگرن ئەوانی تر لەخۆی ناگرن، بینا لەسەر ئەو ڕێسایەی كە دەڵێت: هەر برابەشێك جودایە لە برابەشەكەی تر.

٤. كۆی بەشەكان یەكسانە بە بەشكراوەكە، و بەشكراوەكەش یەكسانە بە كۆی بەشەكانی، و هەموو(الكل) یەكسانە بە كۆی بەشەكان.

بۆیە لەسەر هەر لێكۆڵەری یاسایی و كەسانی تریش پێویستە ڕەچاوی ئەم چوار ڕێسایە بكەن لە دابەش كردنی هەر بابەتێكدا كە دەیانەوێت لێكۆڵینەوەی لەمەڕ بكەن.

دووبارەبوونەوە و ناواخن و زیادە و چوونەناویەكتر و ناتەواوی و نەنگییەكانی تر كە زۆربەی باسە یاساییەكان و باسەكانی تریش لێی بەدەر نین، بەتایبەت نامەی خوێندنی باڵا، هەموو ئەوانە بۆ ڕەچاونەكردنی ئەو چوار ڕێسا مەنتقییە دەگەڕێنەوە لە دابەش كردندا، ئەم نەنگیانە تەنها لێكۆڵینەوەكان ناگرنەوە، بەڵكو یاساڕێژییەكانیش دەگرنەوە، لەو دابەش كردنە یاساڕێژییە ناتەولوانە(نەنگیدارانە) لە یاساڕێژی عێراقیدا دابەش كردنی هۆی جیابوونەوەی قەزایی لەلایەن یاسادانەری عێراقییەوە بۆ زیان و شتانی تریش لە هۆكارەكانی تر بە شێوەیەكی تایبەت بەرانبەركێ كردنی زیان لە مادەی (٤٠) بە جیاوازی لە مادەی (٤١) لەگەڵ ئەوەی جیاوازی لە فیقهی ئیسلامی و هەموو یاسایەك لە یاساكانی جیهانی عەرەبی و دەوڵەتانی تریش بە هۆی جیابوونەوە دانانرێت گەر زیانێكی لە توانابەدەر نەبێت لەگەڵ بوونی بەردەوامی لە ژیانی هاوسەریدا، وەك چۆن مادەی (٦) لە یاسای باری كەسێتی میسری پێداگری لێ دەكات، هەروەها مادەی (١٣٢) لە یاسای باری كەسێتی ئوردەنی و یاسای (١١٢) لە یاسای باری كەسێتی سوری[١] و یاسای وڵاتانی تریش، ئەوەش لەبەر ئەوەیە جیاوازی

[١] المصري (م٦):((گەر ژنەكە بانگەشەی ئەوەی كرد مێردەكەی زیانی پێدەگەیەنێت بە جۆرێك ناتوانێت بەردەوام بێت لە ژیانی هاوسەری لەگەڵی دروستە بۆی داوا لە قازی بكات جیایان بكاتەوە، ئەو كات بە تەڵاقدانی جیابوونەوە تەڵاقی دەدات گەر زیان و دەستەوسانی لە چاككردنی نێوانیان جێگیر بوو..) ←

بەشێکە لە زیان و شێوەیەکە لە شێوەکانی و پیادەکردنێکە لە پیادەکردنەکانی، کاری یاسادانەری عێراقی وەك ئەوە وایە شتێك بۆ خۆی و شتانی تریش جگە لە خۆی دابەش بکەیت، ئەمەش مەنتق رەدی دەکاتەوە.

سەرباری ئەمە هەر هۆیەك لە هۆیەکانی جیابوونەوە لەسەر ئەو بنچینە قازی شانی لەسەر دادەدات کە زیانێکە و بەشێکە لە زیان، هەر هۆیەك کە یەکێك لە دوو هاوسەرەکە دەستی پێوە دەگرێت لەلایەن قازیەوە رەد دەکرێتەوە گەر نەسەلمابێت زیانە، هەموو ئەو هۆیانەی کە فەقیهە موسڵمانەکان دانیان پیادا ناون وەك پاساو بۆ جیابوونەوەی دوو هاوسەرەکە لەسەر دوو سەرچاوە شان دادەدەن، ئەو دوانەش قورئان کە دەفەرموێت: ((ولا تمسكوهن ضرارا))[1] و فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) کە دەفەرموێت: (لاضرر ولا ضرار)، ئەو هۆیانەی لە مادەی(٤٣،٤١،٤٠)دا هاتوون لە یاسای باری کەسێتی عێراقیدا هەموو بەشی زیانن.

بۆ خۆقوتارکردن لەم دابەشکردنە نامەنتقیانە و بۆ دوورکەوتنەوە لە چوونە ناو یەکتری نێوان هۆیەکانی جیابوونەوەی قەزایی داوا لە یاسادانەری عێراق و وڵاتانی ئیسلامی عەرەبی دەکەین هەموو هۆیەکانی جیابوونەوەی قەزایی لەژێر یەك ناونیشاندا کۆبکەنەوە ئەویش:

جیابوونەوە بە هۆی زیانەوە:

پاشان زیان دابەش دەبێت بۆ زیانی بەویست و زیانی بێویست، زیانی بەویست ئەوەیە ویستی یەکێك لە دوو هاوسەرەکە رۆیشتۆتە ناویەوە، زیانی بێویستیش ئەوەیە کە ویستی یەکێك لە دوو هاوسەرەکە ناچێتە ناویەوە، وەك رێگرەکانی جووتبوون(هاوسەری کردن) لە ئەرکە شەرعییەکان و نەخۆشییە گوازراوەکاندا.

---

الاردني (م١٣٢): (گەر ناکۆکی و دابڕان لە یەکتر لە نێوان دوو هاوسەردا سەریهەڵدا بۆ هەر یەکێك لەو دوانە هەیە داوای جیابوونەوە بکات گەر بانگەشەی ئەوەی کرد بە قسە یان بە کردار زیانی پێدەگەیەنێت بەجۆرێك نەتوانرێت لەگەڵ ئەو زیان پێگەیاندنە ژیانی هاوسەری بەردەوام بێت)

السوري (م١١٢)(گەر یەکێك لە دوو هاوسەرەکە بانگەشەی زیان پێگەیاندنی کرد لەلایەن ئەویتریانەوە بەجۆرێك نەتوانرێت ژیانی هاوسەری بەردەوام بێت دروستە داوا لە قازی بکات جیایان بکاتەوە)

[1] سورة البقرة/ ٢٣١.

پاشان دابەش كردنی هەر یەكێك لەو دوانە بۆ مادی و مەعنەوی، پاشان دابەش كردنی مادی و مەعنەوی بۆ ئەرێیی(واتە بەرهەمهاتوو بە هۆیەكی ئەرێییەوە وەك لێدانی ژنەكە) و نەرێیی(بەرهەمهاتوو لە كارێكی نەرێییەوە وەك دەستگرتنەوە و خۆگرتنەوە لە خەرجی بۆ كردن و هاوسەری كردن لەگەڵی)، لەگەڵ ئەوەی بۆ هەر بەشێك لەم بەشانە هەندێك نموونە بخرێنە روو وەك رۆشنكردنەوەی زیاتر و بوون بە نموونە بۆ پێوانە كردنی شتانی تر جگە لەوانە بۆ سەریان، پاشان یاسادانەر دەسەڵاتی خەملاندن بە قازی بدات بۆ خەملاندنی قەبارەی زیانی پاساودەر بە جیابوونەوە و پەنابردن بە دوو حەكەم و لێكۆڵەری كۆمەڵایەتی ئافرەت و هەروەها شارەزای قازی لە كارەكەی و راپۆرتی لیژنەی پزیشكی پسپۆڕ، گەر یاسادانەر لە وڵاتانی عەرەبی و ئیسلامیدا شوێنی ئەو شێوازە مەنتقییە نەكەوێت لە دابەش كردنی زیاندا بۆ بەشە ناوبراوەكانی ئەوە وادەكات ناچاربێت هەموو ساڵێك لیستێك لە هۆی جیابوونەوە پێشكەش بكات، ئەمەش بەهۆی پێشكەوتنی ژیان و گۆڕانكارییەكانی و دانانی شتێك بە زیان لە رەوشێكدا كە بە زیان تەماشا نەكراوە لە رەوشێكی تردا.

پاشان زۆربوونی هۆی جیابوونەوەی قەزایی دەرئەنجامی نەرێیی دەبێت لەسەر دامەزرانی خێزان و لەوێشەوە دامەزرانی كۆمەڵگە.

دابەشبوونی خوێندنەوەیانە(شوێنپێ هەڵگرتنی واقیع):

سەرەڕای سوودەكانی لە هەندێ لە مەیدانەكاندا ناتوانرێت شانی لەسەر دابدرێت لە دانانی پێوەرێكی ورد بۆ جیاكاری نێوان بەشەكان و نەچوونە ناو یەكتریان، بۆ نموونە دابەشكردنی هەندێ لەوانەی لەم روانگەیەوە پێی هەستاون، بەڵام نەبوونی وردی لەم دابەش كردنەدا لە چەند روویەكەوە سەلماوە، لەوانە:

أ.هۆكارەكانی تاوانكاری هەندێكی لەگەڵ هەندێكی تریدا جۆراوجۆر و پێشكەوتوو و تێكهەڵبژاون.

ب.كۆمەڵە هۆكارێكی تر هەن كە ناچنە ژێر ئامارێكی وردەوە دەتوانرێت پەیوەندار بە تاوانەكە دابنرێت.

ج.نەبوونی توانا بۆ دانانی پێوەرێكی ورد بۆ جیاكردنەوەی هۆی راستەوخۆ لە هۆی ناڕاستەوخۆ.

# بەشی چوارەم

## مەنتق و تێکەڵی لە نێوان هەندێ لە زاراوە یاساییەکاندا

هەر کەس شوێنپێی هەندێ لە لێکدانەوەی یاساییەکان بکەوێت دەبینێت تێکەڵییەك سەریهەڵداوە لە نێوان زاراوە یاساییەکاندا جا لەڕووی ناوەوە بێت یان لەڕووی شرۆڤەکردنەوە، یان لەڕووی بەکارهێنانەوە یاخود لەڕووی ئەنجامگیرییەوە.

## هەڵوەشاندنەوە و بەرهەڵستکاری:

هەندێ جار شرۆڤەکارانی یاسا "هەڵوەشاندنەوە" بەکاردەهێنن لە شوێنی "بەرهەڵستکاری" وەك ئەوەی دوو زاراوەی هاوواتابن و هەر یەکەیان مافی ئەوەی هەبێت لە جێگەی ئەویتر دابنیشێت، لەگەڵ ئەوەی کە ڕێساکانی زانستی مەنتق لەڕووی حەقیقەت و مەرج و حوکمەوە بڕیار لەسەر جیاوازییان دەدەن.

### یەکەم- لەڕووی حەقیقەتەوە[1]

أ. هەڵوەشاندنەوە: بریتییە لە جیاوازی نێوان دوو دۆز(بابەت) بە ئەرێکردن و نەرێکردن، بەجۆرێك راستێتی یەکێکیان پووچەڵبوونەوەی ئەویتریان بسەلمێنێت، هەر بەو جۆرە پووچەڵبوونەوەی یەکێکیان راستێتی ئەویتریان بسەلمێنێت، چونکە لە هیچ ڕوویەکەوە هەردووکیان لەیەك بابەتدا کۆنابنەوە، هەر بەو جۆرە هەردووکیان پێکەوە بەرز نابنەوە(هەڵناگیرێن)، بەڵکو پێویستە بوونی یەکێکیان نەبوونی ئەویتریان بگەیەنێت.

ب-بەرهەڵستکاری: بریتییە لە جیاوازی نێوان دوو دەق(یان دوو حوکم) یان دوو بەڵگە... بە جیاوازییەك راستێتی یەکێکیان پووچەڵبوونەوەی ئەویتریان ناگەیەنێت، هەر بەو جۆرە پووچەڵبوونەوەی یەکێکیان راستێتی ئەویتریان ناگەیەنێت، ئەوەش بەهۆی نەگەری کۆکردنەوەیان لە دۆزێکدا لەگەڵ یەکتر و گونجاوی بەرزبوونەوە(هەڵگرتن)یان پێکەوە لە یەك بابەت(دۆز)دا، وەك بوونی بەرهەڵستکاری رواڵەتی لە نێوان هەندێ دەقدا، دروستە قازی هەردوو دەقەکە پشتگوێ بخات و بە سێیەم کاربکات، وەك چۆن یاسادانەر مافی ئەوەی هەیە هەردوو بەرهەڵستکارەکە پێکەوە بسڕێتەوە و حوکمێك، دەقێك یان بەڵگەی سێیەم بهێنێت کە لەگەڵ دوانەکەی تر جیاواز بن، چونکە هیچ جۆرە نەشیاوییەکی مەنتقی لەسەر هەریەك لەو دوانە سەرهەڵنادات نە لە کۆکردنەوەیان لەگەڵ یەکتر نە لە بەرزبوونەوەیان، بە پێچەوانەی "هەڵوەشاندنەوە"وە کە ئەم نەشیاوییە لەوێ بوونی هەیە.

---

[1] الکلنبوي: البرهان، ص٢٦٠ وما بعدها.

**دووەم - لەرووی مەرجەوە:**

"هەڵوەشاندنەوە" لەگەڵ "بەرهەڵستکاری" لە مەرجی پێویست و داواکراودا لەیەکتر جیاوازن بەهۆی هەستانی هەریەك لەو دوانە:

أ.**مەرجەکانی هەڵوەشاندنەوە**[1]: بۆ راستبوونەوە و بەرقەراربوونی هەڵوەشاندنەوە پێویستە ئەم هەشت مەرجە بوونیان هەبێت:

١-یەکێتی لە بابەتدا[2]: هەڵسوکەوتی ناکام(قاصر)ی جیاکەرەوە پووچە، هەڵسوکەوتی ناکامی جیاکەرەوە دروستە، هەڵوەشاندنەوە لە نێوان ئەم دوو رێسایەدا بوونی نییە، بەهۆی جیاوازی بابەتەکەیانەوە، چونکە مەبەست بە "هەڵسوکەوت" لە دۆزی یەکەمدا بریتییە لە زیانبەخش بە زیانبەخشینێکی پەتی(تەواو)، لە کاتێکدا مەبەست بە "هەڵسوکەوت" لە دووەمدا بریتییە لە سوودبەخش بە سوودبەخشینێکی رەها.

٢-یەکێتی لە هەڵدراودا: [3] یارمەتی کەسی ئاتاج پێویستە، یارمەتی کەسی ئاتاج پێویست نییە، هەڵوەشاندنەوە لە نێوان ئەم دوو رێسایەدا بوونی نییە، بەهۆی جیاوازی هەڵدراوەکەیان، چونکە مەبەست بە "پێویست" لە یەکەمیاندا بریتییە لە پێویستبوونی ئەخلاقی و ئاینی، بەلاّم لە دووەمدا بریتییە لە پێویستبوونی یاسایی.

٣-یەکێتی لە مەرجدا: ژنی تەلاّقدراو عیدەی لەسەر پێویستە، ژنی تەلاّقدراو عیدەی لەسەر پێویست نییە، هەڵوەشاندنەوە لە نێوان ئەم دوو رێسایەدا بوونی نییە بەهۆی جیاوازی مەرجەوە، چونکە عیددە بە مەرجی چوونەلا پێویستە، عیددە پێویست نییە گەر تەلاّقەکە پێش چوونەلا بێت[4].

٤-یەکێتی لە کاتدا: بڕیار بەسەردا دەرکراو مافی خۆیەتی تانە لە لە بڕیارەکە بدات، بڕیار بەسەردا دەرکراو مافی خۆی نییە تانە لە بڕیارەکە بدات، هەڵوەشاندنەوە لە نێوان ئەم دوو رێسایەدا بوونی نییە، چونکە یەکەمیان لەسەر ئەوە بیناکراوە کە تانەلێدانەکە لە

---

[1] البرهان المرجع السابق، ص٢٦١.

[2] بابەت لە زانستی مەنتقدا بەرانبەر حوکم بەسەرداکراوە لە یاسادا و بۆپاڵدراو لە زانستی نەحودا.

[3] مەبەست بە هەڵدراو لە زانستی مەنتقدا بەرانبەر حوکمپێکراوە لە یاسادا، پاڵدراو لە زانستی نەحودا.

[4] کما یقول سبحانە وتعالی: (اذا نکحتم المؤمنات ثم طلقتموهن من قبل ان تمسوهن فما لکم علیهن من عدة تعتدونها) سورة الاحزاب/ ٤٩.

ماوەیەکی دیاریکراودا بێت بە یاسا، دووەمیش لەسەر ئەوە بیناکراوە کە تانەلێدانەکە لە دەرەوەی ئەو ماوە دیاریکراوەوە بێت.

٥-یەکێتی لە شوێندا: یاسای عێراقی لە شێوەی گرێبەستدا گوزەر دەکات، یاسای عێراقی لە شێوەی گرێبەستدا گوزەر ناکات. هەڵوەشاندنەوە لە نێوان ئەم دوو ڕێسایەدا بوونی نییە بەهۆی جیاوازی شوێنەوە، چونکە مەبەست بە یەکەمیان شێوەی گرێبەستی پەیوەست بە ماڵ و دارایی هەبوو لەناو عێراقدا، مەرامی دووەمیش شێوەی گرێبەستی پەیوەست بە ماڵ و دارایی لە دەرەوەی عێراق[١].

٦-یەکێتی لە کردار و تواناییدا: کۆرپەلە خاوەنی کەسایەتییە، کۆرپەلە خاوەنی کەسایەتی نییە، هەڵوەشاندنەوە لە نێوان ئەم دوو ڕێسایەدا بوونی نییە، چونکە یەکەمیان لەسەر بنچینەی توانین بیناکراوە، لەسەر ئەو بنەمایەی کە لێوەشاوەیی پێویستبوونی ناتەواو بۆ کۆرپەکە هەیە لە هەندێ لە مافەکاندا وەك میرات و وەسێت و وەقف و بەخشین، بەڵام ڕێسای دووەم لەسەر پێگەی کەسایەتی کرداریە، ئەم جۆرە کەسایەتییە بە لەدایکبوونی تەواوی مرۆڤ دەست پێ دەکات و بە مردنی کۆتایی پێ دێت[٢].

٧-یەکێتی لە "هەموو" و لە "بەش"دا: گەر بڵێین: تۆمەتباران تاوانبارن(واتە هەندێکیان)، هەروەها: تۆمەتباران تاوانبار نین(واتە هەموویان)، هەڵوەشاندنەوە لە نێوان ئەم دوو بابەتەدا بوونی نییە، چونکە لە "هەموو" لە "بەش"دا یەکیان نەگرتووە.

٨-یەکێتی لە دانەپاڵدا: حوکمەکانی یاسای سزا عێراقییەکان بەسەر ئەو تاوانەدا تێدەپەڕێنرێن کە ئەنجام دەدرێن لە ناوەوەی عێراقدا، حوکمەکانی یاسای سزا عێراقییەکان بەسەر ئەو تاوانەدا تێناپەڕێنرێن کە ئەنجام دەدرێن لە ناوەوەی عێراقدا. هەڵوەشاندنەوە لە نێوان ئەم دوو ڕێسا یاساییەدا بوونی نییە، چونکە یەکەمیان مەبەستی ئەو تاوانانەیە کە دەدرێنە پاڵ عێراقییەکان و ئەو بیانیانەی کە

[١] المادة (٣٣) من المشروع للقانون المدني الجديد العراقي.

[٢] المادة (١/٣٩) من مشروع القانون المدني الجديد.

پارێزبەندی(حصانة)یان بۆ نییە، دووەمیان مەبەستی ئەو تاوانانەیە کە دەدرێنە پاڵ کۆمەڵە کەسێك کە پارێزبەندی بڕیار لەسەر دراویان بۆ هەیە بەپێی ڕێکەوتنە نێودەوڵەتییەکان یان یاسای نێودەوڵەتی، یاخود یاسای ناوخۆیی[1].

**ب-مەرجەکانی بەرهەڵستکاری:** بۆ بەرهەڵستکاری دوو خاڵ بە مەرجگیراوە:

١-هەریەك لە دوو بەڵگە بەرهەڵستکارەکە بەیەکتر گومانئامێز بن، بەرەڵستکاری لە نێوان بەڵگەی براوەدا بوونی نییە بە هۆی نەشیاوییەوە لەڕووی مەنتقەوە، هەر بەو جۆرە بەرهەڵستکاری لە نێوان بەڵگەیەکی براوە و بەڵگەیەکی گومانئامێزدا بوونی نییە بەهۆی هاوتا نەبوونی دوو بەڵگەکە بەیەکتری.

٢.بەرهەڵستکارییەکە لە گومانی قازی و موجتەهیدا بێت تایبەت بە دەقە شەرعییەکان، چونکە نابێت بەرهەڵستی لە واقیع و خودی کەلامی خودا و پێغەمبەردا(ﷺ) بوونی هەبێت بەهۆی وێنا نەکردنی هەڵەوە، تایبەت بە دەقە یاساکانیش لەوانەیە بەرهەڵستکاری لە واقیعدا بوونی هەبێت وەك چۆن لە زەینی قازیدا راستبووەتەوە، بەهۆی وێنا کردنی هەڵە و لەبیرچوونەوە بۆ کەسی یاسادانەر.

**سێیەم- لەڕووی حوکمەوە:**

**أ-حوکمی هەڵوەشاندنەوە:** ئەوەیە کە دروستیی یەکێك لە دوو ڕێسا هەڵوەشێنەرەکان پووچی ئەویتریان پێویست دەکات، بەهۆی نەشیاویی کۆکردنەوەی هەردووکیان لەسەر دروستی، هەروەها پووچی یەکێکیان دروستیی ئەویتریان دەگەیەنێت بەهۆی نەشیاویی بەرزبوونەوە(هەڵگرتن)یان پێکەوە لە پووچەڵیدا.

**ب-حوکمی بەرهەڵستکاری:** لە باری راستبوونەوەی بەرهەڵستکاریدا قازی بۆ بەرزکردنەوەی(هەڵگرتن و نەهێڵانی) پەنا دەبات بۆ یەکێك لەم سێ هەنگاوانە بە شێوەی بەدوای یەکتردا هاتن:

**هەنگاوی یەکەم:** قازی کۆشش بکات بۆ کۆکردنەوە و تەبایی دروست کردن لە نێوان دوو بەرهەڵستکارەکەدا بەیەکتر، بە جۆرێك راستنەبوونەوەی ئەو بەرهەڵستکارییە لە حەقیقەت و واقیعدا بسەلمێنێت، بۆ نموونە: یاسای باری کەسێتی عێراقی لە لێوەشاوەیی تەواوی

---

[1] المادة (١١) من قانون العقوبات العراقي النافذ.

هاوسەریدا ئەقڵ و تەواوکردنی هەژدە ساڵ لە تەمەنی بە مەرج گرتووە، ئەمەش وەك ڕێسایەکی بنەڕەتی لە مادەی حەوتەم[1].

هەڵواردە لەم ئەسڵە تەواوکردنی پازدە ساڵ لە تەمەن وەك نزمترین رادە بە مەرج دەگیرێت بۆ کەسێك داوای هاوسەرگیری بکات و لێوەشاوەیی و توانا و ئامادەیی جەستەیی جێگیر بووبێت، بە مەرجێ بە مۆڵەتی قازی و ڕازیبوونی سەرپەرشتیاری شەرعی هاوسەرگیرییەکە ئەنجام بدرێت بۆ ئەو کەسانەی داوا پێشکەش دەکەن، وەك لە مادەی هەشتەمدا هاتووە[2]

ئەم دوو مادەیە بەرهەڵستکاری دەکەن لەگەڵ بەرێوشلکردنی هاتوو لە مادەی (٣٩٨) لە یاسای سزا عێراقییەکان لە بەشی تاوانی پەردان(خراپکردن) و نێربازی و هەتکی ناموسدا کە بە دەق هاتووە: ((گەر گرێبەستی هاوسەرگیری دروست ئەنجام درا لە نێوان کەسێك کە بە یەکێك لە تاوانە هاتووەکانی ئەم بەشە هەستابێت لەگەڵ تاوانلێکراو، ئەوا جوڵانی داواکە و لێکۆڵینەوە تیایدا و ڕێکارەکانی تر رادەگیرێن، گەر بڕیاریش لە داواکە درابێت جێبەجێ کردنی حوکمەکە رادەگیرێت))

بەرشلکردنی ئەم دەقە واتە دروستیی هاوسەرگیری لە نێوان تاوانکەر و تاوانلێکراو با ساڵی تەمەنی تاوانلێکراویش کەمتر لە پازدە بێت، ئەمەش بەرهەڵستی دەکات لەگەڵ گوزارەی دوو مادەی حەوت و هەشت لە یاسای باری کەسێتی جێبەجێکار.

بەڵام گەر قازی ئیجتیهادی کرد و گەڕایەوە بۆ ڕێسای دەقە یاساییەکان کە هەندێکیان شرۆڤەی هەندێکی تریان دەکەن و بەراوردی کرد لە نێوان ئەو دوو مادە و مادەی شەشی پێشەوەیان بۆی ڕۆشن دەبێتەوە مەبەست لە مەرجی هاتوو لەو دوو مادەدا بریتییە لە

---

[1] دەقی مادەی حەوتەم: (لە هاوسەرگیریدا تەواوی لێوەشاوەیی ئەقڵی و تەواوکردنی هەژدە ساڵ لە تەمەن بە مەرج دەگیرێت).

[2] دەقی مادەی هەشت: (گەر کەسێك پازدە ساڵ لە تەمەنی تەواوکردبێت داوای هاوسەرگیری پێشکەش کرد، بۆ قازی هەیە مۆڵەتی پێ بدات گەر لێوەشاوەیی و ئامادەکاری جەستەیی تێدا بوو، دوای ڕازیبوونی سەرپەرشتیاری شەرعی، گەر سەرپەرشتیار ڕازی نەبوو ماوەیەك بۆ ڕازیبوونی دادەنێت کە قازی دیاری دەکات، گەر بەرهەڵستی نەکرد، یان بەرهەڵستیکردنەکەی بە هەندوەرنەدەگیرا قازی مۆڵەتی هاوسەرگیرییەکە دەدات).

مەرجی "پێویست بوون" نەك مەرجی "دامەزراندن و دروستی"ی گرێبەست، چونکە مادەی شەشەم کە دانراوە بۆ رۆشنکردنەوەی مەرجی دامەزراندن و دروستیی ئەم مەرجەی تێدا نەهاتووە[1]، بەمەش بەرهەڵستکارییەکە دەبێتە بەرهەڵستکارییەکی رواڵەتی نەك واقیعی(جەوهەری))، لێرەوە یاسادانەری عێراقی بە دەرچوو دانانرێت لەوەی جمهوری فەقیهانی موسڵمان بڕیاریان لەسەر داوە لەوەی باڵغبوون مەرجی پێویستە، بۆیە ئەوانەی باڵغ دەبن ماف خۆیانە یان بەردەوام بن لە لەسەر هاوسەرگیرییەکەیان یاخود هەڵیبوەشێننەوە، ئەوەش نە مەرجە بۆ دروستیی و نە مەرجە بۆ دامەزراندن.

**هەنگاوی دووەم**: هەوڵی قازی بۆ پارسەنگ کردنی یەکێك لە دوو بەڵگە بەیەکتر بەرهەڵستکارەکە بەسەر ئەویتریاندا بە پارسەنگکەرێك گەر نەیتوانی کۆکردنەوە لە نێوانیاندا ئەنجام بدات.

کارێکی بەڵگەنەویستە قازی یاسا بەسەر رێنماییەکاندا پارسەنگ دەکات گەر بەرهەڵستیان لێوە بەدەرکەوت هەروەك چۆن دەستوور بەسەر یاسادا پێشدەخرێت لە کاتی نادەستووری بوونی دەقی یاساییدا.

**هەنگاوی سێیەم**: گەڕانەوە بۆ مێژووی یاسادانانی دوو دەقە بە یەکتر بەرهەڵستکارەکە گەر نەیتوانی کۆیان بکاتەوە و پارسەنگێکی بۆ کارکردن پێیان نەدەبینییەوە بۆ پارسەنگدانی یەکێکیان بەسەر ئەویتریاندا، لەو بارەدا دەقی پێشووتر لە بەرواردا بە هەموارکراو دادەنرێت بە هۆی دەقەکەی دواترەوە بەپێی ئەوەی بڕیاری لەسەر دراوە لە رێسا شەرعی و یاسایی[2] و مەنتقییەکاندا.

---

[1] دەقی مادەی شەشەم: (١-گرێبەستی هاوسەرگیری دانامەزرێت گەر یەکێك لە مەرجەکان یان دروستیی رۆشنکەرەوە لەدەست بدات، لەمانەدا: أ- یەکگرتنی مەجلیسی ئەرێکردن و قبووڵ کردن.

ب- هەریەك لە دوو گرێبەستکارەکە قسەی ئەویتر ببیستێت و لێی تێبگات بەوەی مەبەست پێی گرێبەستی هاوسەرگیرییە. ج- رێکەوتنی قبووڵ کردن لەگەڵ ئەرێ کردن.

د- شایەتی دوو شایەت کە خاوەنی لێوەشاوەیی یاسایی بن لەسەر گرێبەستی هاوسەرگیرییەکە.

هـ- دەبێ گرێبەستەکە پەیوەست نەبووبێت لەسەر مەرجێك یان رووداوێك کە نایەتە دی)

[2] مادەی پێنج لە پرۆژە یاسای مەدەنی نوێ دەقەکەی دەڵێت: (یاسا بە یاسای دواتر هەموار دەکرێتەوە، یان رێساگەلێك لەخۆ دەگرێت بەرهەڵستی دەکەن لەگەڵ رێساکانی یاسای پێشتر، یان بابەتێك سەرلەنوێ رێکدەخەنەوە کە پێشتر ئەو یاسایە رێکیخستووە).

## دەستبەسەردا گرتنی داواکراو:

لەو زاراوانەی کە تێکەڵی تێدا دروستکراوە لەلایەن شرۆڤەکارانی یاساوە ئەم زاراوەیە، یاساناسان لەوانەی شارەزاییان بە مەنتق نییە پێیان وایە "دەستبەسەردا گرتنی داواکراو" مانای نەشیاویی مەنتقی هەیە جا لە کاروبارە راستەقینەکاندا بن یاخود لە کاروبارە پێگەییەکاندا، بۆ زانینت "دەستبەسەردا گرتنی داواکراو" مانای نەشیاوی مەنتقی ناگەیەنێت گەر لە کاروبارە واقیعی و راستەقینەکانی دەرەوەی زەینی مرۆڤدا نەبێت.

گەر بڵێین(أ) لە شتەکان لە بوونی دەرەکیدا لەسەر (ب) لە شتەکان رادەوەستێت، هەر بەو جۆرە (ب)ش لەسەر (أ) رادەوەستێت دەستبەسەردا گرتنی داواکراو(نەشیاویی مەنتقی)ی لێوە پێویست دەکات، چونکە راوەستانی شتێك لەسەر ئەوەی کە ئەویش لەسەر ئەم رادەوەستێت پێویست دەکات شتەکە لەسەر خودی خۆی راوەستابێت، راوەستانی شتێکیش لەسەر خودی خۆی پێویست دەکات خۆی پێش خۆی کەوتبێت ئەمەش پووچە و هەر پێویستبوونێکیش بۆ پووچ بە خێراحاڵیبوونی مەنتقیانە بە پووچ دادەنرێت.

دەستبەسەردا گرتنی داواکراو لە بابەتە زەینییەکان و کاروبارە بابەخپێدرلوەکاندا مانای نەشیاوی مەنتقی ناگەیەنێت، بۆ نموونە: کاتێك فەقیهی فەرەنسی(بلانیول) رەخنەی لە بیرۆکەی نەرێتی بۆ "هۆ" گرت، وتی: ئەوە دەستبەسەردا گرتنی داواکراو و نەشیاویی مەنتقی پێویست دەکات، ئەوەش لەبەر ئەوەی پابەندبوونی فرۆشیار-بەپێی ئەم بیرۆکەیە- بە رادەست کردنی فرۆشراوەکە هۆیەکە بۆ پابەندبوونی کڕیار بە رادەست کردنی نرخەکەی، هەر بەو جۆرە پێچەوانەکەشی، ئەمەش بە دەستبەسەرداگرتنی داواکراو و نەشیاویی مەنتقی دادەنرێت، چونکە یەکێکیان ناتوانێت "هۆ" و لە هەمان کاتدا "سەبەبکار" بێت بۆ ئەوی تریان، چونکە نابێت ئەسەر و ئەسەردار و هۆ و دەرئەنجام هاودەمی یەکتر بن، پاشان فەقیهێکی تری فەرەنسی(کاپیتان) هات و بەرگری لە بیرۆکەی نەرێتی کرد و بەرهەڵستی راستبوونەوەی نەشیاوی مەنتقی کرد و وتی: ئەوە راست نابێتەوە گەر بڵێین: هۆی پابەندبوونی هەر یەك لە دوو گرێبەستکارەکە بریتییە لە جێبەجێ کردنی پابەندبوونی بەرانبەر نەك بوونی، بۆیە لەسەری پێویست ناکات یەك شت هۆ بێت و لە هەمان کاتیشدا

سەبەبکار بێت[1]، گەر گەڕاینەوە بۆ ڕێسا مەنتقییەکان بۆمان روون دەبێتەوە ئەم گفتوگۆیە لە نێوان ئەو دوو فەقیهە یاساناسەی فەرەنسادا هیچ پاساوێکی بۆ نییە، ئەمەش لەبەر ئەوەی دەستبەسەرداگرتنی داواکراو لەم دۆزەدا مانای نەشیاوی مەنتقی نییە، چونکە ئەم بەرانبەرە پابەندبوونانەی نێوان دوو گرێبەستکارەکە و راوەستانی هەندێکیان لەسەر هەندێکی تریان دانانی زەینین و لە دروستکراوی بیری یاساییین و لە دەرەوەی زەینی فەقیهەکانی یاساوە بوونیان نییە، نەشیاوی مەنتقی تایبەت بە کاروبارە واقیعی و دەرەکی و راستەقینەکانی دەرەوەی زەینی مرۆڤ وێنا دەکرێت.

گەر وادابنێین نەشیاویی بوونی هەیە ئەوا ئەو خستنەسەرەی "کاپیتان" دەیڵێت گرفتەکە چارەسەر ناکات، چونکە دەستبەسەردا گرتنی داواکراو دیسان راوەستاوە، چونکە جێبەجێ کردنی هەر یەکەیان لەسەر جێبەجێ کردنی ئەویتریان راوەستاوە، گەر ئەم دوو فەقیهە مەزنە شارەزاییان لە زانستی مەنتق هەبوایە نەدەکەونە ناو ئەو گفتوگۆ بێمانا و سۆفستاییانەوە.

**تێکەڵی لە نێوان گشتی و تایبەتی رەها لەگەڵ گشتی و تایبەت لە روویەکەوە:**

زانایانی مەنتق رێژەیان لە نێوان کاروبارەکاندا بۆ چوار خاڵ دابەش کردووە کە ئەمانەن:

١– یەکسانی: یەکسانی تەولو دەستەبەر دەبێت لە نێوان دوو شتدا گەر هەر یەك لەو دوانە ئەوەی ئەویتریان بەڕاستی دەزانێت ئەمیش بەڕاستی بزانێت، بەوەی بوترێت هەموو تاوانبارێك تاوانکەرە و هەموو تاوانکەرێك تاوانبارە.

٢– جیاوازی: جیاوزی تەواو لە نێوان دوو شتدا راست دەبێتەوە گەر هیچ یەك لەو دوانە ئەوەی ئەویتریان بەڕاستی دەزانێت بەڕاستی نەزانێت، وەك ئەوەی بوترێت: هەموو تاوانبارێك بێتاوان نییە، و هەموو بێتاوانێك تاوانبار نییە لە یەك پرسدا.

٣. گشت و تایبەتی رەها: تایبەتی رەها هەموو ئەوەی گشت بەڕاستی دەزانێت بەڕاستی دەزانێت بەبێ پێچەوانەکەی، واتە گشتی رەها هەموو ئەوەی تایبەت بەڕاستی دەزانێت بە ڕاستی نازانێت بەڕاست زانینێکی هەموەکی، دەوترێت: هەموو بکوژێکی

---

[1] استاذنا الدكتور عبدالمجيد الحكيم/ شرح القانون المدني العراقي النافذ الكتاب الاول نظرية الالتزام – الجزء الاول، ص٢٠٥–٢٠٦.

دوژمنکارانەی ئەنقەست تاوانکارە، بەڵام ناوترێت هەموو تاوانکارێك بکوژی ئەنقەستی دوژمنکارە، بەهۆی بەکارهێنانی وشەی تاوانکار بۆ جاسوسی و دزی و شتانی تریش.

٤. گشت و تایبەت لە رووپەکەوە: لە نێوان دوو شتدایە کە لە هەندێ روووەوە لەگەڵ یەکتر کۆدەبنەوە، و لە هەندێ رووی ترەوە لە یەکتر جیادەبنەوە، بەوەی هەریەك لەو دوانە گشت بن لە رووپەکەوە و تایبەت بن لە رووپەکی ترەوە، وەك بێتاوان و تۆمەتبار، هەردوو لە تۆمەتبارێکدا بێتاوانییەکەی سەلما بێت کۆدەبنەوە و بێتاوانیش دەستەبەر دەبێت بەبێ تۆمەتبار لە کەسێکدا لەبەردەم قەزادا تۆمەتبار نەکرابێت بە تۆمەتێك لە درێژایی تەمەنیدا، تۆمەتباری بەبێ بێتاوانی دەستەبەر دەبێت لەو کەسەی تۆمەتبار کردنەکەی دەسەلمێت.

دوای ئەم پوختەیە لە خستنەڕوو بۆ چوار رێژەکە لە نێوان کاروبار و دۆزەکاندا ئاماژە دەکەم بۆ نموونەیەك لە تێکەڵی نێوان گشت و تایبەتی رەها و گشت و تایبەت لە رووپەکەوە لە شرۆڤەی یاسای مەدەنی عێراقی یەکێك لە مامۆستاکانم: ئەم مامۆستا بەرێزە لە پێشەکی کتێبەکەیدا[1] لەسەر رۆشنکردنەوەی رێژی نێوان ماڵ و موڵك دەڵێت: ((موڵك مادەی (١٢٥)ی گۆڤارەکە پێناسەی کردووە بە وتنی: "موڵك ئەوەیە مرۆڤ دەبێتە خاوەنی لە شتە بەرجەستەکان و سوودبەخشەکان" ماڵ(دارایی)یش مادەی (١٢٦)ی گۆڤارەکە پێناسەی کردووە بە وتنی: "ماڵ (دارایی) ئەوەیە سروشتی مرۆڤ لا بەلایدا دەکاتەوە و دەتوانرێت پاشەکەوت بکرێت بۆ کاتی پێویست")) پاشان لەم دوو مادەیە دەگاتە دەرئەنجامێك کە رێژە لە نێوان ماڵ(دارایی) لەگەڵ موڵکی گشتی و تایبەتی رەهادا ئەمەیە: ((هەموو ماڵێك(داراییەك) موڵکە، بەڵام هەموو موڵکێك ماڵ نییە))

لەگەڵ ئەوەی رێژە لە نێوانیاندا لەبەر رۆشنایی ئەوەی لە مادەی (١٢٥، ١٢٦)ی گۆڤارەکەدا هاتووە بریتییە لە گشت و تایبەت لە رووپەکەوە: ئەو دوانە بۆ نموونە لە ئۆتۆمبێل و خانوودا کۆدەبنەوە و لە شتە موباحەکاندا لەیەکتر جیادەبنەوە، بۆیە ئەوە ماڵ(دارایی)ە نەك موڵك، لە سسوودبەخشەکانیشدا موڵکە نەك ماڵ چونکە پاشەکەوت ناکرێت.

---

[1] الحقوق العينية الاصلية لاستاذنا الاستاذ شاكر ناصر، ص٢.

ڕێسا یاساییەکان لە ماناد فەرمانەکان و نەهیلێکراوەکانن کە ئاڕاستەی ئەوانە کراون بۆی ملکەچ دەبن تاکو پابەندیان بکەن بە کۆمەڵە کردەوەیەکەوە لە ئەرك و پابەندبوونەکان، هەر بەو جۆرە کۆمەڵێك کار و کردەوەی تاوانکاریان لە پرسە تاوانئامێزەکان و هەڵسوکەوتە نارازییەکان لە بابەتە مەدەنییەکاندا لێ قەدەغە دەکات، سەرباری ئەوە شێوازی یاسادانەران بریتییە لە رستەی راگەیاندن لە داڕشتنە یاساییەکاندا بەبێ بەکارهێنانی شێوازی رستەی داخوازی و نەهی لێکردن، وەك "ئەو کارە ئەنجام مەدەن" یان "ئەو کارە ئەنجام بدەن"... بەپێچەوانەی شێوازی شوێنپێ هەڵگیراو لە شەریعەتی ئیسلامدا کە زۆرجار رستەی داڕێژراوی داخوازی و رستەی دانانی لە فەرمانەکان بەکاردەهێنێت، وەك ((نوێژ ئەنجام بدەن))، ((لەسەر خێر و چاکە کۆببنەوە))، ((لەپێناوی خوادا خەرج بکەن))، لە نەهیلێکراوەکانیش، بۆ نموونە: ((نەفسێك کە خودا حەرامی کردووە مەیکوژن مەگەر بە حەقی خۆی))، ((ماڵ و سامانتان بە ناحەق لە نێوان خۆتاندا مەخۆن))، ((لە زینا نزیك مەبنەوە))

هەندێ جار قورئان شێوازی رستەی راگەیاندن لە فەرمانەکاندا دەگرێتە بەر، بۆ نموونە: ((والوالدات يرضعن أولادهن حولين كاملين)). وفي النواهي مثل: ((ومن يقتل مؤمناً متعمداً فجزاؤه جهنم خالداً فيها))[1]، سزاکە ئاماژە بە حەرام کردنی کوشتن دەکات و ئامادەیە بەوەی نەهی لێکراوە.

**داڕشتەی ڕێسا یاساییەکان لەو سۆنگەیەوە کە رستەی راگەیاندنن لەرووی شێوازەوە لەسەر ئەم شێوانە دێن:**

أ- لەسەر شێوەی بابەتی هەڵدراوی مەنتقی ئەرێی، وەك: ((تۆمەتبار بێگوناهە تا تاوانبار کردنی لە دادگای یاساییدا دەسەلمێت))[2]، ((مافی بەرگری پیرۆزە لە هەموو قۆناغەکانی لێکۆڵینەوە و دادگاییدا بەپێی حوکمەکانی یاسا))[3].

ب- یان لەسەر شێوەی بابەتی هەڵدراوی مەنتقی نەرێیی، وەك: ((تاوان و سزا بوونیان نییە بەپێی حوکمەکانی یاسا نەبێت))[1]، ((دروست نییە کەسێك

---

[1] سورة النساء/٩٣.

[2] الدستور المؤقت (م٢٠) ف أ.

[3] الدستور المؤقت (م ٢٠) ف ب.

بگیرێت یان رابگیرێت یان بەند بکرێت یان بپشکنرێت بەپێی حوکمەکانی یاسا نەبێت))[2]، ((سزا دروست نییە بۆ کردارێك نەبێت کە یاسا بە تاوانی دادەنێت لە کاتی نزیکبوونەوەی لەو تاوانە))[3]

ت- یان لەسەر شێوەی بابەتی مەرجی مەنتقی لکاو، وەك: ((گەر منداڵێك تاوانێکی ئەنجامدا و لە کاتی حوکم بەسەردا دانی بوو بوو بە لاو ئەوا بەو سزا بڕیار لەسەردراوە بۆ تاوانەکە حوکمی بەسەردا دەکرێت وەك ئەوەی منداڵ بێت))[4]

پ- یان لەسەر شێوەی بابەتی مەنتقی سەربەخۆ، وەك: ((گەر تاوانەکە تاوانکاری بوو ئەوا سزا دەدرێت بە بەندکردن و تاوانانە یان یەکێك لەو دوو سزایە))[5]

بینا لەسەر ئەوەی باسمان کرد ریسا یاساییەکان لە سۆنگەی رووالەت و شێوەیانەوە پرسی مەنتقین، ئەوانەش یان هەڵدراوی ئەرێن یان نەرێن، یاخود مەرجی لکاوی پێویست یان رێکەوتنی ئەرێنی یان نەرێنین، یاخود تەنها مەرجی سەربەخۆ رێگر لە کۆکردنەوە یان تەنها رێگر لە خاڵیبوونەوە یان سەربەخۆی راستەقینەن(رێگر لە کۆکردنەوە و خاڵیبوونەوە پێکەوە).

رۆشنکردنەوەی ئەمەش لە دوو باسدا دەخەینە روو، باسی یەکەم لە بابەتە هەڵدراوەکاندا، دووەمیان لە مەرجییدا.

---

[1] الدستور للمؤقت (م٢١).

[2] الدستور المؤقت (٢٢).

[3] الدستور للمؤقت (م٢١).

[4] قانون العقوبات العراقي النافذ (م٧٤/٢).

[5] هەر کەس هەواڵی درۆ لەمەڕ تاوانێك کە روویداوە بە دەسەڵاتدارانی تایبەت رابگەیاند و زانی هەواڵەکە درۆیە، گەر تاوانەکە کەتن کردن بوو ئەوا سزا دەدرێت بە بەندکردن و تاوانانە یان بە یەکێك لەو دوانە.

# باسی یەکەم:
# بابەتی هەڵدراویی

ڕێسا یاساییەکان گەر تیایدا حوکم کرابێت بە رووداني جێگیر کردنی شتێك بۆ شتێك یان روونەدانی بە هەڵدراوی ناودەبرێت و حوکم بەسەردا کرلو بە بابەت ناو دەبرێت، حوکم پێکرلویش بە هەڵدراو[1] ناودەبرێت، کەوابوو بابەتی هەڵدراویی: لە بابەت و هەڵدراو پێکدێت، وەك: ((سزا تاکەکەسییە)) [2]

لەم نموونەیەوە: ((سزا)) لە زاراوەی مەنتقدا بریتییە لە بابەت، بە دەربڕینی زانایانی نەحو پێی دەوترێت: پاڵدرلو، لە زاراوەی یاساشدا پێی دەوترێت: حوکم بەسەرکرلو(حوکمدرلو)، ((تاکەکەسی))ش لە مەنتقدا هەڵدرلوە، چونکە هەڵدەدرێتە سەر بابەتەکە، لە نەحودا پاڵە و لە یاسادا حوکم پێکرلوە.

پاڵدراویی یان ئەرێیە ئەوەش ئەوەیە کە حوکمی تێدا دەکرێت بە جێگیر کردنی هەڵدرلو بۆ بابەت، وەك لەو نموونەی باسمان کرد، یان نەرێیە ئەوەش ئەوەیە کە حوکمی تێدا دەکرێت بە نەرێ کردنی هەڵدرلو بۆ بابەت، وەك: شێت لەڕووی تاوانەوە نابەرپرسە.

## مەرجەکانی بابەتی هەڵدراویی ئەرێ:

لە بابەتی هەڵدراویی ئەرێدا دوو خاڵ بە مەرج دەگیرێن، کە ئەمانەن:

مەرجی یەکەم: دەبێ بابەت و هەڵدرلو یەکگرتووبن لە ئامـاژەی گشـتی بۆ سـەر زۆرێك لە تاکەکان، بەوەی بەرلسترلنینەکانی بابەت و هەڵدرلو لە دەرەوەی زەینی مرۆڤەوە تەنها یەك شت بێت، ئەمەش بۆ ئەوەی هەڵدانی هەڵدرلو بۆ سەر بابەت دروست بێت، چونکە لە باری جیاوازیدا هەڵدانەکە پووچ دەبێت، بۆیە -بۆ نموونە- ناوترێت رووەك بێگیانەکانە.

---

[1] البرهان المرجع السابق، ص١٣٧.

[2] الدستور المؤقت (م٢١).

مەرجی دووەم: هەڵدرلو و بابەت لە تێگەیشتندا گونجاو بن، تاکو هەڵدانەکە بەسوود بێت، بۆیە ناوترێت: تاوان تاوانە، چونکە قسەیەکی بێبنەمایە.

ڕێساکانی زانستی مەنتق داوا دەکەن ئەو دوو مەرجە بوونیان هەبێت لە هەر بابەتێکی هەڵدراویی ئەرێدا، بینا لەسەر ئەوە ئەوەی لەم ماددەدا هاتوون لە بابەتە نا مەنتقییەکانن، بۆیە هەڵدان تیایاندا پووچە بەهۆی دواکەوتنی مەرجی یەکەم تیایاندا:

یەکەم: مادەی (١١١) لە پرۆژە یاسای مەدەنی نوێ کە دەقەکەی دەڵێت: ((پابەندبوون ئەرکێکی یاساییە بە پیادەکردنی سنووردار...)) ئەم بابەتە هەڵدراوییە ئەرێییە مەرجی یەکەمی تێدا بەدینەهاتووە، چونکە پابەندبوون و ئەرک بەڕاستزانینەکەیان جیاوازە، چونکە سێ زاراوە لە مادەی (وجب) بوونی هەیە کە لە خود و چییەتیاندا لەیەکتر جیاوازن، ئەوانەش: (واجب، إیجاب، وجوب)ن.

واجب(ئەرک): بریتییە لە پیادەکردنی پێویست لەڕووی ناچارکردن و پابەندکردنەوە، دەوترێت: پیادەکردنی نوێژ واجبە لەسەر هەموو موسڵمانێك، گێڕانەوەی قەرز لەلایەن قەرزدارەوە واجبە، پیادەکردنی خزمەتی سەربازی واجبە لەسەر هەموو هاوڵاتییەك..

بۆیە واجب وەسفێکە بۆ کارێکی پێویستکراو و پێیەوەی راوەستاوە.

الإیجاب: بریتییە لە پابەندکردنی کەسی پابەند بە پیادە کردنی داوایەك لێی لەڕووی ناچارکردنەوە، ئەوەش سیفەتی یاسای فەرمانکەرە بەو پیادەکردنە و سەرچاوەیەکی شەرعییە یان یاساییە بۆی.

الوجوب: بریتییە لە خەریککردنی ئەستۆی قەرزدار بە ماف کەسی ترەوە، پێویست دەبێت لەسەری یەکلابێتەوە بە پیادەکردنی ئەو مافە بۆ خاوەنەکەی، ئەمەش لە خودی خۆیدا مانای پابەندبوون و ئەوەی دەیگەیەنێت دەبەخشێت.

کەوابوو "وجوب" بریتییە لە پابەندوون، پابەندبوونیش بریتییە لە "واجب"، بۆیە دروستە وجوب هەڵبدرێتە سەر پابەندبوون لە بابەتی هەڵدراویی ئەرێدا کە ڕێسایەکی یاسایی دەنوێنێت، چونکە ئەوەی دەیگەیەنن یەك شتە، ئەوەش خەریککردنی ئەستۆیە بەوەی پێویستە خۆی لێ یەکلابکاتەوە، بۆیە ئەم مادەیەم پێشنیار کرد بۆ بەڕێزان ئەندامانی ئامادەکردنی پرۆژەی راستکردنەوە بە گۆڕینی وشەی "واجب" بە "وجوب" بۆیە تکام وایە پێشنیارەکەم وەربگیرێت.

دووەم: مادەی (٣٥٩)ی هەمان پرۆژە بە دەق هاتووە کە: ((جێگەی گرێبەست بریتییە لەو پیادەکردنەی کە قەرزکەر پێیەوە پابەند دەبێت)) ئەمەش دیسان بابەتێکی هەڵدراویی ئەرێی نامەنتقییە، چونکە ئەوەی بابەتەکە دەیگەیەنێت(جێگەی گرێبەست) لەگەڵ هەڵدراو(پیادەکراو) یەکناگرن و کۆنابنەوە لە یەك شتدا، بەڵکو جێگەی گرێبەست بریتییە لە گرێبەست لەسەرکراو، ئەوەش سیفەتێکی راوەستاو نییە بە یەکێك لە دوو کەسی گرێبەستکار لە کاتێکدا پیادەکردن وەسفێکی راوەستاوە بە گرێبەستکارەوە، پاشان پرۆژەکە لەناو جێگەی گرێبەستدا ئەم خاڵانەیان بە مەرج گرتووە:

١. گونجاو بێت(م٣٦١)

٢. دیاریکراو بێت بە دیاریکردنێکی تەواو(م٣٦٣)

٣. مامەڵە پێکردنی پێچەوانەی یاسا و سیستمی گشتی نەبێت(م٣٦٥).

ئەم مەرجانە بریتین لە مەرجی گرێبەست لەسەرکراو نەك مەرجی پیادە کردن.. بۆیە جێگەی گرێبەست نین، کەوابوو دروست نییە یەکێکیان هەڵبدرێتە سەر ئەویتریان.

سەرئەنجام پێشنیارم کرد بۆ بەڕێزان ئەندامانی لیژنەی پرۆژە یاسای راستکردنەوە بەم جۆرە:

((جێگەی گرێبەست ئەو شتەیە قەرزدار بە پیادەکردنی پێیەوە پابەندە))

هیوام وایە پێشنیارەکەم وەربگیرێت.

سێیەم: مادەی (٤٣٩) لە یاسای سزا عێراقییەکانی جێبەجێکار، پێناسەی دزی دەکات و دەڵێ: ((السرقة اختلاس مال منقول لغير الجاني عمداً))((دزی بریتییە لە گزیکاریی لەماڵێکی گوازراوەدا بە ئەنقەست کە هی کەسی تاوانکار نەبێت)).

ئەمە بابەتێکی هەڵدراویی ئەرێیە کە دیسان مەرجی یەکەمی دوو مەرجە باسکراوەکەی تێدا نەهاتۆتە دی، ئەوەش بریتییە لە یەکگرتن لە مانای گەیەنراوی دزی جیا لە مانای گەیەنراوی گزیکاریی، بۆیە لەسەر ئەم دارشتەیە کۆمەڵێك هەڵەی مەنتقی سەرهەڵدەدات، لەوانە:

١–رێسا مەنتقییەکە دەڵێت: رێژە لە نێوان مانای زمانەوانی و مانای زاراوەییدا بریتییە لە گشتی و تایبەتی رەها، چونکە مانای زاراوەیی مانای زمانەوانی لەئامێز دەگرێت لەگەڵ زیادەیەك کە خراوەتە سەری، بۆ رۆشنکردنەوەی ئەمە:

وشەی (صلاة-نوێژ) لە زمانی عەرەبدا بە مانای "دعاء-دوعا" هاتووە، خاوەن شەرعی ئاسمانیی ئەم مانایەی لە مانا زمانەوانییەکەوە گواستۆتەوە بۆ مانا زاراوەییە شەرعییە نوێیەکەی کە بریتییە لە عیبادەتێکی تایبەت کە گوفتار و کردار لە ئامێز دەگرێت و بە "الله أكبر" دەست پێ دەکات و بە سەلام دانەوە(السلام عليكم ورحمة الله وبركاته) کۆتایی پێ دێت، ئەم عیبادەتە مانای زمانەوانی لە خۆ دەگرێت کە بریتییە لە دوعا، کەواتوو هەموو "صلاة"یێك دوعایە، بەلأم هەموو دوعایەك "صلاة" نییە، هەر بەو جۆرە وشەی "رهن-بارمتە" لە زمانی عەرەبیدا بە مانای "حبس-راگرتن" یاسادانەر لە مانای زمانەوانییەوە بۆ مانای یاسایی گواستوویەتەوە کە بریتییە لە گرێبەستێك بەهۆیەوە مالّی بە رەهنگیراو دەگوازرێت بۆ دەستەبەرکردنێکی تایبەت بۆ قەرزکەر و قەرزەکەی لێوە بەدەست دەهێنرێتەوە لە کاتی نەتوانینی گێرانەوەی قەرزەکە یان قەرزکەر نەیەوێت قەرزەکە بگێرێتەوە، ئەم مانا زاراوەییە یاساییە مانا زمانەوانییەکەش لەخۆ دەگرێت، چونکە هەموو رەهنێك گیردانی مالّی بە رەهنگیراو و نادروستی مامەڵەپێکردنی دەگەیەنێت لەلایەن کەسی قەرزداری خاوەن مالّەوە بە مامەڵە پێکردنێك زیان بە قەرزدەری رەهنگر بگەیەنێت.

بینا لەسەر ئەمە مانای زاراوەیی بەرەهایی و بە هەمیشەیی تایبەتتر لە مانای زمانەوانی، ئەم ریسایە دوالکەوتووە لە گواستنەوەی وشەی "لختلاس-دزیکاری" لە مانا زمانەوانییەکەی -کە بریتییە لە بردنی مالّی کەسێکی تر بە ئاشکرا- بۆ مانای زاراوەیی -کە بردنی مالّی کەسێکی ترە بە شاراوەیی- چونکە دزی بریتییە لە بردنی مالّی کەسێکی تر بە شاراوەیی، دەوترێت"استرق السمع" گەر بە شاراوەیی گوێی گرتبێت، یان "سارق النظر" گەر چاوەروانی بێئاگایی کەسەکە بکات بۆ ئەوەی سەرنجی بدات، دزیکردن تەنها لە بێئاگایی دزی لێکراو و نەبوونی زانستی بە کارەکە سەرهەڵدەدات، بەلأم "لختلاس-گزیکاریی" بریتییە لە بردنی مالّی کەسێکی تر بە شێوەیەکی ئاشکرا بە رێگەی دلگیرکاری، چونکە "الخلس" لە زمانی عەرەبیدا بریتییە لە دلگیرکاری، "التخالس"یش بریتییە لە "التسلب"، دەوترێت: "تخالس القوم الشيء- خەلکە گزیکریان کرد لە شتەکەدا" واتە "تسالبه-دلگیریان کرد"

٢.هەڵدانی وشەی "اختلاس-گزیکاری" بۆ سەر "السرقة-دزیکردن" لەم بابەتە هەڵدانییەدا جیانەبوونەوەی نێوان بردنی مالّ بە شاراوەیی و بردنی مالّ بە ئاشکرای لێوە پەیدا دەبێت، لەمەشەوە بە پێویستبوونێکی مەنتقیانە جیانەبوونەوەی نێوان "دزی ئاشکرا کامەیە و دزی

شارلوه کامەیه؟" لێوەی سەرهەڵدەدات، سەرباری ئەوەی دزی ئاشکرا تاوانەکەی سوکتر و ترس و هەڕەشەکەی کەمترە لە دزی شارلوه، پاشان لەمەوە بە پێویستبوونێکی مەنتقیانە پێویست دەکات حوکم بکەین بەسەر دوو تاوانی جیاواز لە حەقیقەت و ترس و هەڕەشەدا بە یەک حوکم، ئەمەش دادپەروەری رەدی دەکاتەوە، گەر یاسادانەری عێراقی بیەوێت بە یەک تاوان تەماشایان بکات لە سۆنگەی سزا و ترس و هەڕەشەوە ئەوا پێویستە هەر یەک لەوانە بە پێناسەی دروست پێناسە بکات، پێناسەی دزی بکات بەوەی بردنی ماڵی گوازراوەی بەمولکراوی کەسانی ترە بەدەر لە تاوانکەر بە شارلوەیی و بە ئەنقەست(واتە بە مەرامی تاوانکاری)، هەروەها پێناسەی گزیکاریی بکات بەوەی: بردنی ماڵێکی گوازراوەی بە مولککراوی کەسانی تر بەدەر لە کەسی تاوانکەر بە شێوەیەکی ئاشکرا و بەئەنقەست، لەو بارەدا هەڵدانی بابەتەکە بۆ سەر هەڵدراو لە هەردوو پێناسەکەدا دروستە، ئەو کات مانای زاراوەیی لە هەردووکیاندا تایبەتترە لە مانای زمانەوانی بەرەهایی.

## باسی دووەم:
## بابەتی مەرجی

رێسا یاساییەکە گەر حوکمی تێدا بکرێت بە پەیوەستبوونی ناوەڕۆکی بابەتێک بە ناوەڕۆکی بابەتێکی ترەوە، پێی دەوترێت بابەتی مەرجی لکاوی ئەریێ[1].

گەر حوکی تێدا بکرێت بە جیابوونەوەی یەکێک لە دوو بابەتەکە لەویتریان پێی دەوترێت بابەتی مەرجی سەربەخۆی ئەریێ[2]، بینا لەسەر ئەمە بابەتی مەرجی دابەش دەبێت بۆ دوو بەش: ((مەرجی لکاو(پەیوەست)، و مەرجی سەربەخۆ)).

---

[1] لەوانەیە حوکم تیایدا بە روونەدان و نەرێ کردنی ئەو پەیوەستبوونە بێت، ئەو کات بابەتێکی مەرجی پەیوەستی نەرێیە، وەک: (هەر کات مرۆڤ تۆمەتبارکرا تاوانبار نییە) باسی مەرجی پەیوەستی نەرێم پشتگوێخست بەهۆی گرنگی نەبوونی لە پرسە قەزائییەکاندا.

[2] هەندێ جاریش حوکم تیایدا بە نەرێ کردنی دابڕان(جیابوونەوە) دەبێت، ئەمەشم پشتگوێخست لەبەر بێسوودییەکەی لەرووی یاسایی و کردارییەوە.

## یەکەم - بابەتی مەرجی لکاو(پەیوەست)؛

ئەمەش لە دوو رەگەز پێکدێت بەجۆرێك دەستەبەربوونی ناوەرۆکی یەکێکیان هۆیە بۆ دەستەبەربوونی ناوەرۆکی ئەویتریان.

رەگەزی هۆیەکە لە لای نەحوییەکان پێی دەوترێت: ((مەرج))، لەلای یاساناسان پێی دەوترێت: ((هۆ))، لە زاراوەی مەنتقییەکانیشدا پێی دەوترێت: ((پێشخراو))، چونکە ئاستی هۆ پێشکەوتووە لە ئاستی سەبەبکار لە بوون و دەستەبەربووندا، با لە گوزارە و دەربڕینیشدا دواکەوتبێت.

هەر بەو جۆرە بە رەگەزی سەبەبکار لە لای نەحوییەکان دەوترێت: ((پاداشت))، لەلای یاساناسان پێی دەوترێت: ((سەبەبکار))، و لە مەنتقیشدا پێی دەوترێت: ((دواخراو))، با "سەبەبکار"یش پێشکەوتبێت لە گوزارە و دەربڕیندا، هەندێ لە زانایانی مەنتق کەوتوونەتە ناو تێکەڵییەکەوە و پێیان وایە هەموو ئەوەی یەکەمجار باس دەکرێت "پێشخراو"ە و هەموو ئەوەی دوادەکەوێت "دواخراو"ە، ئەمەش هەڵەیە، چونکە وەسفی پێشخراو جێگیرە بۆ "هۆ" و یەکسانە لە دەربڕیندا پێشکەوتبێت یان دواکەوتبێت، هەر بەو جۆرە وەسفی "دواخراو" جێگیرە بۆ سەبەبکار با لە گوزارەشدا پێشکەوتبێت.

| پێشخراو | دواخراو |
|---|---|
| گەر منداڵێکی دەستبەسەرداگیراو | پێویستە لێیەوە بگوێزرێتەوە بۆ |
| لە قوتابخانەیەکی چاکسازی | قوتابخانەی لاوانی تاوانکار تاکو |
| تەمەنی هەژدە ساڵی تەواو کرد | ئەو ماوەیەی ماوە لە دەستبەسەرداگرتنی |
| | حوکم بەسەردادراو لەو شوێنە تەواوی بکات[1] |

"مەرجی پەیوەست"یش یان رێکەوتنییە یاخود پێویستبوونییە.

[1] قانون العقوبات العراقي النافذ (م٧٤/٤).

**أ-بابەتی مەرجی پەیوەستی رێکەوتی:**

ئەمەش ئەوەیە کە پەیوەست تیایدا لە نێوان پێشخرلو و دواخرلودایە لە دەروازەی رێکەوتەوە، بەبێ ئەوەی پەیوەندییەکی هۆگەرایی و سەبەبکاری لە نێوانیاندا هەبێت، لەبەر نەبوونی بایەخی ئەم جۆرە لە مەرجی پەیوەست تەنها بەم نموونە دەوەستین، پاشان روودەکەینە مەرجی پەیوەستی پێویستبوونی بە هۆی ئەو گرنگییە کردارییەی کە هەیەتی.

| پێشخرلو | دواخرلو |
| --- | --- |
| گەر تاوانلێکرلو لە شوێنی | ئەوەش سەریکێشا |
| روودلوەکەوە گوازرایەوە | بۆ مردنی کەسەکە بە روودلوی |
| بۆ خەستەخانە | بەیەکتردا کێشان. |

ئەم بابەتە رێکەوتییە، لەباری روودلنیدا لە دەروازەی رێکەوتەوەیە، چونکە پەیوەندییەکی هۆگەرایی و سەبەبکاری لە نێوان پێشخرلو و دواخرلودا بوونی نییە.

**ب- بابەتی مەرجی پەیوەستی پێویستبوونی:**

ئەمەش ئەوەیە کە "پێشخرلو" تیایدا "هۆ و پێویستکراوە"، بۆیە "دواخرلو" "سەبەبکار و پێویست"ە، بە جۆرێك هەر کات یەکەم دێتە دی دووەم بەدی دێت، لەسەر ئەو بنچینەی کە بوونی "پێویستکرلو" ئاتاج بە بوونی "پێویست"ە بۆی.

| پێشخرلو | دواخرلو |
| --- | --- |
| گەر کردارێك روویدا وەك | تاوان نییە |
| بەکارهێنانی مافی | (واتە تاوان بوونی نییە و |
| بەرگری شەرعی | راست نەبووەتەوە) |

لەم رێسا یاساییەدا کە لە مادەی(٤٢)دا هاتووە لە یاسای سزاکانی جێبەجێکار "دواخرلو" (تاوان نییە) لەسەر "پێشخرلو" پێشکەوتووە لەرووی گوزارە و دەربڕینەوە، لەگەڵ ئەوەی لە هاتنە دی و بووندا دواکەوتووە، ئەم رێسایە بابەتێکی مەرجی پەیوەستی پێویستبوونییە، چونکە بوونی "پێشخراو" ئاتاجی بوونی "دواخرلو"ە و هاتنە دی "دواخرلو"یش پەیوەستە بە هاتنە دی "پێشخرلو"ەوە

| پێشخراو | دواخراو |
| --- | --- |
| گەر تاوانکەر بە ئەنقەست مادەی سەرخۆشکەر یان بێهۆشکەری خوارد بوو بە نییەتی هەستان بەو تاوانەی لێیوەشاوەتەوە | ئەوە بە ڕەوشێکی توند بۆ سزاکەی دادەنرێت. |

لەم ڕێسا یاساییە هاتووەدا لە مادەی(٦١) لە یاسای سزاکان ڕەچاوی بەدوای یەکترهاتن کراوە، بۆیە "پێشخراو" پێشی "دواخراو" کەوتووە، ئەوەش دیسان بابەتێکی پەیوەستی پێویستبوونییە بەهۆی ڕاستبوونەوەی پێویستکاری نێوان "پێشخراو" و "دواخراو"، بە جۆرێك بوونی یەکەم پێویست بە بوونی دووەم دەکات، کەوابوو ڕێسا مەنتقییەکە بڕیار دەدات بەوەی: ((هەر کات "پێشخرلو" بەدی دێت "دواخراو"یش بەدی دێت))، بەڵام پێچەوانەی ئەم ڕێسایە بە پێچەوانەیەکی هەمووەکی لە زانستی مەنتقدا بوونی نییە، بۆیە ناوترێت: هەر کات "دواخرلو" بەدی هات"پێشخراو" بەدی دێت، مەگەر "دواخراو" پێویستی یەکسان یان پێویستی تایبەتتر بێت بۆ "پێشخراو"ەکە، بەڵام گەر "دواخراو" پێویستی گشتگیرتر بوو بەوەی زیاتر لە پێویستکراوێکی هەبێت، ئەوا لە بەدی هاتنی "دواخراو"ەوە بەدیهاتنی "پێشخراو" پێویست ناکات، بەهۆی دروستی بەدیهاتنی لەگەڵ "پێشخراو"ێکی تر.

بینا لەسەر ئەم ڕێسا مەنتقییە کارەکەی یاسادانەری عێراقی لە مادەی (٢/٣٥)ی[1] یاسای باری کەسێتی بە کارێکی نامەنتقی دادەنرێت، چونکە لە تەڵاقی نەخۆشدا بە نەخۆشی مردن حوکمەکەی پێچەوانەی هەمووەکی بۆ ڕێسای باسکرلو بینا کردووە ((واتە هەر کات "دواخراو" بەدیهات "پێشخراو" بەدیدێت)) بۆیە هەر کات میراتی ژنی تەڵاقدرلو لە نەخۆشی مردندا بەدیهات ڕاستبوونەوەی هاوسەرگیری لە کاتی مردندا بەدیدێت، لەو

---

[1] دەقی مادەی(٣٥): تەڵاقی ئەم کەسانە ناکەوێت:

١-سەرخۆش و شێت و گێل و زۆرلێکرلو و کەسێك جیاکردنەوەی لەدەستدابێت بە هۆی تووڕەبوون و موسیبەتێکی لەناکاو یان پیری و نەخۆشییەوە.

٢-نەخۆش بە نەخۆشی مردن یان حاڵەتێك تیاچوون زاڵە بە سەریدا، گەر لەو نەخۆشییەدا یان لەو بارەدا مرد ژنەکەی میراتی لێ دەبات.

سۆنگەیەوە کە هاوسەرداری تەنها هۆیەکە بۆ میراتی ژنەکە، لەگەڵ ئەوەی ئەو "دواخراو"ە پێویستە(میراتی ژنەکە) لەو بارەدا "پێشخراو" و پێویستکراوێکی تری بۆ هەیە جیا لە راستبوونەوەی هۆی هاوسەریی دروست، ئەوەش: ((مەرامی خراپی مێردە نەخۆشەکەیە بە نەخۆشی مردن لە کاتی تەلاقدانی هاوسەرەکەیدا))، بۆیە فەقیهان زاراوەی "تەلاقی هەڵهاتوو"یان بۆ ئەو جۆرە تەلاقە بەکاربردووەن واتە ئەو جۆرە تەلاقە وا شرۆڤە دەکرێت کە مەبەست پێی بێبەش کردنی ژنەکەیەتی لە میرات، بۆیە بە پێچەوانەی مەرامە خراپەکەی ئەوەوە مامەڵەی دەکرێت و ژنە تەلاقدراوەکە میراتی خۆی پێ دەدرێت سەرەڕای کەوتنی تەلاقەکە.

کەوابوو بۆ میراتی ژنەکە لەم بارەدا هۆیەکی تر بوونی هەیە کە لەسەری دەوەستێت جگە لە هۆی هاوسەریی، ئەوەش((مەرامی خراپە))

یاسادانەری عێراقی بەڵگە بۆ نەکەوتنی تەلاقەکە دەهێنێتەوە بۆ میرات بردنی ژنەکە بە کۆدەنگی فەقیهانی موسڵمان[1]، ئەو بەڵگەهێنانەوانەش مەنتقیین گەر بۆ میراتی ژنەکە یەك هۆ بوونی هەبوایە، ئەوەش ((هاوسەرییە))، لە کاتێکدا فەقیهانی موسڵمان میراتی ژنی تەلاقدراویان لە نەخۆشی مردنی پیاوەکەدا بەستۆتەوە بە راستبوونەوەی هۆیەکی ترەوە جگە لە هاوسەریی کە بریتییە لە مەرامی خراپ، ئەمە ئەوەیە کە لەسەری رێکەوتوون، وەك چۆن لەسەر کەوتنی تەلاق رێکەوتوون گەر هاوسەرەکە بە تەواوی هۆش و ئاگای لە خۆی بێت، بەڵام جیاوازی کەوتۆتە نێوانیانەوە لە رادەی بەریوونەوە(نەمانی)ی ئەو مافە بە تێپەڕبوونی کات.

حەنەفییەکان دەڵێن[2]: ژنی تەلاقدراو لە نەخۆشی مردنی هاوسەرەکەیدا میرات دەبات گەر پیاوەکە بەو نەخۆشییە مرد و ژنەکە هێشتا لە عیدەی تەلاقدا بوو، گەر ماوەی عیدەکە بەسەرچوو مافەکەی لە میرات بەردەبێتەوە(نامێنێت).

---

[1] بە هەڵوەردە لە ئەوان لە زاهیرییەکان و فەقیهە زەیدییەکان جیاوازیان نەکردووە لە نێوان تەلاق بە نەخۆشی مردن و تەلاق لە کات و باری تردا لەڕووی بێبەش کردنی ژنەکە لە میرات. انظر المحلی ٢١٨/١٠ وما بعدها.

الروض النضیر شرح مجموع الفقه الکبیر للصنعاني ٢١٦/٣.

[2] المبسوط للسرخسي ١٥٤/٦. بدائع الصنائع للکاساني ٢٠٦٦/٤.

حەنبەلییەكان دەڵێن[1] : میرات دەبات گەر هاوسەرگیری لەگەڵ پیاوێكی تر ئەنجام نەدابێت، گەر شووی كردەوە مافەكەی بەردەبێتەوە، وەك ئەوەی بەو شووكردنەی لە مافی خۆی دابەزیبێت.

جەعفەرییەكان[2] دەڵێن: میرات دەبات گەر مێردی نەكردبێتەوە و ساڵێك بەسەر تەڵاقەكەدا گوزەری نەكردبێت، گەر شووی كردەوە و مێردەكەی دوای ساڵێك لە تەڵاقەكەی مرد مافی میراتی ژنەكە بەردەبێتەوە.

مالیكییەكان[3] دەڵێن: بە رەهایی میرات دەبات، شووی كردبێتەوە یان شووی نەكردبێتەوە، ماوەی دوای تەڵاقدانەكەی درێژەی كێشا بێت یان نە، چونكە میراتەكە لەسەر هۆیەكە كە بریتییە لە (مەرامی خراپ) بۆیە بە تێپەڕبوونی كات بەرنابێتەوە، فەقیهە ئیبازییەكان[4] لەگەڵ مالیكییەكان هاودەنگن لەم بۆچوونەدا، شافیعییەكان[5] چەندین بۆچوونیان هەیە، هەر بۆچوونێك لەگەڵ یەكێك لە مەزهەبە ئاماژەبۆكراوەكاندا یێكدێتەوە، دوای خستنەڕووی ئەم بەدواداچوونە شەرعی و مەنتقییانە هیوایەكی زۆرمان هەیە بەوەی یاسادانەری عێراقی پێداچوونەوە بەم مادەیەدا بكات و راستی بكاتەوە بە لابردنی برگەی دووەم لە مادەكە، چونكە حوكمی هاتوو تیایدا پێچەوانەی كۆدەنگی فەقیهانی موسڵمانە و پێچەوانەیە لەگەڵ هەموو یاساكان لە وڵاتانی عەرەبی و ئیسلامی، هەروەها پێچەوانەیە لەگەڵ ریساكانی زانستی مەنتقدا.

سەرباری هەموو ئەوەی باسمان كرد قازی ناتوانێت بڕیار لە كەوتن یان نەكەوتنی تەڵاق بدات تا پیاوەكە بە نەخۆشییەكە دەمرێت كە ژنەكەی تێدا تەڵاقداوە، چونكە بە رێگەیەكی دڵنیاكەر نازانێت ئەو نەخۆشییە بریتییە لە نەخۆشی مردن و ئەوی تێدا دەمرێت مەگەر لە دوای مردنەكەی، بۆیە لەو ماوەیەدا ژنەكە سەرگەردان دەمێنێتەوە لەنێوان حاڵەتی هاوسەرداری و بێهاوسەریدا.

---

[1] المغني لابن قدامة ٦/٣٣٠.

[2] الكافي للكليني ٦/١٢. الروضة البهية شرح اللمعة الدمشقية ٢/٣٢٧.

[3] المنتقى شرح موطأ امام مالك ٤/٨٥-٨٦.

[4] شرح النيل وشفاء العليل للامام محمد بن يوسف اطفيش ٨/٢٧٦.

[5] المهذب لابي اسحاق الشيرازي// ٢٥.

پاشان گەر حوکمەکە لەسەر نەبوونی هۆش و هەست و ئاگاهی تەواو بۆ نەخۆشەکە و نەبوونی لێوەشاوەیی بیناکرابێت، ئەوا یاسادانەر ئەو حوکمەی لە برگەی یەکەم باس کردووە، بۆیە برگەی دووەم دەبێتە ناواخن و دووبارەبوونەوە.

سەرباری هەموو ئەمانە ژنەکە مافی خۆی لە میرات لەدەست نادات لەلای مالیکییەکان و ئیبازییەکان سەرەڕای کەوتنی تەلاق و شووکردنی بە مێردێکی تر.

## دووەم - بابەتی مەرجی سەربەخۆ:

ئەمەش ئەوەیە-وەك باسمام کرد- کە حوکمی تێدا کراوە بە جیابوونەوەی یەکێك لە دوو بابەتەکە لەوی تریان و زیاتریش، گرنگترین پێوەر جیای دەکاتەوە لە مەرجی پەیوەست بریتییە لە وشەی (یان) لە نێوان "پێشخراو"ەکانیدا، وەك ڕێسای یاسایی تاوانکاری هاتوو لە شێوازی مەرجی سەربەخۆدا لە مادەی (١/٣٩٣) دەستکاریکراو لە یاسای سزاکانی جێبەجێکار بەوەی: ((بە بەندکردنی هەتاهەتایی یان کاتی سزا دەدرێت هەر کەس چووە لای مێیینەیەك بەبێ ڕازیبوونی یان نێربازی لەگەڵ نێرێك یان مێیەك کرد بەبێ ڕازیبوونی نێرەکە یان مێیەکە)) ئەم بابەتە لە زانستی مەنتقدا پێی دەوترێت: ((سەربەخۆ)) بەهۆی نەگونجای کۆکردنەوە لە نێوان هەموو پێشخراوەکان، وەك کۆکردنەوەی بەندکردنی هەتاهەتایی لەگەڵ بەندکردنی کاتی لە یەك کاتدا و لە یەك بابەت و تایبەت بە یەك کەس.

سەربەخۆ بۆ سێ بەش جۆر[1] دەبێت:

أ.سەربەخۆی ڕاستەقینە: ئەوەیە کە لە نێوان دوو حوکم یان زیاتردا دەسوڕێتەوە بە جۆرێك ڕێگرە لەبەردەم کۆکردنەوەی نێوان هەمووان وەك چۆن ڕێگرە لەبەردەم خاڵیبوونەوەی نێوان هەمووان، چونکە لە شتێك و هەڵوشێنەری شتەکە پێك دێت، بۆیە بوونی یەکێکیان نەبوونی ئەویتریان پێویست دەکات بەهۆی نەشیاویی کۆکردنەوە لەگەڵ یەکتر، هەر بەو جۆرە نەبوونی یەکێکیان بوونی ئەویتریان پێویست دەکات بەهۆی نەشیاویی خاڵیبوونەوە.

---

[1] التفتازاني، تهذيب المنطق، مع الدسوقي والتجريد الشافي على شرح الخبيصي ، ص١٤٤-١٤٥.

له بیرکاریدا دەوترێت: ((گەر ژمارە بوو یان جووتە یان تاکە)) بۆیە ئەوە بابەتێکی مەرجی سەربەخۆی راستەقینەیە بەجۆرێك وێنا ناکرێت یەك ژمارە پێکەوە تاك و جووتیش بێت یان نە تاك بێت و نە جووتیش بێت.

له یاسادا دەوترێت: ((هەر کەس دەستی بەسەردا بگیرێت یان بێگوناهە یان تاوانبارە)) بۆیە بابەتێکی مەرجی سەربەخۆی راستەقینەیە بەهۆی نەشیاویی کۆکردنەوەی نێوان دوو وەسفی بێگوناه و تاوانبار لە یەك کەسدا و لە یەك کاتدا و تایبەت بە یەك بابەت، و هەروەها نەشیاویی خاڵیبوونی لە یەکێك لە دوو وەسفەکە پێکەوە.

ب-سەربەخۆی رێگر لە خاڵیبوونەوە: ئەمەش بابەتی مەرجی سەربەخۆی راستەقینەیە زیاتر لە حوکمێك لە ئامێز دەگرێت، بەجۆرێك بتوانرێت لە پیادە کردندا کۆکردنەوە بکرێت لە نێوان "هەموو"دا، بەڵام رێگرە لە خاڵیبوونەوە لە "هەموو" گەر مەرجەکانی پیادە کردن فەراهەم بوون، وەك لە رێسای یاسایی تاوانکاری هاتوو لەسەر شێوازی بابەتی مەرجی سەربەخۆ رێگر لە خاڵیبوونەوە لە مادەی (٢٣١) لە یاسای سزاکانی جێبەجێکاردا هاتووە کە گوزارەکەی بەم جۆرەیە: ((سزا دەدرێت بە بەندکردن بۆ ماوەیەك کە لە سێ ساڵ زیاتر نەبێت و بە تاوانانە(غرامە) یان بە یەکێك لەو دوو سزایە هەر کەس بە ئەنقەست رێگری لە فەرمانبەرێك یان هەر کەسێکی تر بکات کە داوای لێکراوە بە خزمەتێکی گشتی هەڵبستێت وەك هەستان بە ئەرکی سەرشانی))[1]، ئەم رێسایە(ئەم بابەتە) دوو حوکم لەخۆ دەگرێت: (بەندکردن لەگەڵ تاوانانە(غرامە)) یاسادانەر تیایدا دەسەڵاتی بە قازی داوە کۆیان بکاتەوە پێکەوە، بەڵام قازی ناتوانێت واز لە پیادە کردنی هەردووکیان بهێنێت تا پایە و مەرجەکانی تاوان فەراهەم بن و هیچ رێگرێك لە ئارادا بوونی نەبێت.

ج-سەربەخۆی رێگر لە کۆکردنەوە: ئەوەش بابەتی مەرجی سەربەخۆیە، زیاتر لە حوکمێك لەخۆ دەگرێت، بە جۆرێك لە پیادە کردندا رێگری دەکات لە کۆکردنەوە لە نێوان هەمواندا، بەڵام دەتوانرێت لە هەموو خاڵی ببێتەوە و پیادە کردن بوونی نەبێت، واتە لەو

[1] ئەمە بابەتێکی مەرجییە، چونکە خەمڵاندنەکەی: هەر کەس بە مەرام رێگری لە فەرمانبەرێك کرد، هتد.. بە بەندکردن سزا دەدرێت، هتد... وشەی(هەرکەس) ناوێکی مەرجییە و ئەوەی بەدوایدا دێت رستەیەکی مەرجییە و سزاش لەسەر بوونی ئەو مەرجە بنیاکراوە.

حوکمانەی لە بابەتەکەدا هـاتوون، وەك لـە رێسـای یاسـایی تاوانکـاری هـاتوو لـە شـێوازی بابەتی مەرجی سەربەخۆی رێگر لـە کۆکردنـەوە لـە مـادەی (١/١٧٥) لـە یاسـای سـزاکانی جێبەجێکار کە بە دەق هاتووە: ((سزا دەدرێت بە بەنـدکردنی هەتاهـەتایی یـان کـاتی هـەر کەس بەشداربوو لە رێکەوتنێکی تاوانکاریدا کە مەرام تیایدا هەستان بوو بـە تاوانگـەلێك کـە دەقی لەسـەر هـاتووە لـە مادەکـانی(١٥٦وە بـۆ ١٧٤) یـان بـەکاربردنی وەك هۆکارێـك بـۆ گەیشتن بە مەرامی بەمەبەستگیراو لێیەوە))، ئـەم رێسـایە(ئەم بابەتـە) دوو حـوکم لـە خـۆ دەگرێت: ((بەنـد کردنـی هەتاهـەتایی و بەنـد کردنـی کـاتی)) رێگـرە لـەوەی هـەردووکیان کۆبکرێنـەوە، بۆیـە رێگـرە لـە کۆکردنـەوە، بـەڵام رێگـر نییـە لـە خاڵیبوونـەوەی هـەردوو حوکمەکە پێکەوە، بە جۆرێك دروستە بۆ قازی واز لە جێبـەجێ کردنـی هـەردوو حوکمەکـە بهێنێت، ئەوەش بە بەڵگەی مادەی (١٨٧)ی ئەو یاسایە کە دەقەکەی دەڵێـت: ((لـەو سـزا بڕیار لەسەردراوانەی بۆ تاوانەکان کـە لـەم دەروازەیـەوە بینـاکراون کەسـێك لـە تاوانکـاران دەبووررێت گەر هەموو ئەوەی دەیزانی دەسەڵاتی گشتی لـێ ئاگـادار کـردەوە بـەر لـەوەی هەستێت بە جێبەجێ کردنی تاوانەکە و بەر لە دەست کردن بە لێکۆڵینەوە))

لەبەر رۆشنایی ئەم مادەیەدا بابەتی مەرجی سـەربەخۆی هـاتوو لـە مـادەی (١/١٧٥)دا سەربەخۆی رێگرە لە کۆکردنەوە، بەڵام رێگر نییە لە خاڵیبوونەوە[١].

---

[١] لمزيد من التفصيل بالنسبة للشرطية المتصلة والمنفصلة راجع المراجـع الاتيـة: البرهـان المرجـع السـابق، ص٢٣٠–٢٣٤.

تحرير القواعد المنطقية شرح رسالة الشمسية المرجع السابق ص١٥٣ وما بعدها.

تهذيب المنطق مع الخبيصي والدسوقي ص١٤١ وما بعدها.

ايساغوجي في المنطق مع شرحه وحاشية العطار ص٨٥ وما بعدها.

# بەشی شەشەم

# مەنتق و بەڵگە قەزاییەکان

لە سەرەتای گوێگرتن بۆ داوا و وەرگرتنیەوە و سەرنجدان بە رووداوەکە و چۆناندنی و دەرهێنانی حوکمەکان لە دەقەکان و بوون بە هۆیان تا کۆتایی دەرکردن و جێگیرکردنی بڕیار قازی شان دادەت لەسەر بەڵگەگەلێك کە هەندێکیان نەقلێن و قازی بۆیان گەردنکەچە و هەندێکی تریان ئەقلێین و قازی تیایدا بڕیاردەرە و هەندێکی تر سیفەتێکی دوو لایەنەیان هەیە ئەقلێن لە هەندێ لە پێشەکییەکانیاندا و نەقلێن لە هەندێکی تریاندا و حوکمی بەڵگە نەقلییەکانیان هەیە.

## بەڵگە:

گەر لە زانستی مەنتقدا وشەی بەڵگە بەکارهێنرا بەزۆری مەبەست پێی پێوانەی مەنتقییە[1].

## پێوانەی مەنتقی:

لە دوو پێشەکی و زیاتر پێك دێت، هەر کات پێی رادەست بێت سەرئەنجامی لێوە بۆ خودی خۆی پێویست دەبێت.

ئەوەش دوو بەشە: پێوانەی بەراوردکاری(اقتراني) و پێوانەی هەڵاوەردەیی، بەراوردکاری دابەش دەبێت بۆ بەراوردکاری هەڵدراو و بەراوردکاری مەرجی، هەر بەو جۆرە هەڵاوەردەیی دابەش دەبێت بۆ هەڵاوەردەیی لکاو و هەڵاوەردەیی دابڕاو:

**یەکەم - پێوانەی بەراوردکاری هەڵدراوی:**

ئەمەش پێکدێت لە: (دوو پێشەکی+ئەنجام)

پێشەکییەکانی پێکدێن لە سێ رادە(رادەی بچووك+رادەی گەورە+رادەی ناوەند)

ئەو پێشەکییەی کە رادەی بچووکی تێدایە پێی دەوترێت: (بچووك) چونکە کەمترین گرتنەخۆی هەیە.

ئەو پێشەکییەی کە رادەی گەورەی تێدایە پێی دەوترێت (گەورە) چونکە زۆرترین گرتنەخۆی هەیە.

نموونە:

جیهان رووداوە(پێشەکی بچووك)

هەموو رووداوێك رووداوخولقێنێکی بۆ هەیە(پێشەکی گەورە)

جیهان وەك رووداوێك خولقێنەرێکی بۆ هەیە (ئەنجام)

---

[1] هەندێ جاریش مەبەست پێی خوێندنەوەی واقیعە وەك لە بەڵگەی خوێندنەوەیدا، بەڵام پێوانەی شەرعی و یاسایی لای مەنتقییەکان پێی دەوترێت نواندن.

جیهان(رادەی بچووك) بابەتی ئەنجامەکەیە.

رووداو(رادەی گەورە) بریتییە لە ئەڵقەی گەیاندنی نێوان دوو پێشەکییەکە، لە بچووکەکەدا هەڵدراوە و لە گەورەکەدا بابەتە.

رووداوخولقێنەری بۆ هەیە(رادەی گەورە) هەڵدراوی ئەنجامە.

بۆ پێوانەی بەراوردکاری جێگەیی چوار شێوە هەیە:

شێوەی یەکەم– بریتییە لەوەی کە رادەی ناوەند لە بچووکەکەدا هەڵدراو بێت و لە گەورەکەدا بابەت بێت، وەك نموونە باسکراوەکە.

شێوەی دووەم– ئەوەیە کە رادەی ناوەند لە بچووك و گەورەکەدا هەڵدراو بێت.

شێوەی سێیەم– ئەوەی کە لە هەردووکیاندا بابەت بێت.

شێوەی چوارەم– پێچەوانەی شێوەی یەکەمە، ئەوەش ئەوەیە لە بچووکەکەدا بابەت بێت و لە گەورەکەدا هەڵدراو بێت.

**دووەم- پێوانەی بەراوردکاری مەرجی:**

ئەوەش ئەوەیە کە هەندێ لە پێشەکییەکانی یان هەمووی مەرجی لکاو(پەیوەست) یان سەربەخۆ بێت، ئەوەش شەش جۆری هەیە:

یەکەم– لە دوو مەرجی لکاو(پەیوەست) پێکبێت:

هەتا مرۆڤ دڵسۆز بێت بەرهەمهێنترە، (بچووك)

هەتا بەرهەمهێنر بێت خۆشەویستترە، (گەورە)

هەتا مرۆڤ دڵسۆز بێت خۆشەویستە(ئەنجام)

دووەم– لە دوو سەربەخۆ پێکبێت:

هەموو موجتەهیدێك یان لە ئیجتیهادەکەیدا پێکاویەتی یان نەپێکاوە(بچووك)

هەموو ئەوانەش کە لە ئیجتیهادەکەیاندا نەیان پێکاوە یان بەردەوام دەبن لەسەر هەڵەکەیان یان پەشیمان دەبنەوە(ئەنجام)

سێیەم– ئەوەیە کە یەکێك لە پێشەکییەکانی لکاو(پەیوەست) بێت و ئەویتریان سەربەخۆ:

هەتا قازی لایەنگر نەبێت دادپەروەرە (بچووك)

هەموو دادپەروەرێك خۆشەویستە(گەورە)

هەتا قازی لایەنگر نەبێت خۆشەویستە(ئەنجام)

چوارەم– ئەوەیە کە یەکێك لە دوو پێشەکییەکە سەربەخۆ بێت و ئەویتریان هەڵدراو:

نموونە: هەر کەسێك دەستی بەسەردا بگیرێت تۆمەتبارە(بچووکی هەڵدراو)

هەموو تۆمەتبارێك یان بێگوناهە یان تاوانبار(گەورەی سەربەخۆ)

هەر کەس دەستی بەسەردا بگیرێت یان بێگوناهە یان تاوانبار(ئەنجام)

پێنجەم– ئەوەیە کە یەکێکیان سەربەخۆ و ئەویتریان لکاو(پەیوەست) بێت:

نموونە: قوتابی یان تێکۆشەرە یان پشتگوێخەر(گەورەی سەربەخۆ)

گەر قوتابی دەرچوو(سەرکەوتوو بوو) ئەوە تێکۆشەرە(بچووکی پەیوەست))

گەر قوتابی دەرچوو ئەوا پشتگوێخەر نییە(ئەنجام)

شەشەم– ئەوەیە کە لە هەڵدراو و پەیوەست و سەربەخۆ پێکبێت:

نموونە: تفەنگ ئامێرێکی ئامادەکراوە بۆ کوشتن(بابەتی هەڵدراو)

هەتا ئامێر ئامادەکراو بێت بۆ کوشتن هۆکارێکی سروشتییە بۆ مراندنی رۆح(بابەتی مەرجی پەیوەست)

هەمیشە ئامێری ئامادەکراو بۆ کوشتن بەڵگەیە لەسەر بوونی مەرامی تاوانکارانە یان بەڵگە نییە لەسەری(بابەتی مەرجی سەربەخۆ)، تفەنگ هۆکارێکی سروشتی بێت بۆ مراندنی رۆح بەڵگەیە لەسەر مەرامی تاوانکارانە، یان بەڵگە نییە لەسەری(ئەنجام)

پێوانەی بەراوردکاری مەرجی وەك پێوانەی بەراوردکاری هەڵدراو چوار شێوەی هەیە:

یەکەم– ئەوەیە کە رادەی ناوەند تیایدا هەڵدراوە لە پێشەکی بچووکدا و بابەتە لە پێشەکی گەورەدا.

دووەم– ئەوەیە کە تیایدا رادەی ناوەند هەڵدراوە لە هەردوو پێشەکییەکەدا.

سێیەم– ئەوەیە کە رادەی ناوەند تیایدا بابەتە لە هەردوو پێشەکییەکەدا.

چوارەم– ئەوەیە کە بە پێچەوانەی شێوەی یەکەمەوەیە.

**سێیەم- پێوانەی هەڵواردەیی پەیوەست**

پێوانەی هەڵواردەیی ئەوەیە کە یەکێك لە دوو پێشەکییەکەی خودی ئەنجام یان هەڵوەشێنەرەوەی ئەنجام بەکردار لەخۆ دەگرێت، ئەوەش لە دوو پێشەکی پێکدێت، یەکێکیان

پرسـێکی مەرجییـە و ئـەوتریان پرسـێکی هەڵـدرلوی هـەڵوەردەیی، پێیـدەوترێت هەڵوەردەیی(الإستثناء) بەهۆی لە ئامێزگرتنی ئەوەی لە زانستی مەنتقدا پێی دەوترێت ئامرازی هەڵواردن، ئەوەش بریتییە لە وشەی "بەڵام"، بۆیە دیسان پێوانەکە بە هـەڵواردەیی ناودەبرێت، ئەوەش یان هەڵواردەیی پەیوەسـت(الإستثناء المتصل)ە گەر مەرجی پەیوەست بوو، یان هەڵواردەیی سەربەخۆ(الإستثناء المنفصل)ە گەر مەرجی سەربەخۆ بوو[1].

**بەڵگەهێنانەوە و ئەنجامگیری بەهۆی پێوانەی هەڵواردەیی پەیوەستەوە:**

زانایانی مەنتق دەڵێن جێگیربوونی هاتنەدی(دەستەبەربوون)ی "پێشخراو" جێگیربوونی هاتنەدی "دواخراو" بەرهەم دەهێنێت، لەسەر ئەو بنچینەی کە یەکەمیان هۆیە و جێگیربوونی هۆش جێگیربوونی سەبەبکار پێویست دەکات، وەك لەم شێوازەدا:

دلوا: (ع) بەرپرسیار نییە لەڕووی تاوانەوە لە کوشتنی(ك)

پاڵپشت: چونکە کوشتنەکە بەرگری بووە لە نەفس

بەڵگەهێنانەوەی قەزایی: گەر سەلما(ع) (ك)ی کوشتووە وەك بەرگری لە نەفس(پێشخراو) کەوابوو ئەو لە رووی تاوانکارییەوە بەرپرس نییە(دواخراو).

بەڵگەی دواخراو: مادەی (٤٢) لە ق.ع.ع.[2]

پوختەی لێکۆڵینەوە: بەڵام سەلماوە کە (ع) (ك)ی کوشتووە وەك بەرگری کردن لە نەفس.

ئەنجامگیری و بڕیار: (ع) بەرپرسیار نییە لەڕووی تاوانکارییەوە لە کوشتنی (ك).

شێوازێکی تری ئەنجامگیری لە رێگەی پێوانەی هەڵواردەیی پەیوەستەوە بوونی هەیە، ئەوەش ئەوەیە کە جێگیربوونی دواکەوتنی "دواخراو" جێگیربوونی دواکەوتنی "پێشخراو" بەرهەم دەهێنێت لەو سۆنگەیەوە کە دواکەوتنی ئەسەر دواکەوتنی خاوەن ئەسەر پێویست دەکات.

دلوا: (ع) ئەو تاوانە درییەی ئەنجام نەدلوە کە پێی تۆمەتبار کرلوە.

پاڵپشت: وەك یەکنەبوونی جێپەنجەکان.

---

[1] انظر المراجع السابقة من كتب المنطق: البرهان ص٣٣٠-٣٤١.
تهذيب المنطق مع الخبيصي والدسوقي ص٢١٤-وما بعدها.

[2] تاوان نییە گەر روودانی کارەکە وەك بەکارهێنانی مافی بەرگری شەرعی بوو.

بەلگەهێنانەوەی قەزایی: (ع) بەو تاوانی دزیەی پێی تۆمەتبار کراوە هەستاوە(پێشخراو) گەر جێپەنجەکانی لەگەڵ جێپەنجەی جێگەی رووداوەکە لە یەکتر بچن(دواخراو)

پوختەی لێکۆڵینەوە: بەڵام جێپەنجەکان لەیەکتر ناچن.

ئەنجامگیری و بریار: (ع) ئەو تاوانی دزییەی پێی تۆمەتبار کرابوو ئەنجام نەداوە.

**چوارەم -پێوانەی هەڵوارەدیی سەربەخۆ:**

ئەوەش ئەوەیە یەکێك لە پێشەکییەکانی بابەتی سەربەخۆ بێت و ئەویتریان هەڵدراو.

بەلگەهێنانەوە و ئەنجامگیری بەهۆی پێوانەی هەڵواردەیی سەربەخۆوە:

زانایانی مەنتق دەڵێن: جێگیربوونی یەکێك لە دوو پێشەکییە سەربەخۆ دەستەبەرنەبوونی ئەویتریان دەگەیەنێت، هەروەها جێگیربوونی دەستەبەرنەبوونی یەکێك لەو دوانە دەستەبەربوونی ئەویتریان دەگەیەنێت لەسەر ئەو بنچینەی کە هەردووکیان هەڵوەشێنەرەوەی یەکترن و پێکەوە کۆناکرێنەوە و پێکەوە بەرزیش ناکرێنەوە، وەك لەم شێوازە هاتوانەدا:

تۆمەتبار(ع) دەستی بەسەردا گیرا(پێشخراو-بابەتی هەڵدراو) دوای لێکۆڵینەوە: یان تاوانبار کردنی یان بێتاوانی دەسەلمێت(دواخراو-سەربەخۆ)، بەلام تۆمەتبار کردنی سەلماوە(هەڵواردەی پێشخراو)، ((بۆیە بێتاوان بوونی نەسەلما)) (ئەنجام)

دوای ئەم پوختە لە خستنە روو بۆ هەندێ لە شێوازی بەلگە(پێوانە)ی مەنتقی بۆمان رۆشن دەبێتەوە بەلگە قەزاییەکان یان نەقڵین یان ئەقڵین، ئەمەش بە کورتی لە دوو باسی داهاتوودا رۆشنی دەکەینەوە.

# باسی یەکەم:
# بەڵگە نەقڵیەکان

زانایانی مەنتق دەڵێن[1]: بەڵگە بۆ راوەستان لەسەر گێڕانەوەی قسەی کەسانی تر لە هەموو پێشەکییەکانیدا یان لە هەندێکیدا بەڵگەی نەقڵییە، ئەگەر نە بەڵگەی ئەقڵییە.

نموونە:

أ–ئەوەی بە هەموو پێشەکییەکانییەوە لەسەر نەقڵ وەستاوە:

وازهێنەر لە فەرمانپێکراو یاخییە(بچووک)، هەموو یاخییەك شایستەی سزایە(گەورە)، وازهێنەر لە فەرمانپێکراو شایستەی سزایە(ئەنجام)

بەڵگە بچووکەکە نەقڵییە لە ئایەتی (أفعصيت أمري)، هەر بەو جۆرە بەڵگەی گەورە ئەم ئایەتەیە(وَمَن يَعْصِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَيَتَعَدَّ حُدُودَهُ يُدْخِلْهُ نَاراً خَالِداً فِيهَا)

ب–ئەوەی لە هەندێ لە پێشەکییەکانیدا لەسەر نەقڵ وەستاوە:

(أ) (ب)ی کوشتووە بە کوشتنێکی ئەنقەستی دوژمنکارانە(بچووك)

هەر کەس کەسێك بکوژێت بە کوشتنێکی ئەنقەستی دوژمنکارانە بە بەندکردنی هەتاهەتایی یان کاتی بەند دەکرێت(گەورە)

کەسی (أ) بە بەند کردنی هەتاهەتایی یان کاتی سزا دەدرێت(ئەنجام)

"بچووك"ەکە رووداوێکی بەرهەستە، نەقڵی نییە، بەڵکو بەڵگە و دواوکەی نەقڵییە، بەڵام پێشەکییە گەورەکە نەقڵییە کە بریتییە لە مادەی (٤٠٥) لە یاسای سزا عێراقییەکانی جێبەجێکار.

لە بەڵگە نەقڵییەکان: دەقە یاسایی و شەرعییەکان و پێشەکییە قەزلییەکان و قسەی شایەتەکان و وەلامگۆیی تۆمەتباران..

---

[1] البرهان المرجع السابق، ص٤٠٣.

## بەشەکانی بەڵگە نەقلییەکان:

بەڵگە نەقڵییەکان لەڕووی سەلماندنەوە یان یەقینین یان یەقینی نین، هەر یەکێك لەو دوانەش: یان بڕاوەن یان گومانئامێز لەڕووی ئاماژەیان بۆ سەر حوکمەکە، هەر دەقێك تەنها یەك حوکم(تەنها یەك مانا) زیاتر هەڵنەگرێت ئاماژەکەی بۆ سەر حوکمەکە بڕاوەیە، هەروەها هەر دەقێك زیاتر لە حوکمێك(زیاتر لە مانایەك) هەڵبگرێت ئەوا ئاماژەکەی لەسەر یەکێك لەم دوو ئەگەرە ئاماژەیەکی گومانئامێزە، چونکە لە هەمان کاتدا ئەگەرێکی تری هەیە، هەمان شت بڵێ دەربارەی بەڵگە لە شتەکانی تردا.

### یەکەم - بەڵگە نەقلییە یەقینییەکان:

یەقین بریتییە لە زانستێکی یەکلاکەرەوەی جێگیری پڕاوپڕ بە واقیع، یەقین تایبەت بە بەڵگە نەقڵییەکان تەنها لە رێگەی تەواتورەوە جێگیر دەبێت، تەواتوریش ئەوەیە کە کۆمەڵێك لە خەڵکی لە هەر سەردەمێکدا گواستوویانەتەوە بە بیستنی ڕاستەوخۆ یان بینین کە نەشیاوە هەموو ئەوانە لەسەر درۆ رێبکەون، وەك ئەو رێکەوتنەی کە "لەندەن" پایتەختی بەریتانیایە.

### دەقەکان و تەواتور:

دەقە یاساییەکان لە هەر وڵاتێکدا دەبن بە تەواتور لە دوای بڵاوکردنەوەی لە گۆڤار و ڕۆژنامە فەرمییەکاندا، بۆیە دەقێك لە دەقەکانی یاسای سزا عێراقییەکانی جێبەجێکار نابینیتەوە جێگەی شك یان گومان یان وەهم بێت لەوەی ئایا ئەوە دەقێکی یاسایی عێراقییە و بەشێکە لەو یاسایە، هەر بەو جۆرە تەواوی دەقە یاساییە جێبەجێکارەکان، بەڵام دەقە شەرعییەکان لە دەقە یاساییەکان جیاوازن لەم ڕووانەوە:

أ-دەقەکانی قورئان لەڕووی جێگیربوونەوە و لەو ڕووەوە کە کەلامی خودان و بە وەحی بۆ سەر سەروەرمان محمد(ﷺ) دابەزیوە هەرهەمووی متواتیرن، چونکە لە هەموو چاخێکدا کۆمەڵێك گواستوویانەتەوە کە رێکەوتنیان لەسەر درۆ نەشیاو و نەگونجاوە و لە ئەقڵ بەدەرە.

ب-دەقەکانی سوننەتی پێغەمبەر(ﷺ)

ئەمەش لەڕووی جێگیربوونەوە سێ جۆرن:

**١-سوننەتی متەواتیر:**

ئەوەیە كە كۆمەڵێك لە هاوەڵان لە پێغەمبەری خودلوە(ﷺ) گولستوویانەتەوە كە كۆبوونەوەیان لەسەر درۆ نەشیاو و نەگونجاوە و لە ئەقڵ بەدەرە، پاشان لەو كۆمەڵەوە كۆمەڵێك لە شوێنكەوتوولن گولستوویانەتەوە كە كۆبوونەوەیان لەسەر درۆ نەشیاو و نەگونجاوە، هەر بەو جۆرە تا سەردەمی تۆماركرىن، تەولتوریش یان گوزارەییە: هەر یەكێك لەو كۆمەڵە بە هەمان شێوە لە گوزارە(دەربڕین) دەیگێڕێتەوە كە ئەولنیتر گێڕاویانەتەوە.

یان مەعنەوییە: هەر یەكێك لەو كۆمەڵە جیاواز لەولنی تر لە گوزارەدا دەیگێڕێتەوە، بەلام هەوڵی هەموویان لەسەر یەك مانای هاوبەش كۆدەبێتەوە لەوەی ریوایەتیان كردووە بە ڕێگەی پابەندكردن.

متولتیری گوزارەیی لە قسەی پێغەمبەر(ﷺ) كەمە، بەلام متەولتیری مەعنەوی زۆرە، لە نموونەی متەولتیری مەعنەوی شرۆڤەكردنی دەقە پوختەكانی هاتوو لە قورئاندا بە فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) و كردارەكانی، سوننەتی متەولتیر پلەی دووەمی هەیە لە دوای قورئان لە پابەندكردن و بەلگەدا.

**٢-فەرموودەی مەشهور( بەناوبانگ ):**

ئەو فەرموودلنەی كە ریوایەت كرلون لە هاوەڵانەوە و نەگەیشتوونەتە رادەی تەولتور، پاشان لە چاخی شوێنكەوتوولن یان شوێنكەوتولنی شوێنكەوتولندا دەگاتە رادەی تەولتور، فەرموودەی مەشهور بڕلنەوە و زلنستی یەقین دەگەیەنێت تایبەت بەولنەی ریوایەتیان كردووە لە هاوەڵان، بەلام گومان دەبەخشێت تایبەت بە خەڵكانی تر.

**٣-فەرموودەی ئاحاد:**

ئەوەش هەر هەواڵێكە كە ژمارەیەك لە خوار ژمارەی تەولتورەوە(لە هەر سێ نەوەكەدا) ریوایەتی دەكەن، گومانی پارسەنگ دەگەیەنێت و پێویستە كاری پێ بكرێت لەو شتانەی ئاماژەی پێدەكەن لە حوكمە كردارییەكان، بەلام لە كاروبارە باوەڕییەكاندا ناكرێنە بەلگە، هەرچی بەلگەی نەقلییە جگە لە بەلگەی تەولتور زلنستی یەقین ناگەیەنن.

هەر بەلگەیەك هەموو پێشەكییەكانی متەولتر بێت پێی دەوترێت "بورهان".

## دووەم - بەڵگە نەقلییە نایەقینییەکان(نیشانەکان):

زانایانی مەنتق بۆ بەڵگەی نایەقینی گوزارەی "نیشانەکان" بەکاردەهێنن، هەرچەند ئەم گوزارەیە زۆرجار بۆ شتە گومانئامێزەکان بەکاردەهێنرێت.

### بەشەکانی بەڵگەی نایەقینی[1] :

بەڵگەی نایەقینی لە رووی هێز و لاوازییەوە دابەش دەبێت بۆ ئەم بەشانە:

**١-بەڵگەی پەیبردنبەخشینی یەکلانەبووەوە کە دابەش دەبێت بۆ ئەم بەشانە:**

**أ. شك بگەیەنێت:**

ئەوەش بریتییە لە پەیبردن بە کاروبارێك لایەکی بەسەر لایەکی تردا پارسەنگ ناکرێت و ساغ نابێتەوە، وەك وێناکردنی زانایانی بۆشایی ئاسمان بۆ بوونی ژیان لە هەندێ هەسارەدا بە وێناکردنێك کە تا ئێستا لایەکی-بە ئەرێ و بە نەرێ- بەسەر لایەکەی تردا پارسەنگ نەکراوە، دروست نییە بۆ قازی کار بکات بە "شك" و بڕیاری لەسەر بدات، بەڵکو پێویستە ئیجتیهاد بکات و کۆشش بەخەرج بدات بۆ گەیشتن بە پەیبردنێکی بەهێزتر لەو قۆناغە.

**ب-یان گومان بگەیەنێت:**

ئەوەش بریتییە لە لای پارسەنگ لە پەیبردن لە بوون و نەبوون بەهۆی پارسەنگەرێکی جێگیر(سەلماو) لەلای کەسی پەیبەر، وەك گومانی قازی بە جێگیربوونی تۆمەتی ئاراستەکراو بۆ تۆمەتبار بەهۆی بوونی بەڵگە دژ بە تۆمەتبار، بەڵام ئەو بەڵگانە نەگەیشتوونەتە پلەی یەقین یان باوەڕی یەکلاکەرەوەی جێگیر، بەڵکو ئەگەری راست و درۆیان بۆ هەیە، وەك وەلامگۆیی شاهیدەکان کە نەگەیشتوونەتە رادەی تەواتور، هەروەها وەلامگۆیی و دانپیانانانی تۆمەتباران ئەمەش دیسان یەقین نابەخشێت بەهۆی ئەگەری درۆ و ناڕاستی بە پاڵنەرێك کە قازی هەندێ جار پێی نازانێت یاخود هەندێ جار پێی دەزانێت، هەر بەو جۆرە وەك دانپیانانانی قەرزدار بە قەرزەکەدا، ئەوەش بریتییە لە بەڵگەی قسە و گومان دەبەخشێت یان گومانی زاڵ دەبەخشێت، قازی پابەندە حوکم بە گومانی زاڵ بکات گەر بەڵگەیەك پێچەوانەی ئەوە راست نەبێتەوە.

---

[1] شایانی باسکردنە ئەم بەشانە تایبەت نین بە بەشەکانی بەڵگەی نەقڵییەوە، بەڵکو ئەوەش دیسان لە بەڵگەی ئەقڵیدا متەواترە وەك چۆن لە جێگەی خۆیدا باسی لەبارەوە دەکرێت.

ج-یان وەهم بگەیەنێت:

ئەوەش بریتییە لەلای پارسەنگ نەکراوی پێچەوانە بە گومانی زاڵ، بۆیە قازی کاتێک گوێ لە وەلامگۆیی شاهیدەکان دەگرێت گومانی زاڵی لا دروست دەبێت بە دروستی ناوەرۆکی ئەو وەلامگۆییانە، بەلام لەبەر ئەوەی هەواڵ ئەگەری راست و درۆیان بۆ هەیە، بۆیە وێنای لایەکی تر لەم وەلامگۆییانەوە هەست پێ دەکرێت ئەویش نارلست بوونیانە، ئەم لا پێچەوانە وێناکراوە بە "وەهم" ناودەبرێت و دروست نییە قازی کاری پێ بکات.

٢-بەلگەی بەخشینی پەیڕەنی یەکلاکەرەوەی نا جێگیر:

پەیرەنی یەکلاکەرەوەی ناجێگیر ئەوەیە کە سەلماندنی پێچەوانە قبووڵ دەکات، وەک پەیرەنی قازی بە جێگیربوونی تۆمەتی ئارلستەکراو بۆ تۆمەتبار بە پەیرەنێکی یەکلاکەرەوەی پشتەستوور بە بەلگەی بەدەستهاتوو دژ بە تۆمەتبار، بەلام پەیرەنێکی یەکلاکەرەوەی ناجێگیر بەهۆی ئەگەری جێگیربوونی پێچەوانەی ئەوە، بەوەی بێتاوانی تۆمەتبار بسەلمێت لە دوای حوکمدان بەسەریدا بە دەرکەوتنی بەلگەیەک کە ئاماژە بەو بێتاوانییە دەکات، لەم بارەدا پێویستە لەسەر قازی حوکمەکەی بکشێنێتەوە لە جێگەی ئەو حوکمە حوکم بە بێتاوانی کەسەکە کەسەکە لەو تۆمەتە ئارلستەکراوە بۆی دەربکات و ئازادی بکات، گەر بە تۆمەتێکی تر تۆمەتبار نەکرابێت.

٣-بەلگەی پەیرەنەبەخشینی یەکلاکەرەوەی جێگیری ناپڕاوپڕ بە واقیع:

ئەم پەیرەنە زانایانی مەنتق بە ((نەزانی دوو سەرە)) ناوی دەبەن، وەک پەیرەنی کوێرانەی هەندێ لە چاولێکەران کە باوەڕێکی یەکلاکەرەوەی جێگیری ناپڕاوپڕ بە واقیعیان هەیە بە راستی و دروستی ئەوەی دەیگوێزنەوە لەو کەسانەی چاویان لێ دەکەن، بۆیە بابەتە چاولێکەرییەکان ئەقڵی کەسی چاولێکەر بڕیار لە راستی و دروستیان دەدات بە بڕیارێکی یەکلاکەرەوەی جێگیری چاولێکەری بەلگەنەویستانە، ئەمەش وەک بانگەشە نەک تێڕوانین و بەلگەهێنانەوە بەهۆی نەرێکردنی نێوان چاولێکەری و بەلگەهێنانەوە لەسەری، هەروەها لەبەر ئەوەی بەلگەهێنانەوە بە هەواڵی ئاحاد(تاک) یەکلابوونەوە ناگەیەنێت، هەندێ جار ئەو بابەتە چاولێکەریانە لە واقیع و خودی خۆیاندا نادروستن، لەگەڵ ئەوەش کەسی چاولێکەر دەستی پێوە دەگرێت و پێچەوانەی ئەوەی بۆ خۆی پێ قبووڵ نییە، ئەمەش پێی دەوترێت "نەزانی دوو سەرە"، چونکە حەقیقەت نازانێت و ناشزانێت کە نایزانێت، ئەوەش نەزانینێکە نەزانینێکی تری پێویست کردووە، لەبەر ئەوەیە پێی دەوترێت نەزانی دوو سەرە.

بەڵگە نەویستە کە هەندێ جار کەسی موجتەهید دەکەوێتە هەڵەوە و هەندێ جاریش دەپێکێت، ئەمە ئەوەیە کەس ملپێچی لێ ناکات جگە لە دەمارگیران و تووشبوان بە کوێری دەمارگیری، پێغەمبەر(ﷺ) دووپاتی ئەم ڕێسایەی کردۆتەوە پێش زیاتر لە هەزار و چوارسەد ساڵ کاتێك فەرمووی: ((گەر کەسێك دادوەری دەکرد، ئیجتیهادی کرد و پاشان پێکای ئەوا دوو پاداشتی بۆ هەیە، گەر دادوەری دەکرد و ئیجتیهادی کرد و پاشان هەڵەی کرد ئەوا یەك پاداشتێکی بۆ هەیە))

پاڵپشتکردن بە پێشینە قەزاییەکان و بڕیارەکانی دادگای پێداچوونەوە بە چاولێکەری و دەستگرتن بە بەڵگەی نەقڵی نایەقینی لە دروستیدا دادەنرێت، چونکە ئەو بڕیار و پێشینە قەزاییانە لە هەڵە پارێزراو نین و دروستکەری بڕیار لە هەڵە پارێزراو نییە، بۆیە دەمارگیری کوێرانە هەڵەیەکی مەنتقییە جا لە قازی بابەتەوە بێت یان لە لای پارێزەری بەرگریکارەوە بۆ ئەو پێشینە و بڕیارانە، بەڵێ قازی یان پارێزەر دەتوانێت بەرچاوڕوونیان لێوە وەربگرێت، بەڵام لە هەمان کاتدا پێویستە تەنها لە دوای لێکۆڵینەوەی ورد و پێداچوونەوە دەستیان بۆ ببرێت و وا تەماشا بکرێت کە ئامادەیی جێگیربوونی پێچەوانەی بۆ هەیە، لەبەر ئەوەی ئەگەری هەڵە و ڕاستی تێدایە تا سەرچاوەکەی ئیجتیهاد یان بەڵگەی گومانئامێز بێت.

## ئەنجامگیری:

دوای ئەم پوختەیە لە ڕۆشنکردنەوە تایبەت بە بەڵگەی نەقڵی نایەقینی دەتوانین ئەم ئەنجامگیریانە بکەین:

یەکەم- قازی پابەند نییە بەوەی هەمیشە بە یەقین حوکم دەربکات، چونکە هەموو ئەو بەڵگە نەقڵیانەی شانیان لەسەر دادەدات یەقین نابەخشن بە هەڵوارده لە بەڵگەی نەقڵی متەواتیر، قازی پابەند نییە بەوەی کار نەکات بە یەقین نەبێت نە لە شەریعەتی ئیسلامدا نە لە یاسای دانراودا بۆ ئەوەی ئەو کارە سەرنەکێشێت بۆ بەفیڕۆدانی مافەکانی خەڵکی.

بینا لەسەر ئەمە کاری یاسادانەری عێراقی لە مادەی (٤٤)ی یاسای باری کەسێتی جێبەجێکار نامەنتقییە، چونکە قازی پابەندکردووە بە کارکردن بە تەواتور لەو مادەیەدا کە دەقەکەی دەڵێت: ((سەلماندنی هۆی جیاکردنەوە بە هەموو هۆکارەکانی سەلماندن دروستە، لەناو ئەوانەشدا گەواهی هاتوو لەسەر بیستن گەر متەواتیر بوو...))، پابەند کردنی قازی بەوەی کار نەکات بە گەواهیە هاتووەکان لەسەر بیستن -گەر نەگەیشتبێتە پلەی تەواتور- هەندێ جار سەردەکێشێت بۆ تیاچوونی ماف یەکێك لە دوو هاوسەرەکە یان هەردووکیان، سەرباری ئەوەی کە دژ دەوەستێتەوە لەگەڵ ڕێسای مەنتقی و

یاسایی و شەرعی بڕیاردەر بە دروستی حوکم بە گومانی زاڵ لـە هـەر شـتێك بـۆی دەخرێتـە روو تـاکو یەکلای بکاتەوە.

دووەم– لەسـەر قـازی پێویسـتە بـۆ بڕیـار و پێشـینە قەزایـیەکان چـاولێکەر نـەبێت، گـەر ئـەو چاولێکەرییەی بەکارهێنا پێویستە دەمـارگیر نـەبێت بـۆی تـا رادەی پەیـنـەبردن بـەو هەڵەیـەی تیایـدا هاتووە، چونکە دروستکەری بڕیار کەسێکی بێهەڵە نییە، بۆیە بڕیاری ئەگەری هەڵە و راستی تێدایە، واتە موجتەهید بەڵگەی یەکلاکەرەوە(یەقین)ی لە دەستدا نییە بۆ سەلماندنی ئەوەی بڕیاری لەسەر داوە.

سێیەم– دروست نییە قازی بە شك و وەهم کار بکات، چونکە ئەو دوانە پەیپێبردنێکی لاوازن و لـە هەڵەوە نزیکترن تا لە راستییەوە، بۆیە لەسەری پێویستە تێبکۆشێت تـا دەگاتـە ئـەو پەیبردنـەی کـە کەمتر نییە لە پلەی "گومانی زاڵ" ئەمەش وەك رەچاوکردنێك بۆ رێسا گشتییەکان، لەوانە: ((تۆمەتبار بێگوناهە تا تاوانبار کردنی دەسەلمێت))، ((بنەڕەت ئەستۆ پاکییە))، لە پێشەکی رێسـا رێگرەکـان لـە کارکردن بەوەی جێگەی گومانە ئەم فەرموودەی پێغەمبەرە(ﷺ)-((تا دەتوانن سزا سنوور بەزێنییەکان بە شوبوهات پاڵ پێوە بنێن))

چوارەم– بەڵگەکان لە سەلماندنیان یەقینی بن یـان گومانئـامێز ئاماژەکانیـان لەوانەیـە بـڕاوە یـان گومانئامێز بن.

### ئاماژەی بڕاوەی بەڵگەکان:

ئەوەیە بەڵگەکە زیاتر لە ئاماژەیەك هەڵنەگرێت، لەو بارەدا بواری ئیجتیهادی تێدا نییە، ئەمەش ئـەو مەبەستەیە کە رێسا لە بەناوبانگەکەدایە: ((بە بوونی دەق رێگە بە ئیجتیهاد نادرێت))

### ئاماژەی گومانئامێزی بەڵگەکان:

ئەوەیە کە بەڵگەکە زیاتر لە ئاماژەیەکی هەبێت، لەو بارەدا ئاماژەکـەی بـۆ یـەکێك لـە ئەگـەرەکان ئاماژەیەکی گومانئامێزە بەهۆی ئەگەرێکی ترەوە لە هەمان کاتدا، لە گرنگترین هۆیەکانی سـەرهەڵدانی لێڵی و تەمومژ لە دەقەکاندا ئەوەیە کە زیاتر لە ئاماژەیەك بگەیەنن، کاتێك قازی دەقەکە لە یـەکێك لـەو ئەگەرانەدا بەکاردەهێنێت لەوانەیە پێکابێتی و لەوانەشە بەهەڵەدا چووبێت بەهۆی ئەوەی کە بۆی هەیە یاسادانەر بۆ مەرامێکی تر –جیا لەو مەرامە– یاساکەی دانابێت.

بۆیە هەر هەموو دەقەکان لە رووی ئاماژەوە یان بڕاوەن یـان گومانئـامێزن بـە پێچـەوانەی ئـەوەی هەندێ پێیان وایە کە بەڵگە نەقڵییەکان بە رەهایی گومانئامێزن، خاوەنی ئەم بانگەشەیە لەسـەر ئـەوە

شان دەدەن کە سووبیینین لەو ئەنجامە لەسەر چەند پێشەکییەك رادەوەستێت کە هەر هەموو گومانئامێزن، لەو پێشەکیانە:

- زانست بە وشەی دەقەکان بۆ مانایەکی دیاریکراو، ئەو زانستە گومانئامێزە.
- زانست بەو مانا وەرگێڕاوانە لە وشەی دەقەکانەوە ئایا لەلای یاسادانەر یان خاوەن قسەکە ئەوە مەبەست بووە، ئەمەش گومانئامێزە.
- زانست بەوەی ئەو وشەیە لە مانا بنەڕەتییەکەیەوە نەگوازراوەتەوە بۆ مانایەکی تر، ئەمەش گومانئامێزە.
- زانست بەوەی کە دەقێکی گشتی بە بەڵگەیەك تایبەت نەکراوە، ئەمەش گومانئامێزە.
- زانست بەوەی کە دەقێکی رەها بە بەڵگەیەك سنووردار نەکراوە، ئەمەش گومانئامێزە.
- زانست بەوەی ئەو بەڵگەیە بە بەڵگەیەکی تر بەرهەڵستی نەکراوە یەکسان بێت پێی یان بەهێزتر بێت لەو، ئەمەش گومانئامێزە.
- زانست بەوەی ئایا ئەو دەقە شاراوە و خەملاندن لەخۆناگرێت، ئەمەش گومانئامێزە.
- زانست بەوەی ئەو دەقە پێشخستن و دواخستنی تێدا نەبێت، ئەمەش گومانئامێزە.

هەروەها سەرخەرانی ئەم بانگەشەیە دەڵێن زانستی مەنتق دەڵێت: "ئەنجام شوێنی کەمترین رادەی دوو پێشەکییەکە دەکەوێت"، بۆیە بەڵگە -با بڕاوەش بێت- هەتا تێکەڵ بەو گومانانە بێت ئاماژەکەی بۆ سەر حوکم گومانئامێزە.

بەڵام بە باوەڕی من هەموو ئەم بەڵگانە جەدەلئامێز و سەفسەتە و تێکەوتنن، ئەو واقیعەی کە گفتوگۆ هەڵناگرێت ئەوەیە کە دەق -جێگیربوونەکەی بڕاوە بێت یان گومانئامێز- ئاماژەکەی لەسەر حوکم لەوانەیە بڕاوە بێت گەر زیاتر لە ئاماژەیەك لەخۆ نەگرێت، لەوانەشە گومانئامێز بێت گەر زیاتر لە ئاماژەیەکی تێدا بێت.

خودا زاناترە بە راستی.

# باسی دووەم:
# بەڵگە ئەقڵییەکان

پێشتر باسی ئەوەمان کرد کە زانایانی مەنتق وتویانە: بەڵگە گەر لەسەر گێڕانەوەی قسەی کەسانی تر بێت لە هەموو پێشەکییەکانیدا یان لە هەندێکیدا بەڵگەیەکی نەقڵییە، ئەگەر نە بەڵگەیەکی ئەقڵییە، لەمەوە ئەنجامگیری دەکەین کە بەڵگەی ئەقڵی ئەوەیە لە هەموو پێشەکییەکانیدا لەسەر قسەی کەسانی تر راناوەستێت، بەڵکو سەرچاوەکەی بریتی بێت لە ئەقڵ، ئەوەش ئەوەیە کە لە واقیعێکی مادیەوە هەڵدەگوزرێت لە رێگەی ژیری و تێڕامان و ئەنجامگیریەوە.

بەڵگە ئەقڵییەکان-وەك بەڵگە نەقڵییەکان- یان یەقینین یان گومانئامێزن:

## بەڵگەی ئەقلی یەقینی:

ئەوەیە کە هەموو پێشەکییەکانی یەقینی بن، پێشەکییە یەقینییەکانیش یان بەڵگەنەویستن یان تێڕامانین و لە بەڵگەنەویستەکانەوە بەدەستهاتوون.

### أ- یەقینە بەڵگەنەویستەکان:

ئەمەش شەش جۆرە[1]:

### ١-بەراییەکان:

ئەو پرسانەن کە هەموو ژیرییەکی تەندروست حوکمیان پێ دەکات بە حوکمێکی بڕاوە: (واتە حوکمێکی یەکلاکەرەوەی جێگیری پڕاوپڕ بە واقیع بەتەنها وێناکردنی لایەکانیان لەگەڵ رێژە)، وەك حوکم بە رێگری کۆکردنەوەی دوو هەڵوەشێنەر یان بەرزبوونەوەیان، یان حوکم بەوەی کە "یەك" نیوەی "دوو"ە، یان "هەموو" گەورەترە لە "بەش"...)

---

[1] الکلنبوي: البرهان، ص٣٧٩.

**٢-بینراوەکان:**

ئەو بابەتانەن(ئەو پرسانەن) کە ئەقڵ بە شێوەیەکی بڕاوە حوکمیان پێ دەکات لە ڕێگەی بینـینی حوکم و واقیعی مادییەوە، وەك بینینی بکوژ لەلایەن شایەتەوە لە کاتی ئەنجامدانی تاوانی کوشتنەکەدا، جێگیربوونی ئەو رووداوە تایبەت بە ئەو لە بەڵگەنەویستەکانە و بەڵگەی یەقینییە، بەڵام تایبەت بە قازی لە گومانئامێزەکانە، چونکە قازی شان لەسەر قسەی شایەتەکە دادەدات، قسەی شایەتەکەش ئەگەری ڕاست و درۆی بۆ هەیە، هەروەها زانایانی مەنتق دەڵێن: بابەتەکە بریتییە لە قسە، دروستە بوترێت بـە بێژەرەکەی کە ڕاستگۆیە یان درۆزنە، هەر بەو جۆرە زانایانی ڕەوانبێژی دەڵێن: هەواڵ ئەوەیە ئەگـەری ڕاست و درۆی تێدایە.

**٣- پرسگەلێك بەڵگەکانیان لەگەڵ خۆیاندایە :**

پێیان دەوترێت(خۆپرسەکان)، ئەمانەش ئەوانەن کە تیایاندا بە حوکمێکی بـڕاوە حـوکم دەدرێـت بەهۆی بەڵگەیەکی پێویست بۆ وێناکردنی لایەکانی، وەك حوکمدان بەوەی ژمـارەی چـوار ژمارەیـەکی جووتە، بەهۆی دابەشبوونی بۆ دوو بەشی یەکسان.

**٤-متەواتیرەکان:**

ئەمانەش ئەو بەڵگە نەقڵییە یەقینییانەن کە پێشتر باسمان کردن.

**٥-ئەزموونکراوەکان:**

ئەمانەش ئەو پرسانەن کە ئەقڵ بە حوکمێکی بڕاوە حوکمیان پێ دەکات بەهۆی بەڵگەیەکەوە کە ڕاستەوخۆ دەستی مرۆڤ دەکەوێت لە کاتی دووبارەبوونەوەی بینـینی ئەسـەری پەیـدابوو لەسـەر ئـەو تاقیکردنەوەیە(ئەو ئەزموونە).

**٦-ڕۆشنبینییەکان:**

ئەمانەش ئەوانەن کە ئەقڵ حوکمیان پێ دەکات بە هۆی پێوانەوە، ڕاستەوخۆ بۆ مـرۆڤ بەدەسـت دێن دوای ئەو ڕۆشنبینییەی کە مەلەکەی گواستنەوەیەی ڕاستەوخۆیە لە بنەماکانەوە بۆ داواکراوەکان، وەك حوکم بە ترسناکی تاوانبار لە کاتی جێگیربوونی چەندبارەبوونەوەی هەستانی بە چـەندین تـاوانی ترسناك بەبێ پاساوێکی ماقووڵ.

**ب-یەقینییە نەزەرییەکان(تیورییەکان):**

ئەمانەش بریتین لە پێشەکییە یەقینییەکان کە لە بەڵگەنەویستەکانەوە بەدەست دێن، وەك پێشەکییە جێگیرەکان بە تەواتور یان بە ئەزموون...

ئەو بەڵگەیەی کە لە پێشەکییە یەقینییە بەڵگەنەویستەکانەوە یان نەزەرییەکانەوە پێکدێت پێی دەوترێت "بەڵگەی بورهانی"، ئەمەش بریتییە لە سەروەری بەڵگەکان، چونکە زانستی یەقینی دەگەیەنێت(باوەڕێکی یەکلاکەرەوەی جێگیری پڕاوپڕ بە واقیع) ئەنجامەکەشی هەمیشە یەقینی دەبێت.

بەڵام ئەو بەڵگەیەی کە لە پێشەکییە گومانئامێزەکانەوە یان لەو پێشەکییەکانەوە کە هەندێکیان گومانئامێز و هەندێکیان یەقینین سەرهەڵدەدەن تەنها گومان دەگەیەنن، چونکە "ئەنجام شوێنی کەمترین دوو پێشەکییەکە دەکەوێت"، بۆیە ئەو بەڵگەیەی لە گومان و یەقین پێکدێت ئەنجامەکەی گومانئامێز دەبێت نەك یەقین.

## بەڵگە بۆچەییەکان و بەڵگە ئەگەرییەکان:

زانایانی مەنتق بەرەهایی بەڵگەیان دابەش کردووە جا یەقینی بن یان گومانئامێز بۆ دوو بەش: بەڵگە بۆچەییەکان و بەڵگە ئەگەرییەکان.

### بەشی یەکەم - بەڵگە بۆچەییەکان:

ئەوەش بریتییە لە بەڵگەهێنانەوە بە بوونی هۆ لەسەر سەبەبکار، بنچینەی ئەم بەڵگەیە ئەو ڕێسا مەنتقی و ئوسولییەیە کە بڕیار دەدات بەوەی: ((حوکم لەگەڵ هۆیەکەی بە بوون و نەبوون دەسوڕێتەوە))، واتە هەر کات هۆ دەستەبەر بوو حوکم دەستەبەر دەبێت، هەر کاتیش هۆ دواکەوت حوکم دوادەکەوێت، لە بەڵگە بۆچەییەکان ئەو نموونەی هاوواتای پێوانەی یاسایی و ئوسولییە، ئەوەش پاشکۆکردنی ڕووداوێکە کە دەقێکی ئاشکرا لەسەری نەهاتووە بە ڕووداوێکی تر کە دەق لەبارەیەوە هاتووە بەهۆی بەشداربوونی هەردوو ڕووداوەکە لە هۆی حوکمەکەدا.

ئەم پێوانەیە لە ڕاستەقینەیدا دەگەڕێتەوە بۆ بەڵگەهێنانەوە بە هۆ لەسەر سەبەبکار، دوای پەیبردنی قازی بە هۆی حوکمە هاتووەکە لە دەقەکەدا و دوای جێگیربوونی ئەو هۆیە لەلای لە ڕووداوێکی

هاوشێوەی تردا بەڵگەدەهێنێتەوە بەو هۆیەی حوکمەکە لە پێناویدا یاساڕێژی بۆ کراوە لەسەر جێگیربوونی حوکمەکە لەو رووداوەدا کە دەقی لەسەر نەهاتووە.

"پێوانە" هەرچەند لە پرسە تاوانکارییەکاندا کەنارگیری لێ دەکرێت بینا لەسەر بنەمای شەرعی: ((تاوان و سزا تەنها بە دەقە)) لەگەڵ ئەوەش گرنگییەکی گەورەی هەیە لە ژیانی کرداری قەزاییدا، بۆ نموونە:

خودا–سبحانه وتعالى– دەفەرموێت: ﴿وَالَّذِينَ يَكْنِزُونَ الذَّهَبَ وَالْفِضَّةَ وَلَا يُنْفِقُونَهَا فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَبَشِّرْهُمْ بِعَذَابٍ أَلِيمٍ﴾[1]، کۆکردنەوە و خەزنکردنی ئاڵتوون و زیوی حەرام کردووە بە خەرج نەکردنیان لە پەرەپێدانی کۆمەڵایەتی یان ئابووری یان رۆشنبیری، هەروەها بەرهەم نەهێنانیان بۆ سوود و قازانجی گشتی و تایبەت و خەرج نەکردنیان لە پێناو بەرژەوەندی گشتی و شتانی تریش.

قازی دوای پەیبردن بە حیکمەتی حەرام کردنی کۆکردنەوە و قۆرخکردنی ئالتوون و زیوو و دوای ئابلۆقەدان بە "هۆ"ی حوکمەکە بڕیاری حەرام کردنی دەستبەسەرداگرتنی پارەی کاغەز و پارەی ئاسنی ئاڵوگۆر لە جیهاندا دەدات، چونکە هۆی تەشریعی ئەو حەرام کردنە لە هەردووکیاندا وەك یەکە، هەروەها لەبەر ئەوەی حیکمەتی هەڕەشە کردن لەوانەی دەست بەسەر ئاڵتوون و زیوودا دەگرن بە سزا و ئازاری ئێشبەخش هەمان ئامانج و هەمان حیکمەتە تایبەت بە هەر جۆرە پارەیەك کە کاری زێڕ و زیوو دەکات و لە ئاڵوگۆڕدا لە جێگەی ئەو دوانە دادەنیشێت، بۆ "بەڵگەهێنانەوەی بۆچەیی" لە رێگەی پێوانەوە پێویستە چوار رەگەز بوونیان هەبێت:

١– بنەڕەت–پێ تەشبیهکراو– یان پێوانە لەسەرکراو، ئەوەش بریتییە لەو رووداوەی کە دەق لەبارەیەوە هاتووە.

٢– لق–تەشبیهکراو– یان پێوانەکراو: ئەوەش بریتییە لەو رووداوەی کە هاوشێوەی رووداوەکەی یەکەمە، بەڵام دەق لەبارەیەوە نەهاتووە.

٣– کۆکەرەوە–هۆی هاوبەش– یان ئەو هۆیەی تەشریعی حوکمی رووداوە پێوانە بۆ سەرکراوەکەی بۆ کراوە، هەروەها بوونی ئەو هۆیە لە رووداوەکەی دووەمدا کە قازی دەیەوێ بیکات بە پاشکۆی رووداوەکەی یەکەم.

---

[1] سورة التوبة/ ٣٤.

٤- حوکم: ئەوەش ئەوەیە کە جێگیربووە لەو پرسەی کە پێوانە دەکرێتە سەری لە ولجبوون و حەرام بوون و دروستی و شتانی تریش..

ئەم چوار رەگەزە لە پێوانەی بکوژی وەسیتبۆکراو بۆ وەسیەتکەرەکەی بۆ سەر بکوژی میراتگر فەراهەم هاتوون، بە حوکمدان لە بێبەش کردنی لە وەسیەتەکە هەروەك بێبەش کردنی میرتگری بکوژ لە میرات، رووداوی کوشتنی میراتگر بۆ میراتلێگیراو(پێوانە لەسەر کراو) بە فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) حوکمەکەی جێگیر بووە: ((بکوژ میرات ناگرێت)) رووداوی کوشتنی وەسیەتکەر لەلایەن وەسیەتبۆکراوەوە پێوانەکراوە، هۆی کۆکەرەوەی هەردوو رووداوەکە بریتییە لە پارێزگاری لە رۆحی بێتاوانان، سەرباری نارەوایی سوودبینینی تاوانبار لە تاوانەکەی، حوکمەکەشی بریتییە لە بێبەش بوون لە وەسێت وەك چۆن میراتگر لە لێجێماو بێ بەش دەکرێت.

## بەشی دووەم - بەڵگەی ئەگەری

ئەمەش بریتییە لە بەڵگەهێنانەوە بە ئەسەر لەسەر بوونی خاوەن ئەسەر یان بەڵگەهێنانەوە بە سەبەبکار لەسەر بوونی هۆ، ئەم دەربرینە جۆراوجۆرانە یەك ناوەرۆکیان هەیە.

زۆربەی بەڵگە قەزاییەکان لە سەلماندنی تاواندا بریتین لە بەڵگەی ئەگەری، وەك بەڵگەهێنانەوە بە جێپەنجە لەسەر جێگیرکردنی تۆمەتی ئاراستەکراو بۆ ئەو کەسەی جێپەنجەکانی لەگەڵ ئەو ئاسەوارەدا کە جێپەنجەی تاوانکارەکە بەجێیهێلاوە یەك شت بن.

هەروەها بەڵگەهێنانەوە بە ئەسەری جێپێ و ئەسەری پێ، ئەوەش ئەو شێوەیەتی کە جێیدەهێڵێت لەسەر تەنێك کە بەو جێپێیە کاری تێبکرێت، وەك رمڵ و قوڕ و خاکی نەرم، یان ئەوەی کە لەسەر جەستەیەکی تر نەقش دەبێت بە مادەیەکی پێوە لکاو وەك خوێن و ئاو و خاك...[1]

بەڵگەهێنانەوە لەسەر پاڵفتە کردنی مەرامی تاوانکاری بە بەکارهێنانی هۆکاری بکوژ زۆرجار بە سروشتی خۆی لە بەڵگە ئەگەرییەکانە، چونکە نییەتی کوشتن ئەو هۆ پاڵنەرمیە بۆ بەکارهێنانی ئەو جۆرە چەکە لەلایەن بکوژەوە، گەر ئەو هۆکارەی تاوانکار بەکاریهێناوە بە سروشتی خۆی هۆکارێکی بکوژ بوو و دەبووە هۆی رووداتی مردن ئەوە بەڵگەیە لەسەر مەرامی تاوانکارانە لەلای بکوژەوە، هەر بەو جۆرە هەر ئەسەرێکی بەرهەست کە لێکۆڵەر یان قازی بەڵگەی پێ دەهێنێتەوە لەسەر تاوانبار کردنی

---

[1] الدكتور سلطان الشاوي: اصول التحقيق الاجرامي، ص١٨٣.

کەسی تۆمەتبار، لەسەر ئەو بنچینەیەی کە ئەسەر بەڵگەیە لەسەر هەستانی خاوەن ئەسەر، ئەم بەڵگەهێنانەوە لە زانستی مەنتقدا پێی دەوترێت بەڵگەی ئەگەری.

## کۆتایی

**گرنگترین ئەنجامی بنەڕەتی دەهێنراو لەم باسەدا:**

١. سەلماندنی پەیوەندی نێوان مەنتق و یاسا بە بەڵگەی نەزەری(تیوری) و رووداوی کرداری.

٢. گێڕانەوەی شەش ئاماژەی دەقە شەرعی و یاساییەکان بۆ سێ ئاماژە مەنتقییەکان.

٣. پەردەلادان لەسەر ناتەواوی تەشریعی لە ڕێگەی ڕێسا مەنتقییەکانەوە.

٤. ئەنجامگیری گرنگی مەنتق بۆ یاساناسان لە هەڵەکانیان بۆ شرۆڤەی دەقەکان.

٥. روونکردنەوەی توانای راستکردنەوەی بەڵگە قەزاییەکان بە پێوەرە مەنتقییەکان.

رَبِّ زِدْنِي عِلْمًا وَأَلْحِقْنِي بِالصَّالِحِين

# سەرچاوەكان

## المراجع المنطقية:


١. ابن سينا ابو علي الحسين بن عبدالله بن سينا: منطق الاشارات والتنبيهات طبعة دار المعارف ١٩٦٠.

٢. الانصاري زكريا الانصاري: شرح ايساغوجي في المنطق مع حاشية العطار طبعة ١٣١١هـ.

٣. التفتازاني العلامة سعدالدين التفتازاني: تهذيب المنطق.

٤. الخبيصي عبدالله بن فضل الله: شرح الخبيصي على تهذيب المنطق.

٥. الدسوقي العلامة محمد بن عرفة الدسوقي المالكي: التجريد الشافي طبعة ١٣٢٨هـ.

٦. الرازي قطب الدين الرازي: تحرير القواعد المنطقية في شرح رسالة الشمسية.

٧. الغزالي محمد بن محمد الغزالي: معيار العلم في فن المنطق طبعة ١٩٢٧م.

٨. القزويني نجم الدين القزويني: الشمسية في القواعد المنطقية طبعة ١٣١٤هـ.

٩. الكلنبوي: العلامة اسماعيل بن مصطفى المعروف بشيخ زادة الكلنبوي: البرهان مع حاشية العلامة عبدالرحمن البنجيوني، وحاشية العلامة الشيخ عمر المعروف بابن القرهداغي. مطبعة السعادة القاهرة.

١٠. الدكتور علي سامي النشار: المنطق الصوري منذ ارسطو وتطوره المعاصر طبعة ١٩٥٥م.

١١. الدكتور علي عبدالمعطي محمد: المنطق ومناهج البحث العلمي في العلوم الرياضية والطبيعية دار الجامعات المصرية.

١٢. الدكتور مهدي فضل الله، مدخل الى علم المنطق (المنطق التقليدي) دار الطليعة بيروت.

**المراجع القانونية:**

١. القانون المدني العراقي رقم (٤٠) لسنة ١٩٥١.
٢. قانون العقوبات العراقي رقم (١١١) لسنة ١٩٦٩.
٣. القانون المدني المصري رقم (١٣١) لسنة ١٩٤٨.
٤. قانون العقوبات المصري.
٥. قانون الاحوال الشخصية العراقي رقم (١٨٨) لسنة ١٩٥٩.
٦. الوسيط للدكتور عبدالرزاق السنهوري نشر دار النهضة العربية ١٩٦٤.
٧. المشروع للقانون المدني العراقي الجديد ١٩٨٤.
٨. الدكتور سلطان الشاوي: اصول التحقيق الاجرامي مطبعة جامعة بغداد ١٩٨١.